تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

كۆزاد محەمەد ئەحمەد

منتدى إقرأ الثقافي
للكتب ( كوردي - عربي - فارسي )
www.iqra.ahlamontada.com

# کوردستانی ناوەڕاست

## لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پ.ز. دا

چاپی دووەم

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

کۆزاد محەمەد ئەحمەد

# کوردستانی ناوەڕاست

## لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پ. ز. دا

چاپی دووەم

(بژار و لێ زیادکراو)

بنکەی ژین

سلێمانی ۲۰۰۸

ک کۆزاد محەمەد ئەحمەد

کوردستانی ناوەڕاست لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پ. ز. دا/ دانانی کۆزاد محەمەد ئەحمەد.- سلێمانی: بنکەی ژین، ۲۰۰۸، زنجیرە؛ ۸٤.

۳۳۹ل: ۲٥×۳٥ سم، چاپی دووەم، وێنە، بەڵگەنامە.

۱- کوردستان- مێژوو ی کۆن. ۲- زنجیرە؛ ۸٤. ۳- ناونیشان

کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتایی پۆلێن و پێرستی ئامادە کردووە

## سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح

زنجیرە: ۸٤

کتێب: کوردستانی ناوەڕاست لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پ. ز. دا

دانەر: کۆزاد محەمەد ئەحمەد

چاپ: دووەم (بژار و لێ زیادکراو)

تایپ و مۆنتاج: دانەر

خەتی بەرگ و ڕووبەرگ: ئەحمەد سەعید

تیراژ: ۱۰۰۰

نرخ: ٤٥۰۰ دینار

ژمارەی سپاردن: ۱۲۳۱ی ساڵی ۲۰۰۸ ز

شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

ئەم کتێبە نامەی ماستەری نووسەرە، ۲۰۰۳ پێشکەشی (زانکۆی لایدن)ی کردووە و لێی قبووڵ کراوە. نامەکە بە ئینگلیزی نووسراوە بەم ناونیشانەی خوارەوە:

The Northern Transtigris in the First Half of the Second Millennium B. C.

لە بلاوکراوەکانی

**بنکەی ژین**

بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی

هەرێمی کوردستان: سلێمانی، ئەندازیاران، گەڕەکی ۱۰٥، کۆڵانی ٥، خانووی ۲۳

نۆرماڵ: ۳۱۲۹۱۰۲ ئاسیا: ۰۷۷۰۱٥٦٥۸٦٤ یا ۰۷۷۰۱٤٦٤۸۳۳ سانا: ۱۱۲۸۳۰۹

سنووقی پۆست: ۱٤ bnkaizhin@yahoo.com E. Mail:

به مامۆستای خەمخۆر و دڵسۆز،

بەڕێز عبدالرقیب یوسف پێشکەشە..

# بـــــــه رایی

ئەم نوسینەی بەردەست هەوڵێکە بۆ ڕۆشنکردنەوەی کونجێکی پچوو کی مێژووی دوورودرێژو دەوڵەمەندی ناوچەیە کی نزیک بەلەیادچووی بەرفراوان و کەونارا. لەیادچوو لەلایەن کۆنەناس و مێژووناسە کانەوە، کە جگە لە چەند کارێکی پچووک، زۆر کەمیان بۆ مێژوو و کۆنەناسیی ئەم ناوچەیە کە بە کوردستانی ناوەڕاست دەناسرێت، تەرخان کردووە. بارودۆخی سیاسی سەرە کی ترین هۆی ئەم دیاردەیەیە. ئەم بەشەی کوردستان لەبەر ئەوەی لەسەر وڵاتێکی گەورەترە، بووە بە ناوچەیە کی کەنار لەڕووی سیاسی یەوە، ئەمەش، پێ بە پێی ئەوە، کردوویەتی بە کەنارێکی پشت گوێ خراو لەڕووی کۆنەناسی و لێکۆڵینەوەی مێژووییشەیەوە. لە کاتێکدا کە ناوچە کە، هەروە ک کنە ڕزگارکاری یە کانی بەنداوە کانی دو کان و دەربەندیخان و حەمرین و فایدە دەری دەخەن، خاوەنداریێتی مێژوویە کی دوورودرێژی نەپساو و ڕستێکی کۆنەناسی‌یانەی دەوڵەمەندو نزیک لە تەواوی سەلماندووە.

ئەمە مانای وایە کە وولاتێکی لەڕووی سیاسی یەوە پشت گوێ خراو، وولاتێکی لەڕووی کۆنەناسیشەوە پشت گوێ خراوە، تەنانەت لەلایەن توێژەرو کۆنەناسە بیانی یەکانیشەوە. لە گومان بەدەرە کە ناوچەکە شایانی لالێکردنەوەی زیاترە، چونکە تەنها سەرچاوەی گەلانی کێوی و شەڕەنگێز نەبووە کە لە دۆڵەکانەوە دەڕژانە خوارەوە بۆ وێران کردنی نشێوەخاکی مێسۆپۆتامیا، هەروەک کتێبی قوتابخانەکانی عێراق وێنەیان دەکێشا، هەروەک چۆن تەنها "چیا دوورە دەستە کەم ناسراوەکانی ڕۆژهەلاتی دیجلە"، "لە پەراوێزی جیهانی شارستانی" شدا نەبووە، وەک زۆرجار لە نوسینە ئەکادیمی یەکانی ڕۆژئاوادا وەسف دراوە. دەتوانرێت بوترێت ئەم ناوچەیە لەکەناری نشێوەخاکی مێسۆپۆتامیا بووە، بەلام لەکەناری شارستانیدا نەبووە و خاوەنی فەرهەنگی خۆمالی خۆی بووە، کە بەشە هەرە گەورەکەی ئەو قالبە ڕەسەنە بووە کە لەپاشتردا شارستانی پەرەسەندووی مێسۆپۆتامیای تێدا دارێژراوە. ئەم ڕاستی یە، دەستپێکە هەرە زووەکانی کۆمەلگا مرۆیی‌یەکانی ئەشکەوتەکانی شانیدار و زەرزی و هەزارمێرد و پاشتریش گوندە کشتوکالی یەکانی چەرمۆ و موعەللەفات و مەتارە و چۆغەمامی بە ڕوونی دەری دەخەن. لەم شوێنانەدا زۆر داهێنانی گرنگ بەدی هاتن کە بەکارهێنانیان و سوود لێ بینینیان تا هەزاران ساڵ دواتریش لە وولاتانی سومەرو بابل و ئاشور بەردەوام بوو، تەنانەت هەندێکیان تا ئێستاش لەکاردان و بەهەمان شێوازی جارانیان پەیرەو دەکرێن. داهێنانی وەک هەوجارو تەشی و سوژن و دەستاڕ و دۆڵ و چنین و ڕستن و خشت و خانووی گڵ و زۆری تر دە هەزار ساڵێک لەمەوپێش لێرە داهێنران. خاڵێکی گرنگی تری فەرهەنگی کوردستان ئەوەیە کە سەرزەمینی بەیەک گەیشتنی هەردوو کاریگەریی فەرهەنگیی مێسۆپۆتامیا و ئێران بووە لەهەردوو لاوە. ئەم کاریگەری‌یە تەنها لە مەیدانی فەرهەنگدا نەبووە، بەلکو لایەنی نەژادیشی گرتووەتەوە، نەتەوە ئێرانی زمانەکان لەسەر ئەم خاکە بە نەتەوە ڕەسەنە نیشتەجێکانی کوردستانی کۆنی وەک گوتی یەکان و لوللوبی یەکان و سوباری یەکان گەیشتوون، سەرباری هەندێک کۆمەلگای سامی و سومەریی نیشتەجێی هەندێک ناوچەی کوردستانی کۆنیش. بۆیە فەرهەنگی ئەم وولاتە خەسلەت و جیاکەرەوەی بیانیی تیادا دەبینرێت کە ئاوێتەی فەرهەنگە خۆمالی یە ناسراوەکەی خۆیەتی.

لەم کتێبەدا، دیاریکردنی مەودا پێویست بوو تا دیار بێت لە چی سەردەمێکدا دەبێت بوەستین و قورسایی لێکۆڵینەوەمان لە چی سەردەمێکدا بێت. لێرەدا زیاتر لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پ.ز. دا قووڵ دەبینەوە، سەردەمێک کە گۆڕانی گەورەو چارەنووس سازی بەخۆیەوە دی، بە شێوەیەک کە کاریگەری یان بۆ چەند هەزار ساڵی داهاتوو لەسەر ناوچەکە هەبوو و هەندێکیان تا ئێستاش دیارن. لەوانەیە گرنگترینی ئەو گۆڕان و ڕووداوانە دارمانی بنەماڵەی سێ یەمی ئور بێت، کە بەدوایدا هورروژمی ئامورییەکان بۆناو میسۆپۆتامیا بە ئەندازەیەکی بەرفراوان دەستی پێکرد و چەند دەوڵەتێکی نوێ یان تیادا دامەزراند. لەکوردستانی کۆنیشدا، نەتەوەکانی ئازادی خۆیان بەدەست هێنایەوە و دەوڵەت/ شانشینی نوێ یان دامەزراند، یان کۆنەکانیان برەو پێدا. یەکێک لەمانە، شانشینی سیموررروم بوو، پادشاکەی، ئیددیـــ(ـــن)-سین هەندێک نوسراوی لەدوا جێماوە کە گرنگی یەکی تایبەتی‌یان هەیە. دۆزینەوەی نوسینێکی تری ئەم پادشایەو گەیشتنی بە ئەنتیکەخانەی سلێمانی لە ١٩٩٣ دا، هاندەرێکی تربوو بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەم شانشینە و بەگشتی لە مێژووی ئەو ناوچەیەی کە تیایدا سەری هەڵدا. هەر ئەم شانشین و یەکێتیی تیرەو هۆزانەبوون کە پاش چەند سەدەیەک ئیمپراتۆری میتانی یان دامەزراند و بووە یەکێک لە زلهێزەکانی نیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پ.ز. و بۆ هەتا هەتایە سیمای ناوچەکە و مێژووی ناوچەکەیان گۆڕی، هەم لەلایەنی سیاسی و هەم لە لایەنی فەرهەنگی و هونەری و ئایینی و زمانەوانیشەوە.

هەروەک لە ناونیشانەکەشەوە دیارە، زیاتر ئەو بەشەی کوردستانمان وەرگرتووە کە خراوەتە سەر عێراق، لەبەر دوو هۆ؛ یەکەمیان، بۆ ماستەرنامەیەک نەدەکرا بابەتێکی لەمە زیاتر و بەر فراوانتر بنووسرێت، دووەمیش ڕووداوەکانی ئەو دەمانەی ئەم بابەتە باسی لێوە دەکەن، بەشی زۆریان لەم بەشەدا ڕوویان داوە. ئەگەر مەودا هەبێت و بۆم هەڵکەوێت، نیازم وایە بەرهەمی داهاتووم لەسەر هەموو کوردستان بێت لەماوەیەکی لەمە درێژتردا.

دەبێت ئەوەش ڕوون بکەمەوە کە لە هەڵبژاردنی زاراوەی 'کوردستانی ناوەڕاست' دا پشتم بە دابەشکردنەکەی میهرداد ئیزەدی بەستووە کە لە کتێبە بەبڕشتەکەیدا هاتووە[1] و منیش ئەمە وەک زاراوەیەکی مێژوویی-فەرهەنگی لەم کتێبەدا بەکار دەهێنم.

---

[1] بۆ ئەم بابەتە دەکرێت تەماشای کتێبەکەی بکرێت:

هیوادارم بتوانم ئەم کورتە مێژووە بە شایستەیی بنووسم و لانی هەرە کەمی مافی خۆی بدەمێ و سوودێکی بۆ خوێنەری کورد هەبێت.

ک. م. ا.

ڕۆتەردام

---

Izady, M., *The Kurds: A Concise Handbook,* Washington, 1992.

# سوپاس و پێزانین

لەماوەی خوێندنەکەمدا لە «دەزگای هۆڵەندی بۆ لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژهەلاتی نزیکNederlands Instituut voor het Nabije Oosten- NINO» ی زانکۆی لایدن، یارمەتی و پاڵپشتیی زۆر کەسانی دڵسۆز مایەی سەرکەوتنی ئەم کارە بوون، کە بەبێ هاوکاریی ئەوان چاو هەڵهێنانی ئەم بەرهەمە مەحاڵ، یان بەلایەنی کەمەوە، نیمچە مەحاڵ دەبوو. بەتایبەتی بۆ منێکی بێ مافی پەنابەرێتی و بێ مافی کارکردن و بێ پاسپۆرت. لەپێشی هەموو ئەوانەی سوپاسیان دەکەم «سندوقی پاڵپشتیی زانکۆ University Assistance Fund- UAF» ی هۆڵەندی یە کە بەسەخاوەتەوە ئەرکی ماڵییانەی چوارساڵ خوێندنی لەزانکۆی لایدن گرتە ئەستۆ و تەنها بەشێکی ئەو یارمەتییەی بە وام دانا، جگە لەمەش هەمیشە ئامادەبوو بۆ هەر هاوکاری و پاڵپشتییەکی ماڵی و مەعنەوی تر. سوپاسی تایبەتیم بۆ لێپرسراوەکەم لە UAF، خاتوو پێترا فێلتمان Petra Veltman هەیە کە بەوپەڕی دڵسۆزی یەوە هەرچی لەتوانایدا بوو بۆ ئاسان کردنی کارەکانم، دریغی نەکرد و تەنها هەواڵی خۆشم لێ یەوە پێ دەگەیشت.

دەستەی کارگێڕی و مامۆستایانی زانکۆی لایدنیش بە گیانی هاوکاری و تێگەیشتنیان هاوپشتێکی زۆر گرنگم بوون. بەتایبەتی پرۆفیسۆر ڤیلفرێد فان سۆلدت Wilfred van Soldt، کە بەسوپاسەوە ئەرکی ماندووکەری سەرپەرشتیکردنی ئەم بەرهەمەی گرتە ئەستۆ و بەووردی خوێندییەوە و پێشنیازی بەکەڵکی بۆی هەبوو. مامۆستای بەڕێز تێئۆ کریسپاین Theo Krispijn، بۆ خوێندنەوەی قووڵ و تێبینییە ووردەکانی شایانی سوپاسێکی زۆرە، سەرباری ئەوەش ئەو کەسە بوو کە لەماوەی چوار ساڵی ڕابوردوودا هەموو گیروگرفتە کارگێڕی و بیرۆکراتی یەکانی لە زانکۆ بۆ چار دەکردم. پرۆفێسۆر کلاس ر. ڤێنهۆف Klaas R. Veenhof مامۆستایەکی بەیارمەتی و هاندەربوو بۆم و. لەگەڵ کریسپایندا شایانی سوپاسێکی تایبەتن بۆ سەبرو هاوکارییان لەساڵی یەکەمی

خوێندنمدا که هێشتا زمانی هۆڵەندیم هێنده باش نەبوو و بەپێی پێویست لەیەک نەدەگەیشتین، بۆیە زۆرجار بە ئینگلیزی وانەکانیان بۆم ڕوون دەکردەوە. سوپاسیان دەکەم.

هەروەها سوپاس و پێزانینم بەرامبەر لێپرسراوانی کتێبخانەی بەشەکەمان و کتێبخانەی زانکۆ دەردەبڕم کە کارەکەمیان ئاسانتر دەکرد و ئامادەی هاوکاری بوون تا دوا چرکەکانی ڕۆژەکانی کار. هەمیشە ئامادەبوون شوێنی کتێب و گۆڤارە وون بووەکانم بۆ بدۆزنەوە و گرفتی مەکینەی فۆتۆکۆپییەکان چار بکەن.

سوپاسێکی تایبەتیم بۆ بەڕێز دکتۆر ناثان ڤاسەرمان Wasserman Nathan لە زانکۆی عیبریی ئورشەلیم-قودس هەیە، کە ئامادەبوو ڕەشنووسی ئەو باسەیم بۆ بنێرێت کە پێکەوە لەگەڵ پرۆفیسۆر شافەر Shaffer دا نوسیویانەو چاوەڕێی بڵاوبوونەوەی بوون و تیایدا نوسینەکەی تری ئیددیــ(ـــن)-سینی ئەنتیکەخانەی ئورشەلیمیان بڵاوکردووەتەوە. ئەم بابەتە بۆ ئەم بەرهەمە زۆر بەسوود بوو و لە وەرگێڕان و تێگەیشتنی نووسینی بەردەکەی شەهید هەڵەدنیدا کە لەم نامەیەدا لێمان کۆڵیوەتەوە جێگای خۆی گرت. ئەم هەڵوێستەی ئەو مایەی سوپاسێکی تایبەتی یە.

هەموو هاوڕێ و برادەرانم، هەریەکە بە جۆرێک یارمەتی و پاڵپشتیی کردووم، سوپاسی هەموویان دەکەم و هیوادارم بتوانم پاداشتیان بدەمەوە. بۆ چاپکردنی ئەم کتێبەش سوپاسی زۆری بنکەی ژین و بە تایبەتی بەڕێزانی دڵسۆز کاک ڕەفیق ساڵح و کاک سدیق ساڵح دەکەم، برایانی دڵسۆز کاک کەمال ڕەشید و کاک هاشم حەمە عبد الله و کاک فازیل قەرەداغی و کاک دڵشاد مستەفاش شایانی سوپاسێکی زۆرن بۆ هاوکاری و یارمەتییان سەرباری سەرقاڵی و ناڕەحەتیی ژیانی خۆیان، هەروەها هەموو برادەران و هاوڕێ یانی تر کە یارمەتیدەر بوون، سوپاسی بێ پایانم بۆ هەموویان.

# ناوەڕۆک

بەشی چوارەم

# کورت کراوہ کان

| | |
|---|---|
| *AASOR* | *Annuals of the American Schools of Oriental Research* |
| *AbB* | *Altbabylonische Briefe in Umschrift und Übersetzung* |
| *AfO* | *Archiv für Orientforschung* |
| *ARAB* | *Ancient Records of Assyria and Babylonia* |
| *ARM* | *Archives Royales de Mari* |
| *ASJ* | *Acta Sumerologica* |
| *BiOr* | *Bibliotheca Orientalis* |
| *CAD* | *The Chicago Assyrian Dictionary* |
| *CAH* | *The Cambridge Ancient History* |
| *CHI* | *The Cambridge History of Iran* |
| *EDGN* | D. Frayne, *The Early Dynastic List of Geographical Names* |
| *FAOS* | I. J. Gelb and B. Kienast. *Freiburger altorientalische Studien* |
| *HSS* | *Harvard Semitic Series* |
| *Iran* | *Iran: Journal of the British School of Persian Studies* |
| *Iraq* | *Iraq: Journal of the British School of Archaeology in Iraq* |
| *IRSA* | E. Sollberger and J.-R. Kupper, *Inscriptions Royales Sumeriennes et Akkadiennes* |
| *JAOS* | *Journal of American Oriental Society* |
| *JCS* | *Journal of Cuneiform Studies* |
| *JNES* | *Journal of Near Eastern Studies* |
| *MARI* | *Mari Annales de Recherches Interdisciplinaires* |
| *MDOG* | *Mitteilungen der Deutsche Orient Gesellschaft* |
| *NABU* | *Nouvelles Assyriologiques Brèves et Utilitaires* |
| *NPN* | Gelb, Purves and MacRae, *Nuzi Personal Names* |
| *OBO* | *Orbis Biblicus et Orientalis* |
| *OLZ* | *Orientalistische Literaturzeitung* |
| *PAA* | J. Læssøe, *People of Ancient Assyria* |

| | |
|---|---|
| *RA* | *Revue d'Assyriologie et d'Archéologie Orientale* |
| *RGTC* | *Répertoire Géographique des Textes Cuneiformes* |
| *RHA* | *Revue Hittite et Asianique* |
| *RIMA* | *Royal Inscriptions of Mesopotamia- Assyrian Periods* |
| *RIME* | *Royal Inscriptions of Mesopotamia- Early Periods* |
| *RISA* | G. A. Barton, *The Royal Inscriptions of Sumer and Akkad* |
| *RlA* | *Reallexicon der Assyriologie* |
| *SAAT* | *The Shemshāra Archive 2: The Administrative Texts,* Copenhagen, 1992 |
| *SCCNH* | *Studies on the Civilization and Culture of Nuzi and the Hurrians* |
| *SEL* | *Studi epigrafici e linguistici sul Vicino Oriente antico* |
| *SKL* | Th. Jacobsen, *The Sumerian King List* |
| *Sumer* | *Journal of Archaeology and History of the Arab World-* Issued by the State Organization of Antiquities and Heritage of Iraq |
| *TUAT* | *Texte aus der Umwelt des Alten Testaments* |
| *URI* | *Ur Excavatins- Inscriptions* |
| *ZA* | *Zeitschrift für Assyriologie und vorderasiatische Archäologie* |
| *ZZB* | D. O. Edzard, *Die »Zweite Zwischenzeit« Babyloniens* |

## لیستی هێماکان:

لەم کتێبەدا چەند جۆری جیاواز کەوانە و هێما بەکار هاتوون کە هەریەکەیان واتا و مەبەستێکی تایبەتیان هەیە، ئەوانیش ئەمانەن:

( ) لە وەرگێڕانی دەقە مێخی‌یەکاندا ئەو ووشانە دەگرێتە خۆ کە وەرگێڕی دەقەکە بۆ تەواو کردن یا ڕوونکردنەوەی واتا دایناوە.
لە ناویشدا واتای وایە ئەم ناوە دەشێت ئەوەی نێوان کەوانەکەی لەگەڵدا بێت و دەشێت لەگەڵیشیدا نەبێت، چونکە بەهەردوو شێوەکە لە دەقە مێخی یەکاندا هاتووە، بۆ نمونە قابـــ(ـــا)ـــرا واتای وایە لە هەندێک دەقدا قابرا نووسراوە و لە هەندێکیش دا قابارا. لە ناوێکی وەک ئیددیـــ(ـــن)-سین دا واتای وایە ناوەکە ئیددی-سین نووسراوە، بەڵام باوەڕی وەرگێڕ وایە کە ئەو (ن)ەی لەگەڵدا بووە.

[ ] لە وەرگێڕانی دەقە مێخی‌یەکاندا ئەو ووشانە یان نیشانە مێخی‌یانە دەگرێتە خۆ کە لە دەقە مێخی یەکەدا شکاون یان داخوراون. ئەگەر هێمای X یان لەخۆ گرتبوو، ئەوا چەند هێما بن ئەوەندە نیشانەی مێخی شکاوە، ئەگەر تەنها خاڵیان لە خۆ گرتبوو، ئەوا واتای وایە کە ژمارەی نیشانە مێخی یە شکاوەکان نەزانراوە.

< > نیشانەیەک لە دەقە مێخی‌یەکەدا لە لایەن نووسەرە کۆنەکەیەوە نەنووسراوە یان بیرچووە.

<< >>نیشانەیەکی مێخی بە هەڵە دووجار نووسراوە.

/ ئەم هێڵە لە نێوان دوو ووشەدا واتای "یان" دەبەخشێت، بۆ نمونە: پادشا/میر، واتە وەرگێڕانی ئەو ووشەیە دەشێت پادشا بگەیەنێت و دەشێت بە میریش وەربگێڕدرێت. لە نێوان دوو پیتیش دا واتای وایە کە دەشێت ئەم پیتە بێت یان ئەو پیتە، بۆ نمونە ناوی زابـــ/مبان دەشێت زابان بێت و دەشێت زامبان یش بێت.
ئەم ئەستێرەیە لەپێش ووشەوە واتای وایە ئەم شێوە ناوە یان ووشەیە بەم شێوەیە لە هیچ دەقێکدا نەدۆزراوەتەوە، بەڵام باوەڕ وایە کە لە بنەڕەتدا بەم شێوەیە بووبێت و ئەو شێوەیەی لەبەر دەستدایە لەم شێوەیەوە هاتووە.

< شێوەی ووشەی پێش ئەمە بۆ شێوەی پاشی پەرەی سەندووە.

> شێوەی ووشەی پاش ئەمە لە شێوەکەی پێشی‌یەوە پەرەی سەندووە.

‘ ’ ناوی کەسی یان شوێن یان ئاوو ڕوبار دەگرنە خۆ.

فۆنتی *لار* ناوێک کە بەفۆنتی لار *Italic* لە نێو ئەو دوو کەوانەیەی سەرەوەدا بنووسرێت ناوی کەسێک، شوێنێک یان ئاوێکی کۆنە، ناوە نوێ یەکان بە فۆنتی ئاسایی نووسراون. بەڵام ئەگەر ناوێکی کۆن زیاد لە جارێک نووسرابێت و ناسرابێت ئیتر بە فۆنتی *لار* نانوسرێت.

" " دەستەواژە یان ڕستە یان دەقێک یان واتای شتێک دەگرنە خۆ.

لە نووسینی دەنگ و ناوەکانی دەقە مێخی‌یەکانیشدا ئەم پیتانە بەکاردێن:

G̃, g̃ نگ (لە دەقی سومەریدا)

*Ḫ, ḫ* خ

*Š, š* ش

*Ṣ, ṣ* ص

*Ṭ, ṭ* ط

ئەو ڤاوەڵانەش کە خەتێکی کورتیان لەسەرە، وەک *ā, ē, ī, ū* واتای وایە ئەمانە درێژن. ئەوانەش کە شێوەی ژمارە هەشتێکی پچووکیان لەسەرە، وەک *â, ê, î, û* واتای وایە ئەمانە لە ئاوێتەبوونی دوو ڤاوەڵی جیاواز دروست بوون و ئەمەیان لێ دەرچووە یان ئەمەیان زاڵ بووە.

# بەشی یەکەم

ا) کەی، کوێ و بۆچی کوردستانی ناوەڕاست؟

ب) هەڵکەوتەی جوگرافیی ناوچەکە

ج) گەلانی کۆنی کوردستانی ناوەڕاست

"گوتیوم، سوبارتو و
توکریش کە چیاکانیان دوورەدەستن،
کە زمانەکانیان ئاڵۆزن"
**حەمورابی،**
*URI*, No. 146

## ا) کەی، کوێ و بۆچی کوردستانی ناوەڕاست؟

ئەو کوردستانی ناوەڕاستەی لەم کتێبەدا باسی لێوە دەکەین بەزۆری ئەو بەشەی کوردستانە کە خراوەتە سەر عێراق. لەڕۆژئاوایەوە کۆنە وولاتی ئاشور هەبووە کە لەقۆناغە هەرە کۆنەکانیدا ڕوباری دیجلە لە کوردستانی ئێستای جیا دەکردەوە و لە دواتردا هەندێک لە خاکی ئەمبەر دیجلەشی گرتە دەست. ئەم بەشەی کوردستانی کۆن

لەسەرچاوەکانی مێسۆپۆتامیای کۆندا بەزۆری بە سەرزەمینی دوژمنکارو بێگانە وەسف دراوە، کە پڕی بووە لە تیرەو نەتەوەی کێوی و جەنگاوەری چەمووش و لەزۆربەی کاتدا یاخی و ناحەز بە سیستەمی سیاسی و فەرهەنگیی مێسۆپۆتامیا. بەکورتی، لە دیدی مێسۆپۆتامیایی‌یەکانەوە جیهانی پێچەوانەی مێسۆپۆتامیا بووە، جیهانێک کە مایەی شڵۆقی و هەڕەشە بووە بۆجیهانەکەیان. بەڵام لەهەمان کاتیشدا بۆ مێسۆپۆتامیا سەرچاوەیەکی سەرەکیی کەرەستەی خاوی لەهەموجۆرێک و بەندە و، تەنانەت هەندێک جار کرێگرتەش بووە. هەردوولا پەیوەندی‌یەکی دوولایەنەی سروشت بگۆڕیان هەبووە: زۆربەی کات دوژمنکارانەو هەندێک جاریش ئاشتی‌یانە. بەم شێوەیە، دەوڵەتەکانی مێسۆپۆتامیا کە توانایان دەبوو لەشکرکێشی‌یان دەکردە سەر ئەم سەرزەمینانەی کوردستان و، لەکاتی لاوازی و کەم توانایی‌شیاندا دەبوونە قوربانیی "چیایی‌یەکان"ی کوردستان. لەگەڵ ئەمانەشدا، توێژەرە هاوچەرخەکانی ئێستا زۆر جار باسی ئەم سەرزەمینانە وەک سەرچاوەی زۆر لەو لایەنە فەرهەنگی‌یانە دەکەن کە هێنراونەتە مێسۆپۆتامیاوە، بەتایبەتی لە ئایین و هونەرو تەکنیک و زمان و تەنانەت هەندێک سیستەم و دامەزراویشدا. ئەمەش سەیر نیە ئەگەر ئەوە بخەینە بەرچاومان کە کوردستان یەکێک لە لانکە هەرە یەکەمەکانی مرۆڤی چاخی بەرد و لە دواتریشدا یەکەمین جوتیارو گوندنشین بووە، شوێنێک کە تیایدا هەنگاوە هەرە سەرەتایی‌یەکانی کاروانی شارستانی هەڵهێنراونەتەوە. بۆیە بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەکرێت گرنگی‌یەکی تایبەتی هەبێت؛ بۆ توێژینەوەی مێژووی کوردستان و ئەوەندەی سەرچاوەکان دەست بدەن خستنە بەرچاوی شتێک لەبارەی ژیانی فەرهەنگیی دانیشتوانەکەیەوە. سەرباری ئەمەش، دەشێت هەوڵی تێگەشتنی سروشتی ئەو ململانێ سەخت و درێژخایەنەی نێوان هەردوولا بدەین: دەوڵەتەکانی مێسۆپۆتامیا لەلایەک و نەتەوەکانی کوردستانی کۆن لەلایەکی ترەوە، ئەو نەتەوانەی کە زۆر جار خۆیان لە شانشین، دەوڵەتۆکە، میرنشین یان یەکێتی هۆزایەتیدا ڕێک خستووە.

لەحاڵی وادا، ئەگەر مەحاڵیش نەبێت ئەوا زۆر نارەحەتە دیاری بکەین کام لا دەستپێکەری شاڵاو بووە بۆ سەر ئەوی ترو کامیان بەرگری کار بووە. مەسەلەکە لەمە ئاڵۆزترە. ناکۆکی و ململانێی نێوان نەتەوە و گەلان سەرەتای ڕوون و دیاری نیە، هەروەک چۆن کۆتاییەکەشی دیار نیە. ئەمە بۆ بەدواداچوونی هۆکارەکانیشیان ڕاستە، کەدەشێت زۆر زۆر بن لە هەرکاتێکدا ولەهەمووکاتێکدا. بەکورتی، ئەم هۆکارانە بریتین لە دەستەیەکی ئاڵۆزو بەیەکداچوو لە پێشینەو بیروباوەڕو سوننەت و بەرژەوەندی و پاڵنەری دیارو نادیار.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا زیاتر جەخت لەسەر سەردەمی نێوان ڕمانی بنەماڵەی سێ یەمی *ئور* *Ur* لە ٢٠٠٦پ.ز. دا تاوەکو سەردەمی پێش سەرهەڵدانی *میتانی* *Mittanni* وەک زلهێزێک لە دەوروبەری ١٥٠٠پ.ز. دا دەکەین. لەم سەردەمی نزیک لە ٥٠٠ ساڵەدا، هەموو ناوچەکە بەگشتی گۆڕانی گەورەو ڕووداوی بەرچاوی بەخۆیەوە دی. کۆچ هێنانی *ئاموری*یەکان بۆناو مێسۆپۆتامیا و دەستەڵات گرتنەدەستی *حەمورابی* *Hammurāb/pi* لە *بابل* و *شەمشی-ئەدەد* *Šamšī-Adad* لە *ئاشور* دەشێت بە بەرچاوترینیان لەقەڵەم بدەین. بەڵام لەهەمان کاتدا ڕووداوو جموجۆڵی گرنگی تریش لە مەیداندا هەبوون؛ ئەو ڕۆڵەی نەتەوەکانی چیاکانی باکوری ڕۆژهەڵاتی مێسۆپۆتامیا-واتە کوردستانی ناوەڕاست- گێڕایان، وەک نەتەوەکانی *گوتی* *Guti*، *لوللوبی* *Lullubī*، *توروککو* *Turukkû* و *خوری* *Ḫurri* و هی تر، ڕچەی شکاند بۆ ئەوەی ئەمانە، یان لەوانەیە هەندێکیان، بتوانن لەئەنجامدا زلهێزێک بنیاد بنێن کە لەسەرچاوە کۆنەکاندا *میتانی* پێی دەووترا. ئەو کاریگەرییەی گەلانی کوردستانی کۆن لەسەر مێژووی سیاسیی وولاتانی ئاشور و بابل هەیانبووە شایانی لالێکردنەوەیەکی تایبەتە؛ بۆ نمونە کاریگەری *توروککی*یەکان لەپاش مردنی *شەمشی-ئەدەد*، کە لەنامەکانی ئەرشیفی شاری

'ماری' [1] دا ئاماژەی بۆ کراوە و لە بەشی چوارەمدا دەیبینین. بەڵام بەگشتی، زۆر کەم لەبارەی ئەم گەلانە خۆیان و لەبارەی ڕۆڵیانەوە دەزانین لەچاو ئەوەی لەبارەی گەلانی تری میسۆپۆتامیاوە دەیزانین. بەتایبەتی لە سەردەمەکانی تری پێش و پاش سەردەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە، بەشێکی ئەم کەم زانینە بۆ لەدوا جێ نەمانی سەرچاوەی نووسراو لەلایەن ئەم گەلانە خۆیانەوە دەگەڕێتەوە و بەشێکیشی بۆ کەمی یان نەبوونی کنە و پشکنینی کۆنەناسی‌یانە لە کوردستاندا. ئەمە جگە لەوەی نووسەرەکانی میسۆپۆتامیا لەهەموو کات و سەردەمێکدا وەک یەک لەبارەی کوردستانەوە نەیان نووسیوە و زانیاری‌یان بۆمان تۆمار نەکردووە. ئەم ڕاستی‌یانە وادەکەن دۆزینەوەی هەر نووسینێکی نوێ یان لەوحێکی قوڕی نووسراو لەم ناوچەیەدا ئێگجار گرنگ و هەواڵ بەقاو بێت، چونکە، سەرباری ئەوەی زانیاری نوێ و ڕەسەن بەدەستەوە دەدەن، بوارێکی دانسقەش بۆ تەماشاکردنی ڕووداوو ڕاستی‌یەکان لەدیدگای لایەنەکەی ترەوە دەڕەخسێنن، دیدگایەک کە تا ئێستا زۆر دەگمەن هەڵ کەوتووە و هەرچی دەیزانین بەشی هەرە زۆری لەڕێی نووسراوەکانی دوژمنەکانی نەتەوەکانی ئەم وولاتەوە پێمان گەیشتووە. دۆزینەوەی ئەرشیفەکانی *شمشارە* [2] یەکێک لەم هەلە دەگمەنانە بوو، هەرچەندە بەشی هەرە زۆری نامەکانی لە دەرەوە نێردراون، واتە لە وولاتی ئاشورەوە بۆ *شوشەڕڕا* (ناوی کۆنی شمشارە)، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا زانیاری گرنگ و وورد لەسەر ڕووداوەکان بەدەستەوە دەدەن. هەندێک

---

[1] ماری Mari شارێکی دێرینی سەر ڕوباری فوراتە لە ناو سوریادا بەڵام زۆر نزیک لە سنووری عێراق. ئێستا بە وێرانەکانی دەووترێت 'تەل الحریری' و لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا فەرەنسی‌یەکان دەستیان کردە کنە و پشکنین و زۆر شوێنەوار و پاشماوەی گرنگیان تیادا دۆزی‌یەوە، لەوانەش ئەرشیفێکی نزیک بە ٢٥ هەزار لەوحی قوڕی نووسراو کە لەم کتێبەدا زۆر جار ناوی دەبەین.

[2] شمشارە ناوی ئێستای گردێکە لە دەشتی بیتوێن و لە کۆندا، هەروەک لە نووسینەکانەوە دەرکەوتووە، پێی دەووترا '*شوشەڕڕا* *Šušarrā*' لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا لە لایەن دانیمارکی‌یەکانەوە کنە و پشکنینی تیادا کرا و پاشانیش لە لایەن تیپێکی عێراقی‌یەوە. لێرەش دوو ئەرشیفی پچووک بەڵام زۆر گرنگ دۆزرانەوە.

سەرچاوەی نووسراوی تری *ڕەسەن* لەناوەوەی ئەم وولاتەوە بە ڕێکەوت بەدەست کەوتوون، بۆ نمونە تاشە بەردە نووسراوەکانی *ئیدی‌ـــ(ـــن)-سین*، پادشای ســـ/شیمورروم، ئەو وولاتە و، پاشان شانشینەی کە زۆر جار لەلایەن پادشا و فەرمانڕەواکانی سومەر و ئەکەدەوە لە باسی لەشکرکێشی‌یەکانیاندا بۆ کوردستانی کۆن ناوبراوە، هەروەک لە بەشی سێ یەمدا دەیبینین. پێکەوەنانەوەی پارچەکانی ئەم وورده زانیاری‌یانەو هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی وابەستەیی‌یان لەگەڵ زانیاری‌یە نووسراوەکانی وولاتانی ئاشور و بابلدا، ئەرکێکە هەوڵ دەدەین لەم کتێبەدا بەجێی بگەیەنین.

بگەڕێینەوە سەر ئەو سەرزەمینانەی ڕووداوەکانی ئەم مێژووەیان بەخۆوە دی؛ بەگشتی دابەش دەبنە سەر دوو جۆرە زەمینی سەرەکی: ناوچە دەشتایی‌یەکان و ناوچە کوێستانی‌یەکان. یەکەمیان لەدەشتەکانی ڕۆژهەڵاتی موسڵ، ڕۆژئاواو باشوری ڕۆژئاوای هەولێر و بەرەوخوار بەرەو زنجیرەی حەمرین -بە ناوچەی نوزی‌ی کۆنەوە- پێک دێت. دووەمیشیان بریتی‌یە لە زنجیرە چیاو دامێنەکانی لای ڕۆژهەڵات و باکوری ڕۆژهەڵاتی دەشتەکانەوە، واتە بەشی باکوری زنجیرە تەریبەکانی زاگرۆس و دۆڵە تەنگەکانی نێوانیان. ئەم بەشە شاخاوی‌یە بەرەو ناوجەرگەی باکوری ڕۆژئاوای ئێرانی ئێستا و ئەولاتریش درێژ دەبێتەوە. بەڵام بەداخەوە، زانیاری لەسەر هەموو ئەو ناوچەو هەرێمانەی سەر بەم سەرزەمینە گەوریەن و لێرەدا ئاماژەیان بۆ دەکرێت، نیە و مێژووی زۆر ناوچە لە هەندێک سەردەمدا هێشتا نەزانراوە. لەجیاتی ئەمە، تیکەی پچووک پچووکمان لە زانیاری مێژوویی لە بەردەستدایە کە لە تۆمارەکانی پادشایان و نووسەران و ڕەبەنەکانی مێسۆپۆتامیادا لەبارەی ئەم وولاتەوە نووسیویانە، ئەویش تا ئەو ڕادەیەی کە پەیوەندی بەخۆیانەوە هەبووە. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێک خاڵی ڕووناک لەم تاریکایی‌یەدا هەن کە چەند سەرچاوەیەکی دانسقەو دەگمەن لە ناو خودی ناوچەکە خۆیەوە ڕۆشنی دەکەنەوە، وەک میل و نەخشی قەد شاخ و هەندێک جاری زۆر کەم، بەڵگەنامەی نووسراو. لەبەر ئەم هۆیانە نووسینەوەی مێژووی ئەم ناوچەیە بۆ هەر مێژوونووسێک ئەرکێکی گران

دەبێت تا ئەو ڕۆژەی کۆنەناسان لەم وولاتەدا دەست بە کنەو پشکنین دەکەن ، وولاتێک کە لە دیدگای کۆنەناسییانەوە زۆر کەم ناسراوە.

## ٢) هەڵکەوتەی جوگرافیی ناوچەکە

هەروەک لەسەرەوە ئاماژەی بۆ کرا، ئەم وولاتە لەڕووی جوگرافییەوە دەکرێت دابەش بکرێتە سەر دوو ناوچەی سەرەکی: ناوچە دەشتاییەکان و ناوچە شاخاوییەکان کە لەنێوانیشیاندا ناوچەیەکی زۆرگ و گردۆلکەیی هەیە. سەبارەت بە دەشتەکان (نزیکەی ٢٠٠م لەسەر رووی دەریاوە)، لە باکور و باکوری ڕۆژهەلاتی موسڵەوە بە ئاقارێکی باکوری ڕۆژئاوا بەرەو باشوری ڕۆژئاوا تا شاری مەندەلی لەسەر سنوری عێراق-ئێران دەکشێن و چوار ڕوبار پیایاندا تێپەڕ دەبێت. شارەکانی هەولێر و کەرکوکی ئێستا و نێوەی ڕۆژهەلاتی شاری موسڵ گەورەترین ئاوەدانییەکانین. هەولێر نزیک دامێنی چیاکانی نێوان هەردوو زێ یە کە لەکۆنیشدا هەر 'زاب' یان پێ دەوترا، بۆیە هەرێمەکەی هەولێریش لەسەردەمی ئەشکانییەکاندا هەر بە *'حەدیاب'* دەناسرا (*ئەدیابینە* *Adiabene* ی سەرچاوە کلاسیکییەکان) و لەوانەشە هەر هەمان *'زابان'* *Zabān* ی سەرچاوە مێخییەکانیش بووبێت. کەرکوک کەوتۆتە سەر ئاوی 'خاسە' کە لقێکە دەچێتەوە سەر دیجلە و لەباشوری زێی خوارووە. هەرێمەکەی لە سەرچاوە کۆنەکاندا، لە دەوروبەری هەزارەی دووەمی پ.ز. ەوە پێی دەووترا *'ئەرراپخا/ـە Arrapḫa/e'*. موسڵیش کەوتووەتە سەر ڕوباری دیجلە لە ڕۆژئاوای هەولێرەوە. ئاوەدانی پچووکتر لەمانە لە دەشتەکاندا بریتین لە مەخمور لە باشوری ڕۆژئاوای هەولێر، پردێ (=ئاڵتون کۆپری) لەسەر زێی خواروو لە باکور و باکوری ڕۆژئاوای کەرکوک، تاوق (=داقـوق) لـە

نەخشەی ژمارە ١: بەشێکی کوردستانی ناوەڕاست. سەرچاوە:

Microsoft Corporation- *Encarta Grote Wereld Atlas 2000, Winkler Prins.*

وێنەی ژمارە ١: وێنەیەکی کوردستانی ناوەڕاست کە بە مانگی دەستکرد گیراوە. تیایدا زنجیرە چیاکان و ڕووبارەکان و دەریاچەکان و دەشتەکان دیارن. بەفرێکی زۆریش بە بەرزاییەکانەوەیە. سەرچاوە:
http://www.visibleearth.nasa.gov/

نەخشەی ژمارە ٢: زنجیرە شاخەکانی کوردستانی ناوەڕاست، سەرچاوە (بە زیادکرن و هەندێک ڕاست کردنەوەوە):

Great Britain, *Iraq and the Persian Gulf.*

باشوری کەرکوک، دوز (=توزخورماتو) لەسەر لقی ئاوە سپی لەباشوری کەرکوک، کفری، خانەقین، شارەبان(=میقدادیە)، قزرابات (=سەعدیە)، مەندەلی و هەندێکی تر.

ڕووی زەویی بەشی باکوری ئەم دەشتانە گردو تەپۆلکەی زیاترەو چەم و ئاوەڕۆیشی زیاترە، بەڵام زۆربەی ئاوەکانی وەرزین. بەپێی ئەم دەشتە و بەهاتی دانەوێڵەی بەناوبانگە، سەرباری لەوەڕگا فراوانەکانی کە بۆ بەخێو کردنی ڕان و ماڵاتە گەورەکانی نمونەیین. چەقە شارستانیە کۆنەکانی 'تەپە گەورە' و *'نینەوا'* و 'نیمرود' (*کەلحوی* دێرین) و هەولێری دێرین و *قابـــرا Qabrā'* و *کاکـــزو Kakzu'* و *ئەخـــازوم Aḫāzum'* ( ڕەنگە تەل ماحوزی ئێستا بووبێـــت ) و *'ماشکـــان-شـــەرری Maškan-šarri'* لە باشوری شاری دێرینی *'ئاشور'* کە لەوانەیە لەلای ڕێژنەی زێی خواروو بووبێت،[3] نمونەی ئەم ڕاستیەن. بەڵام بەشی باشوری دەشتەکان، بەتایبەتی لە کەرکوک بەرەو خوار، تەخت تر و گەرمترن و بەهۆی ڕادەی کەمتری بارانەوە ووشک تر و کەم پیت تریشن. لەبەرچاوترین دیاردەی تۆپۆگرافی ئەم بەشە زنجیرەی 'حەمرین'ە (=ئێبیخ *Ebiḫ* ی دێرین). لە ڕۆژئاوای دیجلەوە دەست پێ دەکات، لەوێ 'مەکحول'ی پێ دەڵێن[4] و لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی دیجلەوە بە ئاقارێکی باکوری ڕۆژئاوا بەرەو باشوری ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە و ووردە ووردە بەرەو پچووکی و نزمی دەچێت تا لە نزیک

---

[3] Frayne, D., "The Zagros Campaigns of Šulgi and Amar-Suena," *Studies on the Civilization and Culture of Nuzi and the Hurrians (SCCNH)*, Vol. 10 (1999), p. 167

فرەین هەوڵی داوە ناوە جوگرافیەکانی کە لە سەرچاوە مێخیەکاندا هاتوون لەگەڵ ئەو ناوە جوگرافیە هاوچەرخانەدا یەک بهێنێتەوە کە لە ناوە کۆنەکان دەچن یان پێ دەچێت لە کۆنەکانەوە هاتبن، تەنانەت ئەگەر ئەو ناوە هاوچەرخانە واتای تەواویان لە زمانە هاوچەرخەکانیشدا هەبێت. لەم هەوڵەیدا پشت بە بیردۆزی *Volksetymologie* دەبەستێت کە بەلای منەوە لەزۆر حاڵەتدا دەشێت ڕاست بێت.

[4] Great Britain- Naval Intelligence Division, *Iraq and the Persian Gulf*, 1944, p. 82.

مەندەلی دیارنامێنێت. هەر ئەم بەشەش لەڕۆژگاری ئێستادا گرنگی‌یەکی ئێگجار گەورەی هەیە بە بوونی چاڵە نەوتە زەبەلاحەکانی دەورووپشتی کەرکوک و پچووکترەکانی نەفت خانە لە باشوری خانەقینەوە لەنزیک سنووری عێراق-ئێران. بەڵام لە سەردەمە کۆنەکانیشدا ئەم بەشەی دەشتەکان هەر گرنگ بووە؛ بەڵگەی ئەم ڕاستی‌یەش بوونی چەندەها شوێنەواری کۆنەناسی‌یانەیە کە زۆریان لە ڕێی نووسراوە مێخی‌یەکانەوە ناوە کۆنەکانیان ناسراون وەک ‘Batir باتیر’ (=تەل سولەیمە)، ‘Aw/bal ئاو/بال’ (لەشوێنێکی دەورووپشتی قەرەتەپە)،[5] ‘Rašab ڕاشاب’ (=تەل حەدداد یان ئەلسیب؟)،[6] ‘Matka ماتکا’ (لەوانەیە گوندی ئێستای ’ماتیکە‘ بێت کە دەوری ٤ کم لە باشور و باشوری ڕۆژئاوای تاوقە)،[7] ‘Ḫarši خارشی’، ‘Šuḫnir شوخنیر’، ‘کورڕوخانی Kurruḫani’ (=تەل الفەخار)، ‘Nuzi نوزی’، ‘Arrapḫa ئەڕڕاپخا’، ‘شێنکور Šenkur’ (=تەل سونکور ی ئێستا؟)،[8] ‘Terqa تێرقا’ یان ‘Terrabān تێرڕابان’ (لەوانەیە تاوقی ئێستا بووبێت. بۆ نمونە "تێرقانی بەرامبەر گوتیوم" لە دەقێکی فەرهەنگی دا هاتووە)،[9] ‘Kimaš کیماش’ ‘Ḫumurtum خومورتوم’ (لەوانەیە دوزی ئێستا بووبێت)[10] و زۆری تر. هەڵکەوتنی ئەم دەشتانە لەنێوان جەمسەرەکانی زنجیرەکانی ئەو دەمانەدا گرنگی‌یەکی تایبەتی پێ بەخشیبوو، بۆیە ڕێگاوبانە سەرەکی‌یەکانی هاتووچۆ کە وولاتانی بابل و ئاشور و عیلام و فارس و میدیا و هی تریان پێکەوە دەبەستەوە بیرەدا تێ

[5] Frayne, D., The Early Dynastic List of Geographical Names (EDGN), *American Oriental Series,* Vol. 74, 1992, p. 56.
[6] Frayne, *SCCNH* 10, p. 153.
[7] *Op. Cit.*, p. 158.
[8] *Op. Cit.*, p. 190.
[9] Frayne, *EDGN,* p. 58,

هەروەها بڕوانە:

Goetze, A., “Sin-Iddinām of Larsa, New Tablets from his Reign,” *JCS* IV (1950), p. 95.
[10] Frayne, *SCCNH* 10, p. 154.

دەپەڕین.[11] ڕێگای شاهانەی ئەخەمینی کە بە کەرکوک و هەولێردا تێ دەپەڕی نمونەیەکی باشی ئەم ووتەیەیە. سەرباری ئەمەش، پێنج ڕوبار هەن کە ئەم دەشتانە دەبڕن و دەڕژێنە ناو دیجلە و ٦٦,٢٤%ی ئاوەکەی فەراهەم دەکەن.[12] ئەمانە باکورەوە بۆ باشور بریتین لە: ١) خابور بە لقەکەیەوە کە 'هێزل' ی پێ دەووترێت، لەنزیک سنوری عێراق- تورکیا بە دیجلە دەگەن و ٢,٢١ % کۆی ئاوەکەی فەراهەم دەکەن،[13] ٢) زێی گەورە/سەروو کە لقێکی گەورەشی بەناوی خازرەوە هەیە، لە نێوان موسڵ و شیرقات دەڕژێتە دیجلەوە و ٣٢,٦٤% ی ئاوەکەی فەراهەم دەکات، ٣) زێی پچووک/خواروو بە لقە سەرەکی‌یەکانی‌یەوە: گۆمە، کۆیە و کەندیناوا. لە نزیک فەتحە دەڕژێتە دیجلەوە و ١٦,١٨%ی ئاوەکەی بۆ دەهێنێت،[14] ٤) عەزێم، بە خۆی و لقەکانی‌یەوە: خاسە بە ناو کەرکوک دا، تاوق بەناو تاوق دا و ئاوە سپی بەناو دوزدا تێ دەپەڕن، یەک دەگرنەوە و لە نزیک بەلەد لە باکوری بەغداوە دەڕژێتە دیجلەوە، عەزێم تەنها ١,٦٤%ی ئاوی دیجلەی پێ فەراهەم دەکرێت لەبەرئەوەی بەشی زۆری ساڵ ووشکە.[15] یەکێک لە لقە پچووکەکانی ئەم ڕوبارە ئێستا پێی دەووترێت 'نهر شطیط' کە تا سەردەمانێکی نزیکی پێش ئێستاش بە عەرەبی' نهر رثن'ی پێ دەووترا کە فرەین بە 'ڕادانو *Radānu*'ی دێرینی سەرچاوە مێخی‌یەکانی دەزانێت.[16] ٥) سیروان (کە بەشی خوارووی دیالە ی پێ

---

[11] سەبارەت بەم ڕێگا و بانانە لە ناوچەی حەمرین بڕوانە:

Postgate, N., "The Historical Geography of the Himrin Basin," *Sumer* XXXV (1979), Part 1 & 2, p. 586-94; Postgate, "The Historical Geography of the Himrin Basin" *Sumer* XL (1983), Part 1& 2, p. 149-59.

[12] خەبات عەبدوڵلا، *بنەما تیۆری‌یەکانی جوگرافیای عەسکەری کوردستانی باشور*، سلێمانی، ٢٠٠١، ل. ١٤٢.

[13] *هەمان سەرچاوەی پێشوو*، ل. ١٤٣.

[14] *هەمان سەرچاوەی پێشوو*، ل. ١٤٤.

[15] *هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو*.

[16] Frayne, *Op. Cit.*, p. 151.

دەووتریت)، لقە سەرەکی‌یەکانی تانجەرۆ و ئەلوەند و دیوانەن، لەخوار بەغداوە بە دیجلە دەگات و ١٣،٥٧% ی ئاوەکەی دابین دەکات.[١٧]

ناوچەی شاخاوی بە گشتی بەشی باکور وناوەراستی زنجیرە مەزنەکەی زاگرۆس پێک دەهێنیت، بەشیوەی کەوانێکی گەورە بە کوردستانی ناوەراستدا دەکشێت. لە خالی بەیەک گەیشتنی‌یەوە بە زنجیرەی تۆرۆس لە باکوری رۆژئاوا، دەست پێ دەکات و بە ئاقاری کەنداوی فارس لە باشوری رۆژهەلات دا دەکشیت. بەلام لە ناو ناوچەی مەبەستی ئیمەدا، ئەم چیایانە هەتا بەرەو باشوری رۆژهەلات برۆن نزمترو سادەتر و تەریتر بەیەک دەبن، لەکاتێکدا بەرزترین و ئالۆزترینی بەشەکانی دەکەونە ناو ئیرانەوە (کەبیر کوهـــ و زەردە کوهـــ و پشتکۆ و پێشکۆ) لە لورستان، کە بەرەوژێرترە لە ناوچەی لێکۆلینەوەکەمان.

چیاکان دەکریت دابەش بکرێنە سەر دوو جۆری سەرەکی؛ یەکەمیان چیا بەرز و سەخت و لۆچ دارەکانن کە نێوانیان دۆلی قول و تەنگن و بە شێوەیەکی نارێک ناوچەکانی نزیک سنوری تورکیاو ئیرانیان گرتووەتەوە. بەرزایی‌یەکانیان لەنێوان ١٠٠٠-٣٦٠٠م لە سەرووی رووی دەریاوەیە. لوتکە بەرزەکانیان بە درێژایی سال بەفر داپۆشیون. ریگا و بانەکانی هاتوو چۆیان کەمن و ریکردنیان سەختە، بەتایبەتی بۆ کاروانی گەورە و سوپا و دەکریت بەئاسانی کۆنترۆل بکرێن لەرێی ئەو هەموو دەربەندانەی نێوانیانەوە، ئەو ووشەیەی (واتە دەربەند) کەلەزۆر لە تۆپۆنیمەکانی(=ناوی شوێن) ناوچەکەدا دەبینریتەوە. زۆر ئاسانە بەرگریکەران ئەم دەربەندانە بەرووی داگیرکەری بێگانەو دوژمنانی ناوخۆیی دا دابخەن و چوونە پێشیان رابگرن، بەلام لەهەمان

زانیاری فرەیین لەبارەی بوونی ناوی 'رثن' دوە لەم سەرچاوەیەوە وەری گرتووە:

N. Hanoon, *Studies in the Historical Geography of Northern Iraq During the Middle and Neo-Assyrian periods,* Toronto, 1986.

[17] خەبات، *هەمان سەرچاوەی پێشوو*، ل. ١٤٤.

کاتیشدا بەفرو هەڵسانی ئاوی بەهارانیش بەئاسانی ئەم ڕێگای هاتووچۆ و پەیوەندی‌یانەی خودی دانیشتوانی ناوچەکە دەگرێت. ئاماژەیەک بۆ ئەم ڕاستی یە لە دەقێکی ئەدەبیی سومەری کۆندا هەیە کە بە دەقی لوگال-ئی 'Lugal-e' ناسراوە و دەڵێت: "کە بەفر زۆر کەڵەکە دەبێت، لە لای دوورەوە لە چیاکان هەڵدەچنن"[18] هەربۆیەشە ئەم ناوچەیەی چیاکان لە کۆنترین سەردەمانەوە بۆ جموجۆڵی سەربازی سەختترین و نارەحەتترین ناوچە بووە. باشترین نموونەش بۆ ئەمە ئەو ناوچەیەیە کە نزیک بەیەک گەیشتنی هەرسێ سنووری ئێستای عێراق و ئێران و تورکیایە کە سەرباری ئەوەی نیوەڕێی نێوان هەردوو دەوڵەتی دوژمن بەیەکی ئاشور و ئورارتو بووە و بۆ ئەمە دەبووایە کورتترین خاڵی نێوانیان بێت لە جەنگەکانیاندا لەگەڵ یەک، کەچی بەهۆی ئەم سەختی و ڕژدی‌یەیەوە هیچ کاتێک لە شەڕو پێکدادانەکانیاندا ئەم ناوچەیەیان بەکار نەهێناوە. لەجیاتی ئێرە ڕێگای ناوچەی وەک خابوری نزیک زاخۆ لە ڕۆژئاوایان گرتووەتە بەر یان لە خاکی مانناوە لە ڕۆژهەڵاتەوە شاڵاویان بۆ یەک بردووە، هەروەک میلەکانی کێلەشین و تۆپزاوە پیشانی دەدەن.

جۆری دووەمی چیاکان نزمترو سادەترو درێژترو بەیەکتر تەریب ترن، کەوتوونەتە نێوان جۆری یەکەم و دەشتەکانەوە. دۆڵەکانی نێوان ئەمانە پانترو درێژترن، بەڕادەیەک کە لەهەندێک شوێندا دەشتی تاڕادەیەک گەورە پێک دەهێنن.

چیاو کەژەکان زۆرن، بەڵام هەندێکیان شایانی باسکردنن بەهۆی شوێنیان یان بایەخی ستراتیجی‌یان یان ناوبانگیانەوە. لەباشوری زێی خوارووەوە، زنجیرەی قەرەداغ (١٠٧٦م) بۆ جیاکردنەوەی دەشتایی‌یەکان لە ناوچە شاخاوی‌یەکانی سلێمانی و پشت سلێمانی

---

[18] Jacobsen, Th., *The Harps that Once... - Sumerian Poetry in Translation*, New Haven, 1987, p. 251, l. 335-6.

لەمپەرێکی نمونەیی‌یە.[١٩] سێ دەربەندی سەرەکی تێدایە کە گرنگترین و بەناوبانگترینیان دەربەندی بازیانە کە لە سەرچاوە مێخی‌یەکاندا بە دەربەندی *'بابیتێ'* *'Babite'* ناسراوە، پاشان هەردوو دەربەندی سەگرمە و دەربەندی پەیکولی دێن. لەپاش قەرەداغ — ئەگەر لە باشورەوە تەماشا بکەیت- زنجیرەی درێژی بەرانان[٢٠] (١٣٧٣م.) دیت کە ئەشکەوتی بەناوبانگی هەزارمێردی تێدایە بەرامبەر شاری سلێمانی. بە پشت سلێمانی‌یەوە هەردوو یالی گۆیژە (١٥٢٤م.) و ئەزمەڕ (١٧٠٢م.) هەن، ئەمی دوایی‌یان پێ دەچێت لەگەڵ هەمان *ئەزیرو* *Aziru*'ی سالنامەکانی ئاشورناسیرپال دا یەک بێت کە تیایدا باسی لەشکرکێشی‌یەکەی بۆ ئەم ناوچەیە دەکات.[٢١] پیرەمەگرون (٢٦٢٠م.)[٢٢] بلندترین چیای باشوری زێی خوارووە کە ئاشورناسیرپال لەسالنامەکانیدا لە بارەیەوە دەڵێت "*کەژی نیموش* KUR*Nimuš* ، کە لوللوبی‌یەکان کینیپا *Kinipa* ی پێ دەڵێن."[٢٣]

[19] Edmonds, C. J., *Kurds, Turks and Arabs: Politics, Travel and Research in North-Eastern Iraq 1919-1925*, London, 1957, p. 16.

[20] شپایزەر بە هەڵە ناوی ئەم زنجیرەیەی بە 'بەراناند' نووسیوە لە باسە بەپێزەکەیدا:

Speiser, E.A., "Southern Kurdistan in the Annuals of Ashurnasirpal and today," *AASOR* VIII for 1926-27 (1928), *passim.*

[21] Speiser, E. A., *Op. Cit.*, p. 25.

[22] خەبات، *هەمان سەرچاوە*، ل. ١٠٢.

[23] Grayson, A. K., *The Royal Inscriptions of Mesopotamia. Assyrian Periods (RIMA) -Vol 2:* Assyrian Rulers of the Early First Millennium (1114- 859 BC) I, Toronto, 1991, A.0.101.1 (No. 1), ii 33b-38, p. 204.

سەبارەت بەوەی کە لە گەڵ پیرەمەگروندا یەکن، بڕوانە:

Speiser, *Op. Cit.*, p. 18.

هەروەها ئەو سەرچاوانەی لە پەراوێزی ٣١دا ئاماژەی بۆ کردوون. تێبینی بکە کە خوێندنەوەی ناوی ئەم چیایە بە *نیموش* *Nimuš* لە جیاتی نیصیر *Niṣir* لەسالانی دواییدا زیاتر بەرەو چەسپین دەچێت، زیاتر لەبەر دەرکەوتنی ناوی کەسیی *I-di-in-ni-nu-uš* لە نوسراوێکی مێخیدا. لامبێرت لەوەش زیاتر دەڵێت کە ناوی چیای خواوێندراو (=deified —واتە بە خواوەند لەقەڵەم دراون، ئەمەش نەریتێکی کۆنی مێسۆپۆتامیایی بووە کە پادشا یان هەندێک کەل و پەل یان ڕوبار و شتی لەو جۆرە لەریزی

بەتەنیشت پیرەمەگرونەوە، زنجیرەی قەرەسرد بە ئاقاری باکوری ڕۆژئاوادا تا بەنداوی دوکان دەکشێت. لە ڕۆژهەڵاتی سلێمانیەوە چیاکانی پێنجوێن (١٥٠٠-٢٠٠٠م.) لەسەر سنوری عێراق-ئێران چەند ڕێگایەکیان بەرەو بانی ئێران تێدایە وەک گۆخلان و خانمە شێخان و کانی خان. لە باشوری ئەمانەوە شاخەکانی هەورامان (٢٠٥٤٨م.) و سورێن لەمپەرێکی زۆر سەختن و برینیان کارێکی تەواو ماندووکەرە. لەنێوان هەردوو زێشدا لەپێشدا هەیبەت سوڵتان (١٢٠٦م.) دێت کەبەسەر کۆیەدا دەڕوانێت، پاشان کۆرەک (٢١٢٥م.) و ئاسۆس و کورکورە و کۆلارە دێن. ئەمەی دوایی‌یان دوور نیە هەمان ' کوڵلار *Kullār*' ی ساڵنامە ئاشوری‌یەکان بێت.[٢٤] بەتەنیشت کۆلارەوە کێوەرەش هەیە کە بەسەر ڕانیەدا دەڕوانێت و هەردوو دەشتی بیتوێن و قەڵادزێ لەیەک جیا دەکاتەوە، ئەمجا دەگەینە سەر قەندیل (٣٤٢٥م.) و کونە کۆتر (٢٦٩٢م.) لەسەر سنوری عێراق-ئێران. لێرەش ڕێگایەکی گرنگی تر هەیە کە بەرەو بانی ئێران دەچێت. لە بەرەوژوورتر چیاکانی هەریر (١٤٤١م.) و خانزاد (١٥٣٠م.) لە پشت هەولێرەوە هەن، خانزاد پێ دەچێت هەر هەمان چیای 'خانی *Hani*' بێت کە سینحاریب (٧٠٤-٦٨١ پ.ز.) ی پادشای ئاشور لە نوسینەکەیدا بە سەرچاوەی ئاوی ئەو کەناڵە ناوی بردووە کە هەڵی کەندووە و ئاوی پێ گەیاندووەتە هەولێری کۆن و ئێستا بە بەستۆرە ناسراوە. ئەمجا سەفین (١٤٧٥م.) و لەپاش چەندێکی تر حاجی ئۆمەران لەسەر سنوور دێن و

---

خواوەندەکان حسابیان بۆکراوە و نیشانەی خوایەتی‌یان لە پێش ناوەکانیانەوە داناوە-) لە ناوچەکانی کوردستانی کۆندا دەگمەن نەبووە، بڕوانە:

Lambert, W. G., "Notes Brèves," *Revue d'Assyriologie et d'Archeologie Orientale (RA)* 80 (1986), p. 186.

کەچی پارپۆلا لەم بەرهەمەی خوارەوەیدا تەنها خوێندنەوەی *نیصیر* ی داوە:

Parpola, S., *Neo-Assyrian Toponyms,* Neukirchen-Vluyn, 1970, p. 269.

[24] Speiser, *AASOR,* p. 19-20.

بەڵام لیڤاین لەگەڵ ئەم ڕایەدا نیە هەرچەندە دوو ناوەکە زۆریش لەیەک دەچن، بڕوانە:

Levine, L. D., "Geographical Studies in the Neo-Assyrian Zagros I," *Iran* XI (1973), p. 18, note 61.

دەربەندی بەناوبانگی کێلەشین لێرەیە کە هەولێرو ناوەوەی ئێران لەڕێی 'ڕێگای هامیلتۆن' ەوە کە بەشارۆچکەکانی شەقلاوە و هەریر و دیانە دا تێدەپەڕێت، پێکەوە دەبەستێتەوە. بەرزترین لوتکەی کوردستانی ناوڕاست هەڵگورد (٣٦٠٧م.)[25]ە لە چیای حەسارۆستی نزیک برادۆست (٢٠٧٦م.)، ئەمی دوایی‌یان ئەشکەوتی شانیداری تێدایە کە دواتر دێینە سەر باسی. لە باکوری زێی سەرووشەوە کە لە دەشتەکانەوە بڕوانیت، یەکەمین چیا کە بەرچاو دەکەوێت چیای مەقلوبە کە دێری *'مار مەتیَ'* ی تێدایە و لەسالانی هەرە سەرەتای مەسیحی‌یەتدا بنیات نراوە. ئەمجا چیاکانی بەردە ڕەش و ئاکــــرێ (١٥٤٨م.) و بەخێرو چیا کێرێ (١١٨٦م.) و چیا دێرێ (١٢٣٠م.) و شیرین (٢٣٧٨م.) و پێرس (١٦٢٤م.) و مەتین (٢٠٩٥م.) -کە بەسەر ئامێدی دا دەڕوانێت-، گــــارە (٢١٦٠م.) و چیای زنار و زاویتە هەن، ئەمەی دوایی‌یان سنوری هاوبەش لەگەڵ تورکیادا پێک دەهێنێت.

چەقە ژیاری‌یە دیارەکانی ناوچە شاخاوی‌یەکان لە باکورەوە بریتین لە ئامێدی کە لە سەر تەختی چیایەکە و پایتەختی میرنشینێکی بەهێزی چاخەکانی ناوەڕاست بووە، دهۆک، ئاکرێ، ڕەواندز کە هەم لە مێژووی و هەم لە هەڵکەوتنیدا زۆر لە ئامێدی دەچێت، شەقلاوە،[26] ڕانیە، قەڵادزێ، کۆیە،[27] تەقتەق،[28] چوارتا، ماوەت و پێنجوێن.

---

[25] خەبات، *هەمان سەرچاوە*، ل. ١٠١.

[26] فرەین هەوڵی داوە لەگەڵ *'شیکشاببوم Šikšabbum'* ی دێرینی تۆمارەکانی بنەماڵەی سێ یەمی ئور و ئەرشیفەکەی شمشارەدا یەکیان بهێنێتەوە، بڕوانە:

Frayne, *SCCNH* 10, p. 180.

[27] بە پێی فرەین،دەبێت لە کۆیە بۆ *'کاکمـــ(ــیــ)ــوم Kakm(i)um'* ی دێرین بگەڕێین، بڕوانە:

Frayne, *SCCNH* 10, p. 171.

[28] لەوانەیە *'تیکیتیخوم Tikitiḫum'* ی تۆمارەکانی ئوری سێ یەم لێرەدا بووبێت هەروەک فرەین بۆی دەچێت:

Frayne: *SCCNH* 10, p. 169.

دەربەندو تەنگەکانی ناوچە شاخاوی‌یەکان، هەروەک ئاماژەی بۆ کرا، زۆر گرنگ و کاریگەرن لە جوگرافیای ناوچەکەدا و رۆڵێکی گەورەیان لە مێژوو و جیۆپۆلیتیکیدا گێڕاوە. لەوانەیە لە گرنگترینیان دەربەندەکانی حەمرین و سەکەلتوتان و عەین لەیلان بن لەنێوان عەزێم و سیروان لە باکوری دەلی عەبباس، دەربەندی ئینجانە لە باشوری ئەو خاڵەی تیایدا عەزێم حەمرین دەبڕێت، دەربەندی عەین نوخەیلە لە باکوری تکریت کە بۆ کەرکوک دەچێت.[۲۹] شارێی خوراسان کە ناوەڕاست و باشوری مێسۆپۆتامیا بە بانی ئێرانەوە دەبەستێتەوە بە دەربەندی 'کور دەرە' دا تێدەپەڕێت و دەچێتە سەرپولی زەهاو وکرماشان[۳۰] و پاشان هەمەدان.[۳۱] پەلێکی تری ئەم ڕێ یە بەرەو باکوری ڕۆژهەڵات دەچێت لە نزیک ئاوی سیروان بەدەربەندی خان دا تێ دەپەڕێت تا دەگاتە دەشتی شارەزوور.[۳۲] لە سەرتر، لە زنجیرەکانی قەرەداغ و سەگرمە و بازیان دا چەند دەربەندێک هەن کە لە باشورو ڕۆژئاواوە دەچنەوە سەر باکور و ڕۆژهەڵات بۆ ناوچەی سلێمانی و پاشی‌یەوە یان بە پێچەوانەوە، لەمانەش دەربەندی 'بێلولە' کە نەخشە هەڵکەندراوەکەی *تار-دونی Tar-dunni*'ی لێیە؛ دەربەندی 'پەیکولی،' کە شوێنەوارە یادگاری‌یە بەناوبانگەکەی *نەرسی* ***Narseh*** 'ی پادشای ساسانی لێیە؛ دەربەندی

---

[29] Great Britain, *Iraq and The Persian Gulf,* p. 83.

[30] ناوی شاری کرماشان لە سەرچاوە نوێ و هاوچەرخەکانی ئێران و زۆربەی ئەوانەی ڕۆژئاوا و تەنانەت عەرەبی‌یەکانیش بە 'کرمانشاە' دەنووسرێت، بەڵام دانیشتوانەکەی تائێستاش هەر کرماشانی پێ دەڵێن. ئەمەش وەنەبێ هەڵە بێت، بەڵکو ناوە ڕەسەنەکەیەتی هەروەک لە سەرچاوە عەرەبی‌یەکانی چاخەکانی ناوەڕاستیشدا هاتووە بە شێوەی 'قرمیسین' یان 'قرماسین' و وا باوە کە بەناوی یەکێک لە پادشاکانی‌یەوە ناونراوە کە ناوی 'کرماژن' بووە. شێوەی نوێی کرمانشاە لەسەردەمی شاکانی دوایی ئێراندا سەپێنرا بۆ بەفارس کردنی شارەکەو ناوەکەی.

[31] Postgate, "The Geographical History of the Himrin Basin," *Sumer* XXXV (1979), Part 1 &2, p. 594.

[32] *Ibid.*

شپایزەر دەربەندی خان بە دەربەندی *خاشمار* *Ḫašmar*'ی کۆن دەزانێت، بڕوانە:

Speiser, *AASOR,* p. 26.

'سەگرمە' کە لە ١٩٩٢ دا نەخشێکی هەڵکەندراوی نوێی لێ دۆزرایەوە،[٣٣] دەربەندی 'گاور' بە نەخشە ناسراوەکەیەوە کە زۆر کەس بە نەخشی *'نەرام-سین* 'Narām-Sîn*ی ئەکەدی دەزانن، دەربەندی 'بازیان،' *'بابیتێ* 'Babite*ی کۆنی ساڵنامەکانی ئاشورناسیرپالی دووەم،[٣٤] کە لەوانەیە هەر هەمان *Bù-tá* یان *[b]udi₄* بێت کە لە لیستی ناوە جوگرافی‌یەکانی ئەم ناوچەیەدا هاتووە و هی سەردەمی سەرهەڵدانی بنەماڵەکانە(Early Dynastic Period).[٣٥] لەپاڵ چەندەها دەربەندی تردا لە ناوچەکانی سەرووتر وەک گەلی عەلی بەگ و کێلە شین و دەروازەی خابور و هی تر.

دەشتە ناوخۆیی‌یەکانی نێو شاخەکان لە کۆندا زۆر گرنگ بوون و تا ئێستاش هەروان. گەورەترینیان سندی و ڕانیە و شارەزوورن. لە سەردەمانی زۆر کۆنەوە بەهۆی بەپیتی خاکیان و لەباریی تۆپۆگرافی‌یانەوە چەقی سیاسی و ژیاری‌یان تیادا کۆبووەتەوە. سندی کە دەکەوێتە نێوان زێی سەروو و ڕووباری دیجلەوە، لە باکورەوە بە چیا کێرێ و چیا دێرێ و لە باشورەوە بە چیای بەخێر دەورە دراوە. زاخۆ لەوپەڕی باکوریدا گەورەترین چەقی ژیاری‌یەتی. دەشتی هەریر و باتاس لە باکوری ڕۆژهەڵاتی هەولێر و ڕۆژهەڵاتی زێی سەروو، هەرچەندە پچووکترن بەڵام مێژوویەکی گرنگیان هەیە. ئەو هەموو شوێنەوارە کۆنەی تیایاندایە نیشانەی ئەم ڕاستی‌یەن. زۆر پێ دەچێت ناوە کۆنەکەی دەشتی هەریر *'هـ/خابرورو* *Ḫabruru* ' بوو بێت (جاران بە *کیررورى* *Kirruri* دەخوێندرایەوە)،[٣٦]

---

[33]ئەم دۆزینەوەیە لە ١٩٩٢ دا لەلایەن دانیشتوویەکی شاری چەمچەماڵەوە بەناوی کاک ڕەزا خرایە ڕوو، کە خۆی لەکاتی سەردانێکیدا بەرچاوی کەوتبوو.

[34]Speiser, *Op. Cit.*, p. 3; p. 15.

شایانی ئاماژە بۆکردنە کە تا ئێستاش شوێنەواری شورایەکی کۆن کە لەسەر پاشماوەی شورایەکی کۆنتر بنیات نراوە لەلای چەپی دەربەندەکەوە -ئەگەر لە کەرکوکەوە بچیت- دیارە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەربەندەکەی داخستووە.

[35] Frayne, *EDGN*, GN 17, p. 79.

[36]Levine, L. D., "Kirruri, Kirriuri," *RlA* Band 5 (1976-80), p. 606;

که بۆ 'هـ/حەریر'ی ئێستا پەرەی سەندووە، بەتایبەتی که 'حەرور' لەهەندێک لە سەرچاوە ئیسلامی‌یەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا لەباسی ئەم ناوچەیەدا دەبینرێت. دەشتی ڕانیە که لە ڕاستیدا حەوزی زێی خوارووە، کێوە ڕەش دەیکاتە دوو کەرتەوە: کەرتی ڕۆژهەڵاتی پێی دەووترێت 'پشدەر' که مەبەست لێی "پشتی دەروازە" یە و ئەو دەروازەیەش دەربەندی 'ڕامکان'ە که هەردوو کەرتەکە پێکەوە دەبەستێت، کەرتی ڕۆژئاواشی پێی دەووترێت بیتوێن که بەشی هەرە گەورەی بووە بەژێر ئاوی بەنداوەکەی دوکانەوە. چەقە ژیاری‌یە گەورەکانی ئەم دەشتە بریتین لە ڕانیە و قەڵادزێ. دواترینیان دەشتی شارەزوورە که کەوتووەتە ناوچە شاخاوی‌یەکانی باشوری ڕۆژهەڵاتەوە لەنێوان زێی خوارو و ڕوباری سیروان دا. لە باشوری ڕۆژئاواوە زنجیرەکانی بەرانان و گڵە زەردە و تاسلوجە و لە باکور و باکوری ڕۆژهەڵاتەوە گوێژەو ئەزمەڕ و سورداش دەوریان داوە. چەقە ژیاری‌یە گەورەکانی سلێمانی‌یە لە بەشی باکوری ڕۆژئاوایدا و لە باشوری ڕۆژهەڵاتیشەوە عەربەت و سەید سادق و خورماڵ و هەڵەبجەن.

سەرچاوەی ئاو لە کوردستاندا ڕۆڵێکی لەڕادەبەدەر کاریگەرو یەکلایی کەرەوەی هەبووە و هەیە، چونکە ئەو فاکتەرەیە که شێوازی ژیانی دانیشتوان دیاری دەکات و بەسەریاندا دەیسەپێنێت. زۆربەی سەرچاوەکانی ئاو لە ژمارەدایە نەک لە بڕدا، ڕوونتر بڵێین، هەزاران کانی و کانیلە و کارێز هەن که بەسەر ڕووبەری فراواندا پرش و بڵاوبوونەتەوە، بەڵام هیچیان، ڕوبارەکانیان لێ دەربچێت، بڕی ئاوەکەیان ئەوندە زۆر نیە که بەشی ژیان و گوزەرانی کۆمەڵگای گەورە بکات و لەئەنجامدا ناتوانن ببنە مایەی دەرکەوتنی چەقی ژیاری گەورەی وەک ئەوەکانی باشوری مێسۆپۆتامیا. لە جیاتی ئەمە،

---

هەر سەبارەت بە هـ/خابوورو و دەربەندە بەناوبانگەکەی که لە سەرچاوە مێخی‌یەکاندا هەر بەو ناوەوە ناسرابوو، بڕوانە:

Saggs, H. W. F., “The Land of Kirruri,” *Iraq* XLII (1980), pp. 79-83.

دانیشتوان ناچار دەکەن بەسەر ڕوبەری فراواندا، پێ بە پێی سەرچاوەکان، پرش وبلاو ببنەوە و لە دێ و کوێرە دێی پچووک پچووک و لەیەک دابڕاودا ژیان بەسەر بەرن. بەڵام لەلایەکی ترەوە، بەشی هەرە زۆری کوردستان بە برە بەفرو بارانیکی باش بەهرەمەندە کە دابینی کشتوکاڵی دێمیی پێ دەکرێت[٣٧] (بەرێژەی ٥٠٠ – سەروو ٢٠٠٠مم لە ساڵێکدا)،[٣٨] لەپاڵ بوونی بەراو لە زۆربەی ئاوەدانی‌یەکاندا، هەرچەندە پارچە زەوی پچووکن و پشت بە ئاوی کانی و چاوگ دەبەستن بۆ ئاودێری‌یان. لە زۆر شوێندا دانیشتوانی گوندەکان تا ئێستاش تەکنیکێکی زۆر کۆن و سەرکەوتووانە بەکار دەهێنن بۆ کۆکردنەوەی ئاوی ژمارەیەک کانیلەی پچووک و کەم ئاو و کردنی بە یەک لە ڕێی هەڵکەندنی تۆڕێک لە ئاوەڕۆ و کەناڵی ژێر زەوی، و پێی دەڵێن 'کارێز.' ئەم تەکنیکە بە بڕوای هەندێک مێژوونووس و کۆنەناس پێ دەچێت لەسەردەمی ئەخەمینی‌یەکاندا داهێنرابێت، ئەگەر پێشتریش نەبووبێت. لە ئەدەبیاتی کۆنەناسی دا هەر بە 'قەنات' ناسراوە.

دوا بابەت لەم بەشەدا باسی بکەین ڕووەکی ناوچەکەیە کە لە دەشتەکاندا هەر ڕووەکی ستێپە و بریتی‌یە لە ناوچەی فراوانی بە گیا داپۆشراو لەگەڵ دارو درەختی پرش و بلاو لەسەر تەختی یاڵ و گردەکان. لە کوێستانەکانیش هەر گیایە بەڵام جۆرەها دار و درەختیان لێ سەوز دەبێت، لە هەموویان بەربلاو تر دار بەڕووە، ئەمجا بە پلەی دووەم دار مازوو و سنەوبەر و کەوت وداره بەن و ئورز[٣٩] (زیاتر بەلای باکورەوە) و هەندێک میوەی کێوی وەک هەنجیر و چواله و هەرمێ و سێوی مزرو گوێزو گۆێژو ترێ و هی تر. بەڵام بەداخەوە ناوچەکە لە کۆندا و تائێستاش بەدەست داربڕینی بێ سنوورەوە دەناڵێت، کە بووەتە هۆی ڕووتانەوەی زۆر لە یاڵ و چیاکانی کوردستان و ئەمەش

---

[37] Great Britain, *Iraq and the Persian Gulf*, p. 82.
[38] Izady, M., *The Kurds: A Concise Handbook*, p. 17.
[39] Izady, *Op. Cit.*, p. 20.

کاری کردووەتە سەر کەش و ئاوو هەوای ناوچەکە،[٤٠] هەروەک لە وولاتانی دراوسێشدا هەیە (بۆ نمونە ئێران).[٤١]

## ب)        گەلانی کۆنی کوردستانی ناوەڕاست

یەکێک لە بابەتە نارەحەتەکان قسەکردنە لەبارەی گەلانی زاگرۆسەوە؛ مەودای باڵ کێشانی نەژادی و زمانەوانی‌یان، پێشینە و بنج و بناوانی مێژوویی و فەرهەنگی‌یان و بابەتی تری وابەستەی ئەمانەیە. هۆی ئەمەش، هەروەک بەئاسانی دەتوانرێت تێبینی بکرێت، ئەوەیە کە ئەم گەلانە خۆیان زۆر کەم تۆماری نووسراویان لەدوای خۆیان جێ هێشتووە. بۆیە مێژوونووس ناچارە پەنا بۆ تۆمارەکانی مێسۆپۆتامیا بەرێت، کە زانیاری پچڕ پچڕ و پارچە پارچە لەم بارەیەوە دەبەخشن. ئەم پارچە پارچەیی و ناتەواوی‌یەش خۆی لەخۆیدا هۆی تری هەیە، زاگرۆس و نەتەوەکانی هەمووکات جێگای گرنگی پێدانی

---

40 ئیدمۆندز لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا لەبارەی ئاوو هەوای کوردستانەوە نووسیویەتی و دەڵێت:"وەرزی باران هەم لە زورگەکان وهەم لە دەشتەکان لە دەوروبەری نۆڤەمبەردوە (١١) تا ئەپریل (٤) درێژەی هەیە، بەڵام لە دوای قەرەداغەوە تاوە باران تەنانەت لە ناوەڕاستی هاوینیشدا نائاسایی نیە،" بڕوانە:

Edmonds, *Op. Cit.*, p. 19.

جێی سەرسوڕمانە کە باران لە پاش مانگی پێنجەوە لەم ناوچەیەدا کە ئیدمۆندز باسی دەکات لە ڕۆژگاری ئێستادا زۆر دەگمەنە. لەمەش سەیرتر، هەندێک قسەی دەماودەم دەگێڕنەوە کە ڕووی داوە گورگ پەلاماری مەڵۆ گەنمی داوە، هێندەی بەفر لەسەر بووە وای زانیوە مەڕە ، زانراویشە کە گەنم لە ناوچەکانی کوردستاندا لە هاویندا درەوێنە دەکرێت!

41 بۆ نمونە بڕوانە:

Potts, D. T., *The Archaeology of Elam, Formation and Transformation of an Ancient Iranian State,* Cambridge, 1999, p 22.

مێسۆپۆتامیایی‌یەکان نەبوون تا هەمووشتێک لەبارەیانەوە بنووسن و مێسۆپۆتامیایی‌یەکان خۆیشیان بەرچاویان تەواو ڕوون نەبووە و کەمیان لەبارەیانەوە زانیوە. لەلایەکی تریشەوە برو چۆنیەتی زانیاری‌یەکان بە جۆری ئەو دەقانەوە بەندن زانیاری‌یەکانیان تۆمار کردووە، ئیتر دەقی مێژوویی بن یان ئەدەبی یان سالنامە یان فالْ گرەوەیی یان ئایینی یان هەر جۆرێکی تر. ئەم دەقانە بریتین لە نووسراو بەجۆرەها ناوەرۆکی جۆرا و جۆر کە کورتە زانیاری ناڕاستەوخۆ لەبارەی زاگرۆس و نەتەوەکانی‌یەوە دەدەن، لە باسی بابەتی تردا کە هەندێک جار پەیوەندی‌یان بە زاگرۆسەوە نیە.

نارەحەتی‌یەکی تر ئەو هەموو گۆڕان و جموجۆلْ و جێ گۆڕکێ نەژادی‌یانەیە کە بە درێژایی مێژوو لە ناوچەکەدا ڕوویان داوە. لە ئەنجامی ئەم گۆڕان و جێ گۆڕکێ یەدا، ئاوێتەیەک لە نەتەوە یان نەژادی جیاواز پەیدا بووە کە لە جۆرەها نەتەوە وهۆزو تیرەو بنەچە پێک هاتووەکە هەندێکیان لە ڕووی زمان و نەژادەوە خزم و خوێش بوون، هەندێکی تریان نا، هەندێکیان لەگەلْ یەکتردا بوون بەیەک و هەندێکیان بە جیایی ماونەتەوە، ئەمە سەرباری ئەوەی کە سنووری قەلْەمڕەویان و مەودای پەل کێشانی نەژادی‌یان بە پێی کات و بارو دۆخ لە گۆڕانی بەردەوامدا بووە. ئەمەش ئەوەندەی تر وێنەکەی بەرچاوی مێسۆپۆتایی‌یەکانی تەلْختر و شێواو تر کردووە، ئەم ڕاستی‌یەش لە سەرچاوە مێخی‌یەکاندا بە جوانی ڕەنگی داوەتەوە.

لەم پەرەگرافانەدا کە دێن، هەولْ دەدەین زانیاری‌یەکانی کە سەبارەت بەم گەل و نەتەوانەی زاگرۆسەوە لەبەردەست دان لەیەک بدەین و دایان بڕێژینەوە و پوختەکەیان بخەینە بەردەست. لەم زانیاری‌یانەوە دەردەکەوێت کە ڕەمەی دانیشتوانی کوردستانی کۆن لە تۆرمەیەکی ناسامی نا سومەری بوون، پێ دەچێت زۆربەیان دانیشتووی ڕەسەنی وولاتەکە بووبن، یان وەک دەلْێن 'بوومی Aboriginals.' بەلام هەندێکی تریان، وەک خوری‌یەکان، زۆر پێ دەچێت کۆچ هێنەر بووبێتن. لەپالْ ئەمانەشدا کاریگەریی

سامی و عیلامی و سومەری کەم تا زۆر، هەروەک بە ناوە کەسی‌یەکانیاندا دا دەردەکەوێت، لە هەندێک شوێندا هەبووە.[٤٢] بێگومان لەم کورتەیەدا باسی هەموو گەلانی کوردستانی ناکەین، بەڵکو تەنها لەوانە دەکۆڵینەوە کە لە سەردەمی بابەتی ئەم کتێبەدا رۆڵیان گێراوە.

## سوبارتو و سوباری‌یەکان:

تا ئێستا کۆنترین ناوی زانراوی کوردستانی ناوەڕاست لەرێی سەرچاوە نووسراوەکانەوە ناوی گشتی نەژادی-جوگرافی '*سوبیر/سوبارتو Subir/Subartu*' ە کە بە زۆر شێوەی جیاواز لە سەرچاوە سومەری و بابلی و ئاشوری‌یەکاندا نووسراوە،

---

[42] مایەی سەیر لێ هاتنە کە شتاینکێلەر دەڵێت گوایە دانیشتوانی سوبارتوی بنە (=Subartu Proper )، واتە بەشی هەرە گەورەی کوردستانی ناوەڕاست، بەشی هەرەزۆریان سامی بوون:
Steinkeller, P., "The Historical Background of Urkesh and the Hurrian Beginnings in Northern Mesopotamia," *Urkesh and the Hurrians (Studies in Honor of L. Cotsen), Bibliotheca Mesopotamica,* Vol. 26, Malibu, 1998, p. 88-9.
وەک دەردەکەوێت، لەمەدا پشتی بە بوونی ناوی کەسیی سامی بەستووە کە بۆ مەبەستی وا جێگای متمانەو پشت پێ بەستن نیە، لە زۆر حاڵەتی تردا دەرکەوتووە کە کەسانی نا سامی هەبوون ناوی سامی‌یان هەبووە هەروەک ئێستاش وایە. جگە لەمەش، ناوی کەسی بەڵگەیەکە تێروانین و لێکۆڵینەوەی زیاتری دەوێت، چونکە زۆر ناو، بەتایبەتی ئەو بەشەیان کە ناوی خواوەندێکی تێدایە (= Theophoric element ) بە لۆگۆگرام نووسراون- واتە نیشانەیەکی مێخی کە لە نووسیندا یەک جۆرە و لە خوێندنەوەدا بە هەر زمانە و جۆرێکە بە پێی زمانەکە خۆی- کە دەکرێت لە زمانە ناسامی‌یەکاندا بەجۆرێکی تر بخوێنرێتەوە. بۆ نموونە ناوێکی وەک ZÁLAG-$^{d}$IŠKUR (بڕوانە: *RIMA 2,* I, A.O. 101,1,l. 49 ) کە لە هەزارەی یەکەمی پ.ز. دا سەردارێکی زاموا بووە و لە ساڵنامەکانی ئاشورناسیرپالدا ناوی هاتووە و هەردوو بەشی ناوەکەی بە لۆگۆگرام نووسراون، مەرج نیە بە زمانی ئەکەدی بە '*نور-ئەدەد Nūr-Adad*' بخوێنرێتەوە هەروەک هەمیشە دەکرێت، بەڵکو دەکرێت ناوێکی لوللوبی بوو بێت بەزمانی لوللوبی.

وەک سوبیرSubir ، شوبور Šubur، شوپریا Šupria، شــ/سوبارو Š/Subaru و...هتد.[٤٣]

**شوێنیان و بلاوبوونەوەیان:**

ناوی سوبیر وەک تۆپۆنیم (Toponym= ناوی شوێن/ جوگرافی) لەبەر ئەو هۆیانەی باس کران زۆر نارەحەتە سنوورەکانی دیاری بکرێن. هەندێک سەرچاوەی کۆنی وەک 'جوگرافیای سارگۆن' سنورەکانی بەم شێوەیە دەست نیشان کردووە:
"[*ultu šadê er*]*ēni adi An-za-an «ZA.AN»*[ki44] *māt Subartu*

---

[43]بۆ شێوە جۆراو جۆرەکانی ڕێنووس کردن(=Spelling)ی ئەم ناوە، بڕوانە:
Gelb, I. J., *Hurrians and Subarians (HS)*, Chicago, 1944, p. 23-31.
هالۆ Hallo ئاماژەی بۆ شێوەیەکی تریش کردووە کە لەوانەیە ئەویش هەر بە سوبیر خوێندرابێتەوە و بریتییە لە SÚ. NAM[ki] ، بۆ ئەمە بڕوانە:
Hallo, W., "Zāriqum," *JNES* XV (1956), No. 4, p. 224, note 21.
شایانی تێبینی کردنە کە دۆرم Dhorme ناوی سوبیری لە سەرچاوە کلاسیکییەکانیشدا ناسیوەتەوە کە بەم شێوانە هاتوون:
'Sáspeires, Sáp/beires, Sábiroi and Sábēroi'.
بڕوانە:
Gelb, *Op. Cit.*, p. 30
(بەئاماژە کردن بۆ:
P. Dhorme, "Soubartou-Mitani." *RA* VIII (1911), 98 ff).
ئەوەش بڵێین کە ناوی 'شوبورŠubur' لەسەرچاوە سومەرییەکاندا –بەلایەنی کەمەوە لەڕووی ڕێنووسەوە– بە ئاژەڵێکەوە، کە بەرازە، وابەستەیە: PA. ŠUBUR هاوڕێ لەگەڵ:
PA.UDU, PA. GUD, PA.ANŠE و هی تر،
بڕوانە:
Gelb, *Op. Cit.*, p. 24.
[44] تێبینی خوێندنەوەکەی ڤایدنەر بکە کە بەلایەوە 'Anzanzan,'ە، بڕوانە:
Weidner, E., "Das Reich Sargons von Akkad," *AfO* XVI (1952-53), p. 4.

$(Su.bir_4)^{ki}$,"

واتە: "لە چیاکانی ئورزەوە تا ئەنشان: وولاتی سوبارتوە."[٤٥] ئەم شوێن دیاری کردنە لەلای باکوری‌یەوە پەسەندە، بەلام لە لای باشوری ڕۆژهەلاتی‌یەوە زۆر زیاد ڕۆیشتوو

---

ئەم دەقە بەناوبانگەی کە بە 'جوگرافیای سارگۆن' ناسراوە مایەی ناکۆکی نێوان ئەسیریۆلۆجیستەکانە (= Assyriologist، واتە زانایانی خەتی مێخی و زمانە مردووەکانی پێی نووسراون). زۆربەیان بەهی سارگۆنی ئەکەدی دەزانن (بۆ نمونە ئۆلبرایت Albright وگرەیسن Grayson) و هەندێکیش بە هی سارگۆنی ئاشوری (پۆتس Potts و میرۆپ Mieroop): بۆ ئەم ڕاو بۆچوونە جیاوازانە و لێکۆلینەوەکەی میرۆپ خۆی لەم بارەیەوە بڕوانە:

Mieroop, M., "Literature and Political Discourse in Ancient Mesopotamia," *Munuscula Mesopotamica: Festschrift für Johannes Renger,* Herausgegben von: B. Böck, E. Cancik-Kirschbaum und T. Richter, Münster, 1999, p. 330-1; 331ff.

بەلگە و بیانوو بۆ ئەم ڕایانە ئەو تۆپۆنیمانەن کە ناویان لە دەقەکەدا هاتووە کە هەندێکیان هی هەزارەی یەکەمی پ.ز. ن، هەروەها فۆرم و زمان و زاراوە تەکنیکی‌یەکانیش-بۆ نمونە بێرو *bēru* – کە زیاتر هی هەزارەی یەکەمن. بەلام لەگەل ئەمەشدا، مەحالَ نیە کە دەقەکە دەقێکی ڕەسەنی ئەکەدی کۆن (=Old Akkadian، واتە هەزاردی سێ یەمی پ.ز.، کە سارگۆنی ئەکەدی تێیدا ژیاوە ) بێت و لە هەزارەی یەکەمدا ڕونووس کرابێتەوە و تازەکرابێتەوە و وەرگێڕدرابێتە سەر زمانی ئەکەدی‌ی سەردەمی ئاشوری نوێ. واتە، هەندێک ناوی جوگرافی کە لەسەردەمی ئاشوری نوێدا ئیتر بەکار نەدەهاتن و لەجیاتی ئەوانە لەسەردەمی ڕونووس کردنەوەی دەقەکەدا ناوی تریان لێ نراوە، ناوە نوێ یەکان نووسراون بۆ خوێنەرانی سەردەمی ئاشوری نوێ. دوور نیە هەمان شتیان سەبارەت بە زاراوە تەکنیکی‌یەکان و فۆرم و ڕێکخستنی دەقەکەش نەکردبێت تاوەکو ڕوویەکی نوێ و هاوچەرخی بدەنێ. ئەمە بەلایەک، لەلایەکی تریشەوە دەشێت سارگۆنی ئاشوری فەرمانی نووسینی ئەم دەقەی وادابێت کەلەسەر شێواز و تەرزی دەقە کۆنەکان بێت، وەک بەشێکی پڕۆپاگەندە سیاسی‌یەکەی و ڕێبازی لاسایی کردنەوەکەی سارگۆنی ئەکەدی. لەم بارەیاندا ناتوانین مامەلەی ئەم دەقە وەک سەرچاوەیەکی هەزاردی سێ یەم بکەین، بەلکو وەک سەرچاوەیەکی سەردەمێکی دواتر کە ئاماژە بۆ ناوی جوگرافی کۆنتر دەکات بەبەکارهێنانی هەندێک زاراوەی کۆنەوە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دەقەکە وەک سەرچاوەیەکی مێژوویی دەبێت بەلاوە بنرێت- بۆ نمونە لە سالنامە شاهانە ئاشوری‌یەکان ناڕاستتر نیە ، کە تەواو پڕۆپاگەندەیین- بەلکو بەکارهێنانی دەبێت زۆر بە ووریایی و ڕەخنەگرانە بێت.

[45] Grayson, A. K., "The Empire of Sargon of Akkad," *AfO* XXV (1974-77), p. 59.

دێته پێش چاو.[٤٦] ئەگەر ڕیز کردنی ناوی وولاتەکانی نووسینەکەی *لوگالانیمونلدو*

[46] چیاکانی ئورز زۆر جار بە چیاکانی ئەمانوسی ئێستا لە لوبنان دەناسێندرێت لەبەر ئەوەی لە ڕۆژگاری ئێستادا ئورز لەوێ هەیە. ئەگەر ئەم شوێن دیاری کردنە بەهەند وەربگرین، ئەوا وولاتی سوبارتو هەر لە ئەنشانەوە (کە پایتەختەکەی لە 'تەللی مالیان'ە ) لە باشوری-ڕۆژئاوای ئێران تاوەکو کەناری دەریای ناوەڕاست لە لوبنان دەبێت کشابێت، واتە ڕووبەرێکی ئەوەندە فراوان کە گاد Gadd بە سەر سورمانەوەبپرسێت ئایا سوبارتو دەبێت لە ڕاستیدا ئەوەندە بەرفراوان بووبێت، فراوانتر لە وولاتی ئەکەد کە لە دەقەکەی سارگۆن خۆیدا بەگەورەترین وولات ناوزەد کراوە و لەپاشدا سوبارتو و عیلام پێکەوە دێن ؟:

Gadd, “The Dynasty of Agade and the Gutian Invasion,” *CAH* I, Part 2, Cambridge, 1971, p. 431.

بۆیە دەبێت بیر لە بوونی داری ئورز لە باکوری مێسۆپۆتامیاو سەرزەمینەکانی کوردستانی کۆنی ئەم سەردەمەی مەبەستماندا بکەینەوە، هەروەک سومەرۆلۆجیستی زانکۆی لایدن بەڕێز کریسپاین Krispijn بەزارەکی جەختی لەسەر کرد و ووتی کە وادیارە داری ئورز لە کاتی خۆیدا لە چیاکانی کوردستانیشدا هەبوون بەڵام هەر لە سەردەمانی زوودا کەوتوونەتە بەر شاڵاوی بەربڵاوی برین و ڕووتاندنەوە تاوەکو هەر ئەو کاتە لەم ناوچانەدا دوایی‌یان هاتووە بەبێ ئەوەی یادگاری‌یان لە سەرزاری خەڵک مابێتەوە. دەکرێت نووسراوەکەی سەر پەیکەرەکەی 'باستکی' کە لەم دواییانەدا لە ئەنتیکەخانەی عێراقی لە بەغدا بە تالانی برا، بکەینە پاڵپشتی ئەم ووتەیە، پەیکەرەکە لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی ڕابوردوودا لە سەر ڕێگای نێوان دهۆک و موسڵ لە نزیک گوندی باستکی دۆزرایەوە، لە نووسراوەکەی سەریدا 'نەرام-سین' شانازی بەسەرکەوتنێکی‌یەوە لە وولاتی سوبارتو دەکات، سەرکەوتنی بەسەر:

“LUGAL[ri] *šu-ut i*-RÍN-*nim*”

واتە: "پادشایانی (چیاکانی درەختی) ئورز(؟)،" بڕوانە:

رشید، د. فوزی، "دراسة اولية لتمثال باسطكي،" سومر ٣٢، الجزء ١ و٢ (١٩٧٦)، ص ٥٣ س. ١٨؛ ص ٥٧. بەڵگەیەکی تریش نامەکەی *ئور-دون* *Ur-dun* ە بۆ *'شولگی* *Šulgi*' ی پادشای ئور (بنەماڵەی سێ یەمی ئور) کە تیایدا دەڵێت پادشاکەی، کە شولگی‌یە، ناردبووی بۆ چیاکان بۆ کڕینی ڕۆنی ئورز، کەچی دارو دەستەکەی *ئەپیللاشا* *Apillaša*' ی فەرمانڕەوای سوبیر ڕووتیان کردووەتەوە. بۆ دەقی نامەکە بڕوانە:

‘Lugalanemundu’ ی پادشای ‘ئاداب Adab’ بەو بەدوای یەکدا هاتنەی کە پێی نووسراون، مەبەستێکی جوگرافی تیادا هەبێت، ئەوا بە پێی ئەو نووسینە وولاتی سوبارتو، لانی کەم لە سەردەمی نووسینی دەقەکەدا، بەو سەرزەمینە ووتراوە کە دەکەوتە باکوری گوتیوم و ڕۆژهەلاتی ئامورڕووەوە. هۆی ئەم پێشنیازە ناوهێنانی سوبارتووە لە نێوان گوتیوم و ‘مارخاشی Marḫaši’ لە لایەکەوە و ‘مارتو Martu’ و ‘سوتیوم Sutium’ لە لاکەی ترەوە.[٤٧] دەشێت سوبارتو لە سەردەمە زووەکاندا تەنها سەرزەمینێکی پچووک بووبێت لە کوردستانی ناوەڕاستدا، لەدواتردا فراوانتر بووبێت تاوەکو ئەو وولاتـــــەی

---

Michalowski, P., *The Royal Correspondence of Ur,* (A Dissertation presented to the Faculty of the Graduate School of Yale University), Yale, 1976, 217-18.

[47]یەکێک لەدیپاچە- مێژوو (=date-formula)، ئەمە یەکێک بووە لە شێوازەکانی مێژوو دیاری کردن و تۆمارکردنی ڕووداو کە زیاتر لەسەردەمانی ئەکەدی و بنەمالەی سێ یەمی ئور دا پەیڕەو دەکرا، بە ناونانی هەر ساڵێک لە ساڵەکانی فەرمانڕەوایی پادشایەک یان فەرمانڕەوایەک بە ناوی ڕووداوێکی گرنگ یان گەورە یان کارەسات ئامێزەوە، لەشێوەی: "ئەو ساڵەی ... داگیر/وێران کرا،" یان "ئەو ساڵەی شورای شار بنیات نرا" و بەو جۆرە) ەکانی نەرام-سین دەڵێت: "ئەو ساڵەی تیایدا نەرام-سین لە لەشکرکێشی‌یەکیدا دژی سوبیر لە ‘ئەزوخینوم Azuḫinum’ سەرکەوتوو بوو و ‘داخیش-ئەتال Daḫiš-Atal’ ی بەدیل گرت،" بڕوانە:

Foster, B., "An Agricultural Archive from Sargonic Akkad," *Acta Sumeriologica (ASJ)* 4 (1982), p. 23.

ئەمە مانای وایە کە ئەزوخینوم لە سوبارتو بووە، ئەزوخینومیش بە پێی هەندێک بەڵگە لە ڕۆژهەلاتی ئەڕڕاپخا و لەسەر ڕێگەی وولاتی لوللو بووە، بۆ ئەمە بڕوانە:

Frayne, *SCCNH* 10, p. 182.

هەر لە سەرچاوە ئاشوری‌یەکانیشدا هاتووە کە هەرێمی ‘ئەرزوخینوم Arzuḫinum’ ی ئاشوری، دەربەندی بابیتێ کە لە زنجیرەی بازیاندایە، لە وولاتی زاموا جیای دەکردەوە، بڕوانە:

Levine, *Op. Cit,* p. 19.

ئەمە وادەکات گردە بەرزو گەورەکەی چەمچەماڵ کە ساڵانێکی زوو لەوحێکی قوڕی نووسراوی تیادا دۆزرابووەوە، زۆر شیاو بێت کە ئەزوخینومی دێرین بێت.

نەخشەی ژمارە ٣: سوبارتوی بنە و سوبارتوی مەزن. لەم سەرچاوەیەوە بەدەستکاری‌یەوە:

Steinkeller, *The Historical background of Urkesh and the Hurrian Beginnings...*

گرتووەتەوە کە لەدواتردا ناونرا وولاتی ئاشور و، لە قۆناغی دواتریشدا پەلی کێشابێت بۆ سەروو خابور (لە باکوری سوریای ئێستا) لە رۆژئاواوە و بەرەو ناوەراستی چیاکانی زاگرۆس لە باشوری رۆژهەلاتەوە. پێشنیازێکی لەم جۆرە لەلایەن شتاینکێلەریشەوە خراوەتە روو، بە پێی شیکردنەوەی هەندێک بەلگەی نووسراو ئەوەی هەلهێنجاوە کە سوبارتویەکی پچووکتر لە هەزارەی سێ یەمی پ.ز. دا (٢٤٠٠پ.ز.) لە باکوری مێسۆپۆتامیا و کوردستاندا هەبووە کە وولاتی ئاشوریشی لەگەل دا بووە، پێی دەلێت 'سوبارتوی بنە Subartu Proper.' سوبارتویەکی تر، کە بۆ یەکەم جار لە ٢٢٠٠پ.ز. دا تۆمارکراوە، لە زاگرۆسەوە تا ئەمانوسی گرتووەتەوە و پێی دەلێت 'سوبارتوی مەزن Greater Subartu.'[48] لەوانەیە ئەم رووبەرە بەرفراوان و پەل کێشانە گەورەیە هۆی ئەوە بێت کە سوبارتو لە هەندێک دەقی کۆندا بە کۆ نووسراوە: 'وولاتانی سوبارتو'[49] هەروەک 'وولاتانی نایری' ی دەقەکانی سەردەمی ئاشوری ناوەراست.[50] لەهەمان کاتدا دەکرێت ئەمە ئاماژە بێت بۆ ئەوەی کە 'سوبارتو' وەسفێکی گشتی تر بووبێت بۆ کۆمەلێک وولاتی پچووک و سەرزەمینی تر کە ناوی تریان هەبووبێت و هەموویان پێکەوە بەم ناوە ناسرابێتن. بۆ نمونە لەسەر ئەمە دەکرێت هەرناوی ئەم ناوچانە خۆیان لە سەردەمانی ئیسلامیدا بهێنینەوە کە بە 'هەرێمی کوێستان (اقلیم الجبال) ' دەناسرا کە زۆر ناوچەو سەرزەمینی پچووکی تری دەگرتە خۆ[51] و لەهەمان کاتیشدا دیارە کە ئەم ناوە عەرەبی‌یە وەرگێرانی ناوە کوردی-ئێرانی‌یە کۆنەکەی

---

[48] Steinkeller, *Op. Cit.*, p. 77.

[49] "$u_4$ ma-da Za-ab-ša-li$^{ki}$ ù ma-da ma-da lú SU$^{ki}$-ka mu-ḫul-a,"

"ئەو کاتەی کە وولاتی زەبشالی و وولاتانی سوبیری وێران کرد،" بۆ ئەم دەقە بروانە:

Gelb, *HS*, p. 38.

[50] مەبەست لە وولاتانی نایری ناوچە شاخاوی‌یەکانی باشور و دەوروپشتی دەریاچەی وان بووە.

[51] بۆ لێکۆلینەوەو زانیاری زیاتر لەسەر ئەم 'هەرێمی چیا'یە لە چاخەکانی ناوەراستدا (سەردەمانی ئیسلامی) و سەرچاوە، بروانە:

Le Strange, G., *The Lands of the Eastern Caliphate*, Cambridge, 1930, Chapter XIII and XIV.

بووە، چونکە لە هەندێک سەرچاوەدا هەر 'کـــ/قوهستان' نووسراوە. لە سەردەمانی دواتردا، لە سەردەمی ئاشوری ناوەڕاست و نوێدا، سوبارتو وورده وورده پووکاوەتەوە و بووەتە سەرزەمینێکی پچووک لە کەژوکێوەکانی باکوردا، هەرچەندە ناوی سوبارتو لە ناو وولاتی ئاشور خۆیدا وەک تۆپۆنیم و ئێتنونیم (Ethnonym= واتە ناوی نەژادی)، هەر بەردەوام بووە. بەڵام ئەم بەکارهێنانە لەلایەن ئاشوری‌یەکانەوە تەنها لەدەقی وێژەیی[٥٢] و فالگریی ئەستێرەوانی بە بنەچە بابلیدا کە ئاشوری‌یەکان ڕونووسیان کردوونەتەوە، هاتووە. بەڵام کە بابلی‌یەکان بەکاریان دەهێنا بۆ ئاماژە بۆ ئاشوری‌یەکان، پێ دەچێت بۆ شکاندن و سوکایەتی پێ کردن بووبێت چونکە ناوی 'سوباری' زۆر لەو ووشە ئەکەدی‌یەوە نزیکە کە واتای "بەندە" دەگەیەنێت و لە وولاتی بابل و تەنانەت ئاشوریشدا بەکار دەهات.[٥٣]

**بنەچەو زمانیان:**

کەواتە، باوەڕ وایە کە دانیشتوانی وولاتی ئاشور پێش کۆچ هێنانی ئاشوری‌یە سامی‌یەکان سوباری‌بووبێتن[٥٤] و لە ژێر فشارو پاڵەپەستۆی ئاشوری‌یە تازە هاتووەکاندا

[52] Wilhelm, G., *The Hurrians*, Wiltshire, 1989, p. 7 (translated from German).
[53] Lewy, H., "Assyria, *c.*2600-1816 B. C.," *CAH* I, Part 2, Cambridge, 1971, p. 732-33.

وولاتی سوبارتو سەرچاوەیەکی سەرەکیی بەندە بوو بۆ باشوری مێسۆپۆتامیا و ئاماژە بۆ بەندەی سوباری لە سەرچاوە مێخی‌یەکاندا زۆرن. ئەمەش وابەستەیی لە نێوان هەردوو ناوەکەدا دروست کردووە. لەگەڵ ئەمەشدا، ووشەی "سوبروم *subrum*" کە لێڤی لەم سەرچاوەیەی سەرەوەدا مانای "بەندە" ی داوەتێ، وەک دەردەکەوێت بەهەڵە لەگەڵ ووشەی "*صوباروم* *ṣubarum*" کە مانای "بەندە، خزمەتکار(ی ناوماڵ)" دەبەخشـــێت، تێکـــەڵی کردبێت. ئەمـــەی دوایی‌یان ئێتیـــمۆلۆجـــی (Etymology) یەکی جیاوازی لەوی یەکەم هەیە. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ووشەی *ṣubarum* بڕوانە: *CAD,* vol. S, p. 341.

[54] شپایزەر لەم سەرچاوەیەیدا لە جیاتی سوباری بە 'خوری' دەیناسێنێت:

Speiser, E. A., *Mesopotamian Origins,* Philadelphia, 1930, p. 124-5,

پاڵیان پێوە نرابێت بۆ کوێستانەکانی باکور و ڕۆژهەڵات. سەرباری ئەمەش، تاماوەیەکی زۆر دوورو درێژی دواتریش سوبارییەکان هەر ژێرخانی نەژادیی (Substratum=) وولاتی ئاشور بوون. بۆیە ئەوبرە زۆرەی کاریگەری سوباری لە ژیانی ئاشورییەکاندا، بەتایبەتی لە هونەرو ئاییندا، دەبینرێت.[٥٥] تەنانەت ناوی پادشایانی بنیات نەری شاری ئاشور، 'ئوشپیا *Ušpia*' و 'کیکیا *Kikia*' بەڕای ئونگناد سوبارین.[٥٦] هەندێک سەرچاوەی سەردەمانی درەنگتر دەڵێن ئەو کاتەی شاری ئاشور پێی دەووترا '*بالتیل* *Baltil*'؛ بە وولات دەووترا سوبیر.[٥٧] هەندێک گردی شوێنەواریی گەورەی وەک تەل طایە (لە باکوری شاری ئاشور)، 'تەل لەیلان' (لەسەر خابوری سوریا) و 'تەل خوەیرە' بەڕای هەندێک چەقە ژیارییە سەرەکییەکانی سوبارییەکان بوون، کە لانی کەم هاوتای شاری ئاشور خۆی بوون.[٥٨]

ناسنامەی نەژادیی سوبارییەکان و پەیوەندییان بە خورییەکانەوە بە تایبەتی، بابەتی گفتوگۆ و توێژینەوەی زۆری نێوان ئەسیریۆلۆجیستەکان بوو.[٥٩] بەڵام گێلب توانی جیایییان لە خورییەکان و سەربەخۆییان وەک گروپێکی نەژادی بسەلمێنێت.[٦٠] هەندێک لایان وایە کە ناوی لەبنی سوبارییەکان 'سو Su' بووە.[٦١] بەڵام ئەم بۆچوونە

---

بەڵام وەک دەردەکەوێت خورییەکان لە بوونیاندا لە وولاتی ئاشوردا لە سوبارییەکان لەپاشتربوون. ئەم ڕایەی شپایزەر لەوانەیە لەوەوە هاتبێت کە ڕەمەی دانیشتوانی سوبارتو لەهەزارەی دووەمی پ.ز. دا بەزۆری خوری بوون.

[55] Lewy, *Op. Cit.*, p. 732-3.
[56] Gelb, *Op. Cit.*, p. 5.
[57] Lewy, *Op. Cit.*, p. 732.
[58] Kuhrt, E., *The Ancient Near East, c. 3000-330 B. C.*, Vol. I, London and New York, 1995, p. 41.

[59] سەبارەت بەمە بڕوانە:

Gelb, *Op. Cit.*, p. 1ff.
[60] *Op. Cit.*, p. 20 f.
[61] 'SU (A)': *Op. Cit.*, p. 25; Wilhelm, *The Hurrians*, p. 1.

زۆر گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوەی لەسەر کراوە و تەواو ساغ نەبووەتەوە ئایا 'سو'ش هەر سوباری‌یەکان بوون یان جیابوون. هەرچەندە ناوهێنانی *Su-bir₄*^ki و *Su-ti-u*^ki و .LÚ ⌜SU⌝ki بەدوای یەکدا لە یەک لیستی جوگرافیی بابلیی کۆندا زۆر بەلای ئەوەدا دەمانبات کە ئەم دوانە لەیەک جیا بن.[٦٢]

بەهۆی بەیەک گەیشتنی کۆنی سوباری‌یەکان لەگەڵ خەڵکانی باشور – سومەری‌یەکان و بابلی‌یەکان– کە لە هەندێک دەقدا ڕەنگی داوەتەوە، هەندێک شتی کەم لەبارەی سوباری‌یەکانەوەمان بۆ پارێزراوە. بۆ نمونە یەکێک لەمانە لەوانەیە تائێستا کۆنترین ناوی تۆمارکراوی زانراوی کەسانی سوباری بێت کە لە لەوحەکانی گردی 'فارە'[٦٣] دا هاتوون کە زۆربەیان پیشەگەر بوون، وەک نانەوا، کانزاساز، نووسەر و

---

د.فوزی رشید ناوی 'سوبارتو SUBARTU' ی وا شی کردووەتەوە کە پێکهاتووە لە:

'SU'+ BAR (=دەرەوە) +TU (ئامرازی ئاماژە بۆ ئاقار)

بەمانای "گەلی سو (کە) لەدەردوە/ لە کەنارەوە (دەژین):" رشید، د. فوزی و ج. ر. احمد، *تاریخ الکرد القدیم*، اربیل، ۱۹۹۰، ص.٤٢. ئەم ڕایە هەر لە مەودای بۆچووندا دەمێنێتەوە و جێگای پشت پێ بەستن نیە، چونکە TU ی ناوەکە دەکرێت مێینە (Feminine)ی 'سوبا/یر *Suba/ir*' بێت بەزمانی ئەکەدی. بەکارهێنانی شێوە کورتەکەی ئەم ناوە کە 'سو SU'ە دەکرێت لەگەڵ شێوە کورتەکەی 'گوتیوم Gutium' دا لێک بچوێنرێن کە GU یان GU^ki ە کە لە لیستی ناوی خواوەندان و دەقی ئایینی دا دێن. سەبارەت بە شێوەکانی ڕێنووسی ناوی گوتیـ(ـــوم)، بڕوانە:

Hallo, W.W., "Gutium," *RlA* Band 3, Berlin, 1957, p. 709.

بەڵام دەبێت لەگەڵ پێشنیازەکەی شتاینکێلەردا بە وورياییەوە مامەڵە بکەین کە دەڵێت مەبەست لە تۆپۆنیمی (LÚ. SU (.A وڵاتی 'شیماشکی *Šimaški*' بووە نەک سوبارتو:

Steinkeller, P., "On the Identity of the Toponym LÚ. SU (.A)," *Journal of the American Oriental Society (JAOS)*, 108, No. 2 (1988), pp. 197-202.

[62]ئەم دەقە لە .*MSL* 11, p. 60 lines 22-24 دا هاتووە، بڕوانە:

Steinkeller, *JAOS* 108, p. 198.

[63]ئەم دەقانە لەلایەن دایمل Deimel و یێستن Jestin دوە بلاوکراونەتەوە، بۆ سەرچاوەکانی بڕوانە:

Gelb, *Op. Cit.*, p. 31, note 61.

هی تر.[٦٤] هەندێک بەرو بوومیش هەبوون کە وادیارە بە سوباری ناسرابوون، وەک گەنم، هەنجیر، هەنار، قۆخ، خوریی سوباری، جۆرێک بەرگی ناسراو بە سوباری و عەرەبانەی سوباری.[٦٥] ئەوەی گرنگی‌یەکی تایبەتیی هەیە، هەندێک دوعاو نوشتەی سەردەمی بابلیی کۆنە کە بە زمانی 'سوباری' لە دەقێکی بابلیی کۆندا نوسراون (YBC 1836)،[٦٦] لە ڕێکەوتننامەیەکی سەردەمی ئاشوری کۆنیشدا سوێند بە خواوەندەکانی سوبارتو خوراوە.[٦٧]

### خەمازی:

کە باسی سوبارتو و سوباری‌یەکان دەکەین ئیتر ناتوانین خۆمان لە باسی خەمازی لابدەین. خەمازی شارێکی زۆر گرنگ بووە و باوەڕ وایە کە پایتەختی سوبارتوی بنە بووبێت،[٦٨] هەروەها خەمازی ناوی شانشینێکی کۆنیش بووە کە ڕۆڵێکی گەورەی لە سیاسەتی سەردەمی سەرهەڵدانی بنەماڵەکاندا بینیوە و بەردەوام ناوی لە تۆمارەکانی بنەماڵەکانی باشوردا هاتووە هەتا دەگاتە سەردەمی ئیسن-لارسا Isin-Larsa. هەندێک جار ناوی بە سەرزەمینێکی داگیرکراو هاتووە،[٦٩] هەندێک جاریش بە نیشانی لەشکرکێشی‌یەکانی دەوڵەتەکانی باشور و هەندێک جاری تریش بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ

---

[64] Gelb, *Op. Cit.*, p. 31.
[65] *Op. Cit.*, p. 26; 29, note 43.
[66] van Dijk, J., "Fremdsprachige Beschwörungstexte in der südmesopotamischen literarischen Überlieferung," *Mesopotamien und seine Nachbarn,* XXV Rencontre Assyriologique Internationale-Berlin, 1978, Berlin, 1982, p. 102.
[67] Eidem, J., "An Old Assyrian Treaty from Tell Leilan," *Marchands, Diplomates et Empereures: Études sur la Civilization Mésopotamiennes-Offertes à Paul Garelli,* Paris, 1991, Col. I, l. 20.
[68] Steinkeller, *Op. Cit.*, p. 79-80; 84.
[69] بۆ نمونە وەک: "ئەرەد-نەننا Arad-Nanna، ئێنسیی *ensi* ی خەمازی Ḫamazi و کارخار Karḫar"، بڕوانە:

Edzard, D. O., "Ḫamazi," *RlA,* Band 4, Berlin, (1972-75), p. 70.

کە شار-دەوڵەتی 'کیش Kiš' و لەوانەشە بەرەو خوارتر لە باشوری مێسۆپۆتامیای داگیر کردووە و بۆ ماوەیەک فەرمانڕەوایی کردووە.

شوێن:

تائێستا شوێنی خەمازی بە ووردی دیاری نەکراوە. بەڵام لە بەڵگەکانی سەرچاوە نووسراوەکانەوە هەڵدەهێنجرێت کە لە شوێنێکی کوردستانی ناوەڕاستدا بووە، زۆر لە 'گاسور' (نوزیی پاشتر) ەوە دوور نەبووە.[٧٠] هەندێکی تر زۆر زیاد بەلای ڕۆژهەڵاتەوە، بۆ کوێستانەکانی باکور و باکوری ڕۆژئاوای ئێرانی دەبەن.[٧١] شتاینکێلەر باوەڕی وایە

---

[70] Bonechi, M., I nomi geografici dei testi di Ebla, *Répertoire Géographique des textes Cunéiformes (RGTC)*, and 12/1, Wiesbaden, 1993, p 174; Vallat, F., Les nomes géographiques des sources souso-élamites, *RGTC*, Band 11, Wiesbaden 1993, p. 76; Edzard, "Ḫamazi," *Op. Cit.*, p. 70.

[71] Pettinato, G., *Ebla, A New Look at History*, (Translated from Italian), London, 1991, p. 62,

هەروەها نەخشەکانی لاپەڕەکانی ٤ و ٦٣ و هی تر؛

Pettinato, G., *The Archives of Ebla, An Empire Inscribed on Clay*, New York, 1981, p. 6; 96 and *passim.*

بەڵام بەلای منەوە زۆر نەشیاوە کە ئەو خەمازی‌یەی لە جیهانی مێسۆپۆتامیاوە نزیک بووە و لە جەنگەکانی و لەگەمە سیاسی‌یەکانیدا بەشداری کردووە و ناوی بنەماڵە فەرمانڕەواکەی لە لیستی پادشا سومەری‌یەکاندا هاتووە، ئەوەندە دوور بووبێت لە مێسۆپۆتامیاوە کە بگاتە ئەوپەڕی باکوری ڕۆژئاوای ئێران. ئاستۆر Astour یش شتێکی لەم بابەتەی گوتووە:

Astour, M. C., "Semites and Hurrians in Northern Transtigris," *SCCNH* Vol. 2, Eisenbrauns, 1987, p. 8.

ئەم باوەڕی وایە کە ئەو خەمازی‌یەی لە نامە دیپلۆماسی‌یەکەی شانشینی 'ئێبلا Ebla' دا باسکراوە، خەمازی‌یەکی تر بووە لە باکوری مێسۆپۆتامیا، نەک ئەوەکەی "ئەوبەری دیجلە" (واتە کوردستانی ناوەڕاست) بەڵام بەبێ ئەوەی هیچ هۆیەکی ڕوون بدا بۆ ئەم باوەڕەی:

Astour, M., "Reconstruction of the History of Ebla (part 2)," *Eblaitica: Essays on the Ebla Archives and Eblaite Language*, Vol. 4, Edited by C. H. Gordon and G. A. Rendsburg, Indiana, 2002, 129-130, note 477.

که خەمازی لەسەردەمانی دواتردا، لە دەورو بەری هەزارەی دووەمی پ.ز. دا  کە ئیتر ناوی لەناو ناواندا نامێنێت و لەسەرچاوە نووسراوەکاندا باسی نامێنێت، هی ئەوە نەبووە کە چۆڵ کراوە و خاپوور بووە، بەڵکو ناوێکی تری وەرگرتووە و ئیتر بەو ناوە نوێ یەیەوە باسکراوە. بەلای ئەوەوە لەپێشترینی ئەوناوانەی دەشێن ناوی نوێی خەمازی بووبێتن ئێکەلاتوم *Ekallātum* یان 'قاب(ـــا)را *Qab(a)rā*' ن.[72] ئەگەر ئەمە وابێت، ئەوا دەبێت لە ڕۆژئاواوەتر بۆ خەمازی بگەڕێین، بە پێچەوانەی پێشنیازەکانی ترەوە و پێچەوانەی پێشنیازەکەی پێشووی شتاینکێلەر خۆیشی‌یەوەیە کە لە تەنیشت 'عیلام'ەوەی دانابوو.[73] هەرچەندە نارەحەتیشە لە ڕۆژگاری ئێستادا بسەلمێنرێت؛ بەڵام خەمازی زۆر پێ دەچێت شارێکی کوێستانی بووبێت نەک دەشتەکی. هەندێک ئاماژەی ناو لیستە جوگرافی‌یەکانی ئەو کاتە کە خەمازی لە نێوان هەندێک ناوی جوگرافی تردا کە بە کوێستانی ناسراون، دادەنێن و لەگەڵیاندا ڕیزی دەکەن، دەکرێت بە ئاماژە بۆ ئەم ڕاستی‌یە وەربگیرێن. بۆ نمونە: "لەنێوان .... و گوتیوم دا؛" "لەنێوان تولوم *Tu-lu-um$^{ki}$* و کارگودوا *Kar-gú-du$_8$-a$^{ki}$*دا؛" و "لەنێوان مارخاشی *Marḫaši* و عیلام دا."[74] هەندێک لە نامەکانی سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئور وا باسی خەمازی دەکەن کە سنوری ئەوپەڕی باکوری ئیمپراتۆری ئور بووە، هەروەک چۆن 'ماگان *Magān*'

---

[72] Steinkeller, *Op. Cit.*, p. 85.

لە ڕاستیدا بۆ ئێکەلاتوم دەشێت لە گردی 'هەیکەل' بگەڕێین کە لەسەر دیجلەیە لە باکوری شاری ئاشور، قابراش بەگشتی لە نێوان هەردوو زێ دا بووە، لەوانەیە نزیکتر لە زێی خواروو بووبێت. سەبارەت بەم شوێن دیاری کردنانە، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەروەها:

Frayne, *SCCNH* 10, p. 165-6.

پێ دەچێت کە ئەو ناوی شارەی لە دەقەکانی 'مدینة هابو Medinet Habu' ی میسردا بە شێوەی Ka-bu-rə نووسراوە مەبەست لێی هەر هەمان شاری قابرای خۆمان بێت، بۆ ئەمە بڕوانە:

Astour, M., "Mesopotamian and Transtigridian Place Names in the Medinet Habu Lists," *JAOS* 88 (1968), p. 744.

[73] Steinkeller, *Op. Cit.*, p. 83.

[74] Edzard, *RlA*, p. 70.

سنوری ئەوپەڕی باشوری بووە،[٧٥] ئەمەش ئاماژەیەکی تری ڕوون و ئاشکرای بوونی خەمازییە لە باکور. بەڵام ئەوەی زۆر جێگای سەرنجە، بوونی گوندێکی گەورەیە بەقەدی باکوری ڕۆژئاوای شاخی ئەزمەڕەوە لەدووری چەند کیلۆمەترێک لەباکوری سلێمانییەوە کە ناوی 'خەمزە'یە؛ ئەم ناوەش ئەوەندەی بزانین مانایەکی لە زمانی کوردیدا، کە زمانی ئاخاوتنی ناوچەکەیە، نیە. هەرچەندە گوندەکە لەشوێنێکی سەختی شاخەکەدایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بوونی ئەم گوندە بەم ناوەوە و لەم شوێنەدا دەشێت ئاماژە بێت بۆ بوونی خەمازیی کۆن لەم شوێنە یان نزیکی ئەم شوێنە.[٧٦] ئەمەش نزیکە بەو شوێنەی کە جاکۆبسن Jacobsen پێشنیازی کردووە کە بەڕای ئەویش دەبێت لەشوێنێکی نزیک سلێمانی ئێستا بووبێت.[٧٧] لەمانەش گرنگترو سەرنج ڕاکێشتر ئەوەیە کە لەو شێوە جیاوازانەی لە سەرچاوە مێخییەکاندا ناوی خەمـــازییان پێ نووســـراوە *Ḫa-àm-zi*^ki^ و *"Ḫe"-mi-zi*^ki^،ن[٧٨] کە زۆر زیاتر لەناوە هاوچەرخەکەی نزیکی دەخەنەوە، بەتایبەتی شێوەی یەکەمیان.

**بنەچە و زمانی:**

جگە لە هەندێک ناوی کەسی نەبێت، شتێکی وا لەبارەی زمانی خەمازییەکانەوە

---

[75] بۆ نمونەی هەندێک لە دەقی ئەم ئامانە بڕوانە:

Michalowski, P., *Op. Cit.*, p.254; 264 (line 10); McEwan, G., "Notes Brèves," *RA* 75 (1981), p. 191.

سەرچاوەیەکی لەمانەش نوێتر کە لەم نمونانەی تێدایە:

W. H. Ph., Römer, "Brieven van en aan Ibbisuen van Ur," *Zij Schreven Geschiedenis*, Leuven, 2003, p. 35.

[76] دەبێت تێبینی بکەین کە یەکەم کەسێک ئاماژەی بۆ ئەم لەیەک چوونەی نێوان ئەم دوو ناوە کردبێت د. فوزی رشید بوو لە بابەتێکیدا لە بەشی عەرەبیی یەکێک لە ژمارەکانی گۆڤاری کارواندا لە ناوەڕاستی ساڵانی هەشتادا کە بەداخەوە ئێستا دەستم پێیدا ناگات تا ژمارەکەی و لاپەڕەکەی بنووسم.

[77] Jacobsen, Th., *The Sumerian King List (SKL)*, Chicago, 1939, p. 98 note 166.

[78] Edzard, D. O. and G. Farber, *RGTC*, Band 2, Wiesbaden, 1974, p. 72.

نازانین، هەندێک لەم ناوە کەسیيانەش سومەرین، وەک *ئور-ئیشکور Ur-Iškur*، فەرمانڕەوای خەمازی لەسەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئوردا،[٧٩] و هەندێکی تر ئەکەدین، وەک *شو-ئیشتار Šu-Ištar*.[٨٠] کاتێک کە کاریگەری گەورەی سومەری و بەتایبەتی ئەکەدی لەکوردستانی کۆن و تەنانەت لە ئێرانیشدا لەسەردەمانێکی زۆر زووەوە لەبەرچاو دەگرین، ئیتر ڕاستیيەکی سەرسوڕهێنەر نابێت ئەگەر ئەم کەسانە خۆیان خەڵکی خەمازی بووبێتن و ناوی سومەری و ئەکەدیيان هەبووبێت. ئەو کەسانەی تر کە دەمێننەوە و بە خەڵکی خەمازی ناسێندراون، ناوەکانیان زۆر لە ناوەکانی ئەو زمانە دەچن کە گێلب Gelb پێی دەڵێت "The Banana Language" (=واتە زمانی مۆز، مەبەستی لەمەش ئەوەیە کە زۆربەی ناوەکانی بریتین لە بڕگەیەک پاشان دوو بڕگەی لەیەک چوو وەک ووشەی "بانانا" ی ئینگلیزی، یان تەنها دوو بڕگەی لەیەک چوو) وەک *زیزی Zizi*' پادشای خەمازی خۆی، یان کەسێکی تری *ئیتیتی Ititi*' ناو.[٨١] داستانی سومەریی "*ئینمێرکار* و سەرداری *ئاراتا*" ئاماژەیەکی بۆ ئەو زمانە تێدایە کە لە خەمازی قسەی پێ کراوە، بەڵام بەجۆرێکی وا کە تێگەیشتن و ڕاڤە کردنی ئاسان نەبێت و ئەمەش بووەتە هۆی چەند وەرگێڕانێکی لەیەک جیاوازی ڕستەکە لەلایەن ئەسیریۆلۆجیستەکانەوە. دەقە سومەرییەکە دەڵێت: "-u₄-ba kur Šubur[ki Ḫa]-ma-zi[ki] eme-ḫa-mun ki "en-gi" کە بە :"شوبور، خەمازی، (گەلانێک) کە زمانەکانینان پێچەوانەی یەکن،" وەرگێڕدراوە،[٨٢] لەکاتێکدا بەڕای جاکۆبسن "وولاتی سومەری جووت زمان"

---

[79]Langdon, S. H., "Tablets from the Archives of Drehem," Paris, 1911, No. 53; Hallo, W. W., "A Sumerian Amphictyony," *JCS* 14 (1960), 109: 9,5.

[80] Edzard, *RlA*, p. 70; 71.

لەحاڵەتی ناوی فەرمانڕەواکاندا، بەڕای ئێمە مەرج نیە ئەمانە خۆیان خەڵکی خەمازی بووبێتن، بەڵکو دەکرێت بێگانە بووبێتن و لەلایەن پادشایانی ئورەوە دامەزرێندرابن.

[81]بۆ ئەم ناوەی دوایی بڕوانە:

Edzard, D. O., G. Farber and E. Sollberger, *RGTC*, Band 1, Wiesbaden, 1977, p. 69.

[82]بڕوانە ووشەی '*mitḫurti*' و نمونەی دەقەکانی لە:

وەرگێڕانی دروستی:

"eme-ḫa-mun ki-en-gi"ە.[٨٣] بەلاّم لەحالێکدا دەقەکە بەم شێوەیە وەربگێڕدرێت: "لەو کاتەدا، سوبارتو و خەمازی (بە) زمانێکی جیاواز لە سومەر (قسەیان دەکرد)،" ئەوا دەشێت بلێین زمانی سوباری کە زۆر کەمی لەبارەوە دەزانین، لە خەمازیش قسەی پێ دەکرا. ئەگینا، بە وەرگێڕانەکەی جاکۆبسن بێت، ناوهێنانی سومەری جووت زمان(سومەری و ئەکەدی) لەپاڵ شوبور و خەمازی دا جیاکردنەوەیەک دەکات لە نێوان زمانی سوباتو و زمانی خەمازی دا. ئەمەش پرسیاری زیاتر سەبارەت بە زمانی خەمازی قوت دەکاتەوە: ئایا زمانێک یان دیالێکتێک بووە کە خزمایەتی لەگەڵ زمانەکانی گوتی و لولوبی‌دا هەبووە؟ یان زمانێکی تەواو سەربەخۆ بووە؟ هەرچەندە ئەمەیان کەمتر شیاوە. لەڕۆژگاری ئەمرۆدا ناتوانین وەلاّمی ئەم پرسیارانە بدەینەوە.

باس و خواسی جادوگەرێکی خەمازی کە لە دەقی سومەری"ئێنمێرکارو ئێنسوخکێشدانا *Enmerkar and Ensuḫkešdana*"[٨٤] دا هاتووە، شایانی گرنگی پێ دانە. بەپێی ئەم دەقە، جادوگەرەکەی خەمازی پاش خاپور کردنی خەمازی بۆ ئەڕاتتا باری کردووە و سەردارە نوێ یەکەی، واتە سەرداری ئاراتتا لە دژی ئێنمێرکار کاری پێ کردووە. دەقەکە دەلێت:

---

*The Chicago Assyrian Dictionary (CAD),* Vol. M II, p. 137.

بۆ دەقە سومەرییەکەو وەرگێڕانەکەی، بڕوانە:

Cohen, S., *Enmerkar and the Lord of Aratta* (A Ph. D. Dissertation presented to the University of Pennsylvania), Pennsylvania, 1973.

[83]Jacobsen, Th., *The Harps that once....*, p. 289.

هەروەها بڕوانە:

Edzard, D. O., *Die »Zweite Zwischenzeit« Babyloniens (ZZB),* Wiesbaden, 1957, p. 31 and note 130.

[84]دەقەکە لەلایەن ا. بێرلین A. Berlin دوە بلاوکراوەتەوە. بۆ بیبلیۆگرافیا بڕوانە:

Steinkeller, p. 82, note 29.

"جادوگەرەکە کە کارامەیی‌یەکەی هی خەمازەیی‌یەک بوو، ئورگیرنونا Urgirnuna، کە کارامەیی‌یەکەی هی خەمازەیی‌یەک بوو؛ پاش ئەوەی خەمازی خاپوور کرا، بۆ ئەراتتا باری کرد."[85]

## گاسور و هاووڵاتی‌یانی:

باس کردنی ناوەکانی سەر بەزمانی مۆز/بانانا، بەرەو شاری گاسور، شارە کۆنەکەی ژێر وێرانەو کەلاوەکانی شاری نوزی پەل کێشمان دەکات. گاسور، پێشینەی کرۆنۆلۆجیانەی، نەک فەرهەنگیانەی نوزی، لە مێژوویدا پێش نوزی‌یە، بەڵام جیاوازی نێوانیان لە ڕووی فەرهەنگ و نەژادەوە تەواو دیارو بەرچاوە.[86]

چینەکانی ژێر ئاستی چینەکانی نیشتەجێ بوونی نوزی، شوێنەواری نیشتەجێ بوون و بینایان تێدا دۆزراوەتەوە کە مێژوویان بۆ هەزارەی سێ یەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە. لەمەش گرنگتر، کۆمەڵێک لەوحی قوڕ (نزیکەی ٥٠٠ دانە) ی تیادا دۆزراوەتەوە کە بە ئەستورایی چینێکی نیشتەجێ بوونی ١,٢٧م. دا بڵاو بوو بوونەوە، بەڵام هەموو کۆمەڵەکە یەک گرووپی پێکەوە گرێ دراو پێک دەهێنن.[87] بەشی زۆری لەوحەکان دەقی ئابوورین کە ناوی کەسیی زۆر گرنگیان تێدایە، لەبەر ئەوە وێنەیەکی پێکهاتەی

---

[85] Steinkeller, *Op. Cit.*, p. 83.
[86] Meek, T. J., *Excavations at Nuzi*, Vol. III: "Old Akkadian, Sumerian and Cappadocian Texts from Nuzi," Harvard, 1935, p. ix.

پەرستگایەک کە بۆ خواوەند ئیشتار تەرخان بووە لە گاسور هەبووە کە سەردەمەکەی بۆ سەردەمێکی کۆنتر لە ئەکەدی دەگەڕێتەوە، واتە بۆ سەردەمی سەرهەڵدانی بنەماڵەکان، بۆ ئەمە بڕوانە:

Lloyd, S., *The Archaeology of Mesopotamia from the Old Stone Age to the Persian Conquest*, London, 1978, p. 147.

[87] Meek, *Op. Cit.*, p. viii.

بۆ وەسفی لەوحەکان، درێژی و پانی و شێوەیان و جۆری خەت و زمانیان، بڕوانە:

*Op. Cit.*, pp. viii-ix.

دیمۆگرافیی ئەو کاتەی شارەکەمان پیشان دەدات لەگەڵ پەیوەندی‌یەکانی لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا. زۆربەی ناوە کەسی‌یەکان سامین، هەندێکیان سومەری و بەشێکی کەمیش نە سامی نە سومەرین. ئەم زۆرینە سامی‌یە لە گاسور وای لە میک کردووە پێشنیاز بکات کە دانیشتوانی گاسور بە پلەی یەکەم سامی بووبێتن، تەنانەت کاریگەری‌یەکی لاوازی سامیی ڕۆژئاواییش لە شارەکەدا تێبینی کراوە.[88] بە گوێرەی پێشنیازەکەی ئەو ئەکەدی‌یەکان لە سەردەمی ئەکەدی‌دا باڵی زۆرایەتی‌یان بەسەر دانیشتوانە سومەری‌یەکەی شارەکەدا کێشاوە.[89] بەڵام خۆی لەڕاستیدا پێ ناچێت سومەری‌یەکان گروپێکی نەژادیی سەردەستی گاسور بووبێتن، چونکە دەزانین پەل کێشانی نەژادی‌یان تا ئەوەندە دوور لە چەقیانەوە نەگەیشتووە. لەجیاتی ئەمە، پێشنیازی ئێمە ئەوەیە کە ناوچەکە دانیشتوانێکی بوومی خۆی هەبووە، کە لەژێر کاریگەری‌یەکی فەرهەنگی و زمانەوانیی سومەریدا بووە، ئەم کاریگەری‌یەش زیاتر لە ناوە کەسی‌یەکاندا ڕەنگی داوەتەوە. لەزۆر سەردەم و زۆر ناوچەی تری مێسۆپۆتامیادا کەسانی زۆر ناوە کەسی‌یەکانیان ناوێکی بێگانە بووە. کاریگەری سومەری لەم جۆرەش هەر لێرە نەبووە، بەڵکو لە هەموو مێسۆپۆتامیاو بەشی گەورە گەورەی سوریای ئێستاشدا هەبووە.

بگەڕێینەوە بۆ ناوە کەسی‌یەکانی زمانی مۆز لە گاسور؛ میک تێبینی کردووە کە پێنج یەکی کۆی ناوەکانیان لەم جۆرە بووە، واتە وەک ئەوناوانەی لە تۆمارەکانی سومەردا هاتوون و بە سوباری پێمان ناسێنراون[90] و وەک ئەو ناوانەی خەمازین کە ئاماژەمان بۆ کردن. هەندێک نمونە لە ناوەکانی گاسور ئەمانەن: ئەبابا *Ababa*، ئەبوبو *Abubu*، ئەخاخا *Aḫaḫa*، ئەخوخو *Aḫuḫu*، بێلیلی *Belili*، ئیتیتی *Ititi*، و هی تر.

---

[88] Meek, *Op. Cit.*, p. xiv.
[89] *Op. Cit.*, p. xiii.

[90] بۆ هەندێک نمونە لەم ناوانە بڕوانە:

Gelb, *HS*, p. 20; 40.

جێگای سەرنجە کە کونترین فەرمانڕەوای ئاشور ناوی *ئیتیتی*' کوڕی *'یاکولابا*' بووە.[٩١] ئەم ئیتیتیەی ئاشور نووسینێکی جێ هێشتووە تیایدا دەڵێت کە شتێکی لە تالانیی گاسور پێشکەش بە خواوەند *'نینین*' کردووە.[٩٢] ناوی بڕگە دووبارە لە گاسور تەنها بە ناوی کەسیەوە نەوەستاوە، بەڵکو زۆر ناوی خواوەندیش لەم جۆرەن، وەک: '*Dada دادا*'، '*Dudu دودو*'، '*Mama ماما*'، '*Mumu مومو*'، '*Kuku کوکو*'، '*Nana نانا*'، '*Zuzu زوزو*'، '*Bubu بوبو*'، و '*Baba بابا*' و هی تر کە بوونەتە هۆی دروست بوونی زۆر ناوی کەسیی بڕگە دووبارە بەوەی کە چوونەتە پێکهاتەی زۆر لەم ناوانەوە.[٩٣] میک تێبینی کردووە کە ئەم جۆرە ناوانە لە ناوچە کوێستانیەکانی باکور و باکوری ڕۆژهەڵات (واتە کوردستان) و تەنانەت عیلامیش دا بلاو بوون و لە بەڵگەنامەکانی *'کەپەدۆکیا*'شدا هاتوون، بەڵام لەپاش سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئورەوە ئیتر بەرەو نەمان ڕۆیشتوون،[٩٤] ئەمەش پاڵپشتییەکی ئەوبڕوایەمانە کە ئەم ناوانە سوباری بوون و

---

[91] Speiser, *Mesopotamian Origins*, p. 109.

[92] Grayson, *RIMA- Vol 1:* Assyrian Rulers of the Third and Second Millennium BC (to 1115 BC), Toronto, 1987, A.0.1001, No. 1, p. 7.

جێگای سەرنج دانە کە تەنها دووجار ناوی گاسور لە دەقی تری دەردەوەی گاسور خۆیدا هاتووە، یەکێکیان ئەم نووسینە شاهانەیەی ئیتیتیە و ئەوی تریشیان لە دەقێکی تردا کە لە لایەن میکەوە لەم ژمارەیەی *RA* دا بلاو کراوەتەوە:

Meek, T. J., "Note on the Early Texts from Nuzi," *RA* 34 (1937), p. 65.

[93] Meek, *Op. Cit.*, p. xiii.

مەبەست لەم خاڵە ئەوەیە کە هەندێک ناوی کەسی لە ووشەیەکی واتاداری کورت یان درێژ لەگەڵ ناوی خواوەندێکدا پێک دێت، بۆنمونە ناوی ئەکەدیی *warad-Sîn* کە واتای "بەندەی (خواوەند) سین" دەبەخشێت. نمونەی هاوچەرخی ئێستاش 'عبد الله' و 'عبد الرحمن' و 'جار الله' و زۆری ترن. بەم بەشەی ناوی کەسی کە ناوی خواوەندێک یان نازناوێکی خواوەندیکە دەووترێت Theophoric part.

[94] *Ibid.*

زمانی هەڵگرانی ئەم ناوانەش زمانی سوباری بووە.[٩٥]

## گوتی‌یەکان:

### ناوو ناوهاتنیان:

تا ئێستا کۆنترین سەرچاوەی زانراو کە ناوی گوتی‌یەکانی تۆمار کردبێت نووسینێکی *لوگالانێموندو* ‘*Lugalanemundu*’ ی پادشای *ئاداب* ‘*Adab*’ ی سەردەمی سەرهەڵدانی بنەماڵەکانە کە بە ڕوونوسێکی سەردەمی بابلیی کۆن بە دەستمان

---

[95] جێی سەرنجە کە ناوی لەم جۆرە لە باشوری مێسۆپۆتامیاشدا بەژمارەی کەم کەم هەبووە، وەک ناوی خواوەند بابا لە*لەگەش* *Lagaš* و *زەبابا* *Zababa* و *زازاری* *Zazari* (بۆ ئەم ناوانە بڕوانە:
Barton, G. A., *The Royal Inscriptions of Sumer and Akkad-RISA*, London, 1929, p. 76)
لەوانەیە *نانا*‘*Nanâ*’ش (*RISA*, p. 330) و ناوە کەسی‌یەکانی وەک *دادا* ‘*Dada*’ ئێنسی *ensi* (=میری شار، دەوڵەتە-شار)ی *نیپپور* ‘*Nippur*’ و *دادا*‘ یەکی تریش کە ئێنسیی *شوروپاک* ‘*Šurupak*’ بووە (*RISA*, pp. 10; 368)، *ئیلولو* ‘*Elulu*’ یەکێک لە پادشایانی ئەکەد بووە ( *SKL*, p. 114) و *ئیلولو*‘ یەکی تری پادشای ئور (*SKL*,p. 94)، *ئیگیگی* ‘*Igigi*’ پادشای ئەکەد ( *SKL*, p. 112)، *دودو* ‘*Dudu*’ ی باوکی *شود/تورول*‘ ی پادشای ئەکەد (*SKL*, p. 114)، *ئور-ماما*‘ *Ur-Mama*’ (=ناوەکەی واتای "بەندەی ماما" یە) کە یەکێک بووە لە ئێنسی‌یەکانی لەگەش ( *RISA*, p. 172)، *بالولو*‘ *Balulu*’ پادشای ئور (*SKL*, p. 94)، *پوزوزو*‘ *Puzuzu*’، باوکی *ئوخوب* ‘*Uḫub*’ ی میری *کیش*‘ *Kiš*’ ( Sollberger, E. and J.-R. Kupper, *Inscriptions Royales Sumeriennes et Akkadiennes-IRSA*, Paris, 1971, IA2a) و هی تریش. ڕەنگە لەمانەش گرنگتر ناوەکەی پاسەوانی دارستانی ئورز بێت کە لە داستانەکەی گیلگامێش دا هاتووە و بە *خومبابا*‘ *Ḫumbaba*’ یان *خو واوا*‘ *Ḫuwawa*’ نووسراوە، ئەمیش ناوێکی برگە دووبارەی نموونەیی (سوباری؟)یە. لە بیریشمان نەچێتەوە کە باوەڕ وایە دارستان و بێشەڵانی ئورز، بەلایەنی کەمەوە لەم کاتەدا، لە کوێستانەکانی باکوری ڕۆژهەڵاتی مێسۆپۆتامیادا (کوردستان) هەبوبێت، بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٤٦ ی ئەم بەشە.

گەیشتووە.[٩٦] ناوی 'گوتی' بە زۆر شێوە و بە بەکارهێنانی لۆگۆگرامی لەیەک جیاواز لەسەرچاوە کۆنەکاندا نووسراوە. بەتایبەتی یەکەم بڕگەی ناوەکە کە دەشێت بە شێوەی جیاوازی وەک *Gu-, Ku-, Qu-* بخوێنرێتەوە. لە هەندێک نووسراودا دەنگێکی *-b-* خراوەتە ناوەکەوە و کردوویەتی بە *گوتبیوم Gu-te-bu-um*' ئەم (*b*)یە لەوانەیە وابەستەیی‌یەکی لەگەڵ پاشگری کۆی عیلامی (*-p*)دا هەبووبێت. هەروەک چۆن لەناوی نەژادیی لوللوبی‌یەکانیشدا بە شێوەی *لوللوبی Lullubi*' دەیبینینەوە. شێوەی *قوتی Quti*' لە لەوحەکانی شمشارە[٩٧] و سەرچاوەکانی سەردەمی ئاشوری ناوەڕاست و ئاشوری نوێدا دێت. شێوەی *گوتیوم Gutium*' لە هەندێک سەرچاوەی بابلی ناوەڕاست دا بە لۆگۆگرامەکانی GÚ. DU₈. A^ki نووسراوە کە لەهەمان کات دا هەمان لۆگۆگرامەکانی نووسینی ناوی شاری 'کوتوا *Kutua*'[٩٨] یە (ئەم شارە لە قورئانیشدا ناوی بەشێوەی کوثی هاتووە و ئێستاش لە سەرچاوە مێژوویی‌یەکاندا هەر بە Kutha ناوی دەبرێت). بەڵام ئەم لەیەک چوونە پێ دەچێت تەنها پەیوەندی بەلایەنی تەکنیکی نووسین و خەتەوە هەبووبێت نەک پەیوەندی‌یەکی لەجۆرێکی تر.

**شوێنیان:**

گوتی‌یەکانیش لەوەدا لە گەلانی تری کوردستانی کۆن زۆر جیاواز نین کە خاک و نیشتیمانیان ناتوانرێت بەووردی دیاری بکرێت. سنوور و مەودای سەرزەمینەکەیان بۆ مێسۆپۆتامیایی‌یەکان زۆر ڕوون و زانراو نەبووە. ئەگەر جارێکی تر بە ووریایی‌یەوە

---

[96] Hallo, *RlA*, p. 709.

[97] بۆ نمونە بڕوانە:

Eidem, J. and J. Læssøe, *The Shemshara Archives-1- The Letters*, Copenhagen, 2001, 11: 4; 19: 15; 26:11.

[98] *MSL* II, 43 I 9 (MB Ugarit),

هەروەها ڕونووسێکی بابلیی ناوەڕاستی لەوحێکی ئەستێرەناسی بابلیی کۆن (BM 121034)، بڕوانە:

Edzard, D. O. and M. Gallery, "Kutha," *RlA* 6 (1980-1983), p. 385.

سەیرێکی دەقەکەی 'جوگرافیای سارگۆن' بکەینەوە؛ دەبینین گوتیوم لە *ئەبول-ئەدەد* 'Abul-Adad' ەوە بۆ *خالالابا* 'Ḫallaba' بووە.[99] شوێنی ئەمەی دواییان تا ئێستا نەزانراوە، هەرچی ئەبول-ئەدەدیشە، هەندێک هەوڵ بۆ دیاری کردنی لەسەر نەخشە دراون. باوەڕ وایە هەمان *ئەبولات* 'Abullāt' بێت کە بە چیای *کیماش* 'Kimaš' دەوترا و لە دەقەکانی سەردەمانی دواتردا ناوی هاتووە[100] - ئاگاداری ئەوە بین لە گەڵ کیماشی عیلامدا تێکەڵی نەکەین-. لەوانەیە هەر ناوی ئەم کیماشە بێت، کە تیایدا *گودێ-ئا* 'Gudea' ی میری لەگەش مسی دەرهێناوە، ناوی بەسەر ئەو شارەدا بڕابێت کە کیماشی پێ دەوترا ودەشێت گردی قوش تەپەی نێوان ئاوە سپی و تاوقی ئێستا بووبێت.[101] کە هەمان دەقەکەی 'جوگرافیای سارگۆن'یش ئاماژە بۆ ئەبول-ئەدەد وەک سنوری وولاتی ئەکەد دەکات، واتای وایە کە وولاتی گوتیوم و ئەکەد دراوسێ بوون، هەرچەندە ئەم هێڵی سنوورەی ئەکەدیش لە نزیک تاوق زۆر بەرەوژوور لە وولاتی ئەکەدی بنە دیتە بەرچاو. سنوری باشوری گوتیوم لە نووسینێکی *سامسو-ئیلونا* 'Samsu-iluna' (١٧٤٩-١٧١٢ پ.ز.) ی پادشای بابل دا بە عیلام دیاری کراوە و

---

[99] Grayson, *AfO*, p. 59, l. 15.

دەبێت تێبینی بکەین کە ڤایدنەر لای وایە مەبەست لە گوتیومی ئەم دەقە چیاکانی زاگرۆسە لە ناوچەکانی ناوەڕاستی سیرواندا:

Weidner, *AfO* XVI, p. 14.

[100] Frayne, *SCCNH* 10, p. 159-161.

[101] *Ibid.* And Frayne, *EDGN*, p. 90.

گودێ-ئا لە ئەستونی A دا دەڵێت:

"ḫur-sağ urudu-ke$_4$ ki-maš-ta ní-bi mu-na-ab-pà urudu-bi gi-si-a-ba mu-ni-ba-al"(A XVI 15-17),

واتە: "لە کیماشەوە، زنجیرە چیای مس خۆی بۆ ئەو (=گودێ-ئا) ناسراو کرد و، ئەو مسەکەی هەڵکەند (وکردی‌یە) سەبەتەوە." بڕوانە:

Edzard, D. E., *RIME*, vol. 3, part 1, Toronto, 1997, 79 (E3.1.1.7 Cyl. A II. 15-17).

سنووری باکوریشی له ئیداماراز *Idamaraz*.[١٠٢] ئەمەی دوایی‌یان سەیره، چونکه ئیداماراز له ڕووی جوگرافی‌یەوه دووره، بەڵام سنوورەکەی باشوری لەگەڵ ناوەڕۆکی نووسینەکەی لوگالانێموندوی پادشای ئاداب دا یەک دەگریتەوه که تیایدا گوتیوم له نێوان سوبارتو له باکور و مارخاشی و عیلام له باشور ڕیز کراوه.[١٠٣] ئەمه بێ گومان لەحالێکدا که شێوازی ڕیز کردنی ناوەکانی نووسینەکه لەسەر بنەمایەکی جوگرافی بێت. نیشتیمانی گوتی‌یەکان له دەقی ئەدەبی "نەفرەتی ئەکەد" دا وابەستەی ئەو چیایانه کراوه که پێیان دەڵێن گوبین *Gubin*، دەقەکه دەڵێت:

> "(ئێنلیل) تەماشای لای چیاکانی گوبینەوەی کرد؛ هەموو زنجیره چیا بەرینەکانی ڕامالی- (ئەوانەی) که لەگەڵ خەڵکدا حساب ناکرێن، به بەشێک له وڵات ناخوێندرێنەوه، گوتیوم، گەلێک که سرەوتن نازانن، که بەهرەی مرۆڤانەیان هەیه، بەڵام زرنگیی سەگانه و ڕووکەشی مەیمونانه- ئێنلیل له چیاکانەوه هێنانیه دەرەوه."[١٠٤]

---

[102] Poebel, A., “Eine sumerische Inschrift Samsuilunas über die Eroberung der Festung Dur-Samsuiluna,” *AfO* VIII (1932-33), p. 243.

[103] بۆ دەقی نووسینەکه بڕوانه:

Edzard, *ZZB*, p. 32.

شوێن دیاری کردنەکەی کامێرۆن له:

Cameron, G. G., *History of Early Iran*, Chicago, 1969, p. 41,

که گوتیومی له باکوری نیشتیمانی لوللوبی‌یەکان له شارەزوور داناوه، لەوه ناچێت لەڕاستی‌یەوه نزیک بێت، هیچ نەبێت لەم سەردەمەی بابەتی باسەکەماندا.

[104] “152) kur gú-bí-na-šè igi na-an-íl 153) ḫur-sag dagal téš-bi nam-ta-an-si-ig 154) un-gá nu-sì-ga kalam-ma nu-šid-da 155) gu-ti-um$^{ki}$ un kéš-da nu-zu 156) dím-ma lú-ulu$_3^{lu}$ galga ur-ra SIG$_7$. ALAN $^{ugu}$ugu$_4$-bi 157) $^{d}$en-líl-le kur-ta nam-ta-an-è,” Cooper, J. S., *The Curse of Agade*, Baltimore and London, 1983, lines 152-7.

لەم دەقەدا ڕق و کینەیەکی زۆر بەرامبەر گوتی‌یەکان دەرخراوه لەبەر ئەوەی گوتی‌یەکان بوون که وڵاتی سومەرو ئەکەدیان داگیر کرد و نزیکەی سەدەیەک فەرمانڕەوایی‌یان کرد.

وادیارە گوتیوم لەهەندێک سەردەمدا سەرزەمینەکانی لەباشوری زێی خواروووەوە- لەوانەشە لەبەرەوژووورتریشەوە- هەتا نزیک خاکی عیلام، لە نزیک ڕوباری سیروانی گرتبێتەوە. بە گوێرەی هالۆ Hallo، گوتیوم بە پێی سەرچاوەکانی سەردەمی بابلیی کۆن لە نێوان هەردوو هێلی پانیی ٣٥ و ٣٦ دا بووە لە هەردووبەری زێی خواروو.[١٠٥] بەلام پێ دەچێت کە سەرزەمینی گوتیی‌یەکان لە سەردەمانی دواتردا پچووک بووبێتەوە، یان ئەوەتا گوتیی‌یەکان بەسەر ڕووبەرێکی فراوانتردا بلاوبوونەتەوە و تێکەلاوی گەلانی تری ناوچەکە بوون. بۆیە لە سەرچاوەکانی هەزارەی یەکەمی پ.ز. دا وەک سەرزەمینێکی پچووکی سنوور نادیاری ڕۆژهەلاتی دیجلە ئاماژەی بۆ کراوە.

**بنەچەیان:**

گوتیی‌یەکان، وەک گەلانی تری کوردستانی کۆن، وەک تاکە کەس و وەک کۆمەلە خەلک لە چەقە شارستانی‌یەکانی مێسۆپۆتامیادا هەبوون، نەک هەر لە باشوور، بەلکو لە ناوچەکانی خابور و فوراتی ناوەڕاستیش. بۆ نموونە، ناوی کەسی کە بە *-an* و *-kan* کۆتایی‌یان دێت و بە گوتی دەزانرێن، لە دەقەکانی شاگار بازار لە ناوچەی خابور هەن. وەک 'خولوککان *Ḫulukkan*'، 'ئەتتێنان *Attenan*'، 'ئەرێشکان *Arieškan*'، 'ئاشوبلان *Ašublan*'، 'ئەننان *Annan*'، 'ئەککان *Akkan*'، و تەنانەت 'تیریکان *Tirikan*' یش،[١٠٦] کە ناوی دوا پادشای گوتیی‌یەکانیشە لە باشوری مێسۆپۆتامیا. لە شاری ماری و فوراتی ناوەڕاستیش، هەندێک لە گوتیی‌یەکان شوێنەواری خۆیان جێ

---

[105] Hallo, "Gutium," *RlA*, p. 719.

[106] بۆ ئەم دەقانە و ناوەکانی تیایاندا هاتوون، بڕوانە:

Loretz, O., "Texte aus Chagar Bazar," *lišān mitḫurti, Festschrift Wolfram Freiherr von Soden zum 19. VI 1968,* herausgegeben von W. Röllig, Neukirchen-Vluyn, 1969, pp. 244-250;

هەروەها:

Gelb, *HS,* p. 64, note 128.

هێشتووه و هەندێک ئاماژه هەیه که له سەردەمی ئەکەدی‌یەوه پێکەوه لەگەڵ ئاموری‌یەکاندا لەوێ بوون.[١٠٧] له باشووریش، واته له وولاتی سومەرو بابل، گوتی‌یەکان بابەتێکی گەرم و گوڕی نووسینه شاهانەکان و دەقه ئەدەبی‌یەکان بوون، به دوژمنی دڕندە و دووپشک و مار و کێویی یاسا نەناس ناوزەد کراون.[١٠٨] له داستانی *ئێرا* و *ئیشوم* "*Erra* and *Išum*" یشدا به یەکێک له گەله شەڕەنگێزەکانی ناوچەکه لەقەڵەم دراون.[١٠٩] له نووسینەکەی *لوگالانیموندو*' دا که لەپێشتر باسی لێوه کرا، یەکێک له هەره کۆنترین ئاماژەکانی بۆ گوتی‌یەکان تێدایه. له دەقەکانی پاشتریشدا، وەک له "نەفرەتی ئێنلیل" دا بینیمان، ئامرازێکی سزای خودایی و تۆڵه سەندن بوون که خواوەند ئێنلیل، یان له شوێنێکی تردا خواوەند مەردوک، تەیاری کردوون و به گژ نەرام-سینی دا کردوون.

له ڕووی نەژادەوه، گوتی‌یەکان یەکێک لەو گەلانه بوون که به 'گەلانی زاگرۆس' دەناسرێن و هەندێکیش 'قەوقازی Caucasians' یان پێ دەڵێن،[١١٠] لەمانەش عیلامی‌یەکان و کاشی‌یەکان و لوللوبی‌یەکان و هی ترن. زاراوەیەک که له سەرچاوه مێخی‌یەکاندا کۆیله گوتی‌یەکانی پێ وەسف دراوه، بۆ شی کردنەوەی واتاکەی بووەته مایەی زۆر گفتو گۆی نێوان توێژەران، ئەویش زاراوەی ***namrū/ namrū(tu)*** ە. وەک ووشه واتای کاڵ یان درەوشان دەبەخشێت، پرسیارەکه ئەویه ئایا مەبەست لەمه

---

[107] Hallo, *RlA*, p. 716; 719.

[108] بۆ نمونه بڕوانه دەقەکەی "نەفرەتی ئەکەد" که ئاماژەی بۆ کرا، بەتایبەتی دێڕەکانی ١٥٥-١٦١.

[109] Cagni, L., *L'Epopa di Erra*, Roma, 1969, IV 133, p. 118;

هەروەها بڕوانه:

Hecker, K., W. G. Lambert, G. G. W. Müller, W. von Soden, A. Ünal, *Texte aus der Umwelt des Alten Testaments (TUAT)*, Band III- Weisheitstexte, Mythen und Epen, Gütersloh, 1994, p. 798.

[110] بۆ نمونه بڕوانه:

Cameron, *History of Early Iran*, p. 138.

جیاکەرەوەیەکی نەژادی بووە ( وەک: سپی پێست) یان نا،[111] بەڵام ئەنجامێکی ڕوون و یەکلایی کەرەوە تا ئێستا بەدەست نەهاتووە. زاراوەیەکی تر کە بۆ وەسف دانی گوتی‌یەکان بەکارهاتووە *'nišē saklāti'* یە کە لە ڕونووسە دواترەکانی نووسینەکانی پادشای کاشی *لاگوم کاکریمێ'* دا هاتووە، ئەمیش واتاکەی تەماوی‌یە و لە شیکردنەوە نایەت.[112]

وەک وولاتی سوبارتو، وولاتی گوتی‌یەکانیش هەندێک بەرهەمی هەبووە کە بە گوتی ناسراو بووە، وەک هەنجیری گوتی، یاقیقی گوتی، خوری، عەرەبانە و هی تر.[113]

پادشایانی گوتی لەماوەی ۱۲۵ ساڵی فەرمانڕەوایی‌یان (بە گوێرەی دەقێکی تر ۱۲٤ساڵ) دا لە باشوری مێسۆپۆتامیادا جگە لە کەمێک نەبێت، نووسینی وایان جێ نەهێشتووە. یەکێک لەمانە چەند دەقێکی تا ڕادەیەک درێژ و لە ڕووی مێژوویی‌یەوە گرنگی *ئێرریدو-پی/وا-زیر* *'Erridu-Pi/Wa-zir*ن کە ماوەی ساڵانێکی زۆر بوو وون بوبوون و لەم ساڵانەی دوایی دا دۆزرانەوە و لەلایەن کوتشەر Kutscher ەوە بڵاوکرانەوە.[114] نووسینێکی تریش هی *لا-ئەراب* *'Lā- arāb*ە لەسەر سەرە

---

[111] بڕوانە:

Speiser, *Mesopotamian Origins,* p. 102 ff.; Speiser, "On the Alleged *namru* 'fair(-skinned),' " *Orientalia* 23 (1954), p. 235-236; Hallo, *RlA,* p. 717.

لە هەندێک باری تردا کە ئەم زاراوەیەی تیادا بەکار هاتووە، زیاتر بەلای ئەوەدا دەچێت کە مەبەست لێی "شۆخ" یان "چاک" بووبێت، بۆ نمونە لەسەر ئەمە بڕوانە نامەیەکی سەردەمی بابلیی کۆن کە لێرەدا بڵاو کراوەتەوە:

van Soldt, W. H., *altbabylonische Briefe* XII: Letters in the British Museum, Leiden, 1990, No. 112, p. 94-5.

[112] Hallo, *Ibid.*

[113] Hallo, *Ibid.*

[114] Kutscher, R., *The Brockman Tablets at the University of Haifa- Royal Inscriptions,* Haifa, 1989, pp. 49-70.

گورزێک.[١١٥]

دیاکۆنۆف پێشنیازێکی بەبەهای سەبارەت بە سیستەمی فەرمانڕەوایی گوتی هەیە؛ وورد بوونەوە لە لیستی ناوی پادشایانی گوتی کە لە لیستەی پادشایانی سومەری‌دا هەیە، دەری دەخات کە سەردەمی فەرمانڕەوایی پادشاکانیان کورت کورت بوون و لەماوەیەکی کورت دا ناوەکان دووبارە دەبنەوە. سەرباری ئەمەش، ڕستەیەکی سەرەتای لیستەکە کە بە پێی ڕاڤەی دیاکۆنۆف دەڵێت "هۆزی گوتی پادشای نەبوو،" پێکەوە وایان کرد دیاکۆنۆف بڕوای وابێت کە گوتی‌یەکان پادشایان نەبووبێت، بەڵکو سەرۆک هۆزیان بە هەڵبژاردن دانابێت کە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو فەرمانڕەوایی وولاتیان کردبێت و دووبارە هەڵبژاردنەوەیان بۆ زیاتر لە جارێکیش شیاو بوو بێت.[١١٦]

سەرچاوەکانی سەردەمانی پاشتریش ناوی گوتی‌یەکان وەک دوژمن و ڕکابەری خۆیان دەبەن، وەک لە نووسینەکانی ئاشور ناسیرپالی دووەم و ئەسارحەددون و سارگۆنی دووەم و ئاشور بانیپالی ئاشوری و نابونائیدی بابلی دا هاتووە. کێوی 'نیموش،' کە ئاشورناسیرپال لە وولاتی لوللوبی‌یەکاندا باسی دەکات و دەڵێت لوللوبی‌یەکان خۆیان 'کینیپا' ی پێ دەڵێن، لە هەندێک دەقی پاشتردا وەک کێوی وولاتی گوتی‌یەکان ناو دەبرێت: "...کێوی نیموش....کە لە گوتیومە،"[١١٧] هۆی ئەمە لەوانەیە ئەوە بووبێت کە گوتی‌یەکان زیاتر لە لوللوبی‌یەکان لەلایەن نووسەرەکانی باشورەوە ناسراو بووبێتن. سەرگوزشتەکانی سەبارەت بە گوتی‌یەکان و کێوی نیموش و کەشتی‌یەکەی لەسەری

---

[115] Frayne, D. R., *RIME* Vol. 2: Sargonic and Gutian Periods (2334- 2113 BC), Toronto, 1993, E2. 2. 14. 1 (p. 229).
[116] Diakonoff, "Media," *The Cambridge History of Iran (CHI)*, Vol. 2, Cambridge, 1985, p.37.
[117] Reiner, E., "*Lipšur* Litanies," *JNES* 15 (1956), No. 3, p. 135.
سەبارەت بە خوێندنەوەی *نیصیر* *Niṣir* بە *نیموش* *Nimuš* لەم ساڵانەی دوایی دا، لە بەشی جوگرافیی ئەم بەشەدا باسکراوە.

لەنگەری گرتووە — هەروەک لە ئەفسانە سومەری و بابلی‌یەکاندا هاتووە کە کەشتی‌یەکە لەســەر نیمــوش لەنگــەری گرتووەتەوە- و لەم جـــۆرە، لە سومـــەری و بابلی‌یەکانەوە بۆ ئەدەبیاتی دواتری خوری و جولەکە[118] و سریانی و پاشتریش عەرەبی گواستراونەتەوە، هەروەک لە قورئاندا "واستوی علی الجودی"[119] دەبینین.

**زمانیان:**

زمانی گوتی هەتا ئەو ڕۆژەی دەقی بەم زمانە نووسراو- ئەگەر هەبێت- نەدۆزرێتەوە، هەر بە تەلیسم دەمێنێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، هەندێک زانیاری کەم، بەڵام گرنگ لەبارەیەوە لەڕێی هەندێک ناوی کەسیی گوتی‌یەوە کە لە لیستی پادشایانی سومەردا هاتوون، دەکرێت هەڵبهێنجرێت. ئەم ناوانە ئەوە پیشان دەدەن کە زمانی گوتی سەر بە

---

[118] سەبارەت بە گوازرانەوەی پارچەی وێژەیی لەم جۆرە لە مێسۆپۆتامیاوە بۆ وێژەی جولەکە لە ڕێگای خوری‌یەکانەوە، بڕوانە:

Speiser, E. A., "The Hurrian Participation in the Civilization of Mesopotamia, Syria and Palestine," *Oriental and Biblical Studies, Collected Writings of E. A. Speiser*, Philadelphia, 1967, pp. 266-7.

[119] بێ سوود نیە گەر لێرەدا ڕای شپایزەر لەم بارەیەوە بخەینە بەرچاو. بەڕای ئەو لەبنەڕەتدا ئەوکێوەی کەشتی‌یەکە لەنگەری لەسەر گرتووە لە ئەدەبیاتی مێسۆپۆتامیادا نیموش بووە، بەڵام کاتێک خوری‌یەکان ئەم سەرگوزشتەیەیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی خوری، ناوی چیای نیموشیان گۆڕیوە بە ناوی بەرزترین چیای نیشتیمانی بنەی خۆیان کە بەڕای زۆربە لە ناوچەی وان و دەوروپشتی دەریاچەکەی بووە، کە لەدواتردا پێی دەوترا وولاتی ئورارتو، ئەم چیایەش ئارارات بووە. بە ڕای شپایزەریش، دەقی ئەم وەرگێڕانە خوری‌یە بووە، نەک بابلی‌یەکەی، کە جووەکان وەریات گرتووە و وەریان گێڕاوەتە سەر زمانی عیبری و چووەتە تەوراتەوە، بۆیە لەو کتێبە پیرۆزەدا چیای ئاراراتە، نەک نیموش، کە کەشتی‌یەکە لەنگەری لەسەر گرتووە. بۆ ئەم ڕایەی شپایزەر بڕوانە:

Speiser, *Oriental and Biblical Studies*, p. 267.

گرووپی گەورەی زمانەکانی زاگرۆس بووە وەک زمانەکانی عیلامی (؟) و لوللوبی و یەکێک بووە لەو زمانانەی کە حەمورابی بە "سەخت" وەسفی داون.[١٢٠] بە لێ وورد بوونەوە و سەرنج دانی ئەم ناوانە، شپایزەر توانیویەتی هەندێک لەڕواڵەتەکانی پێشنیاز بکات، وەک بوونی پێشگری *w/a/iarla*، توخمی *-laga-* و پاشگرە کۆنسۆنانتییەکانی *-b* و *-š* و *-(a)n*-[١٢١] وەک لە ناوەکانی *سارلاگاب* 'Sarlagab'، *ئێلولومێش* 'Elulumeš'، *ئینیمیباکێش* 'Inimibakeš'، *ئیگێشاوش* 'Igešauš'، *یارلاگاب* 'Iarlagab'، *یارلاگاندا* 'Iarlaganda'، *تیریگان* 'Tirigan'،[١٢٢] -*لا* *ئەراب* 'Lā- 'arāb'، *شارلاک* 'Šarlak' کە شارکالیشەڕی بەدیلی گرتووە،[١٢٣] *ئێندوششێ* 'Endušš' پادشای گوتی ی نامەکانی شمشارە[١٢٤] تەنانەت لەوانەشە *خەتانیش* 'Ḫataniš' ی فەرمانڕەوای خەمازیش.[١٢٥] پاشگری *š-* پێ دەچێت زۆر

---

[120] Gadd, C. J. and L. Legrain, *Ur Excavations. Texts (URI) I: Royal Inscriptions*, London, 1928, No. 146, p. 44-45.

[121] Speiser, *Mesopotamian Origins*, p. 97.

[122] بڕوانە:

Jacobsen, *SKL*, pp. 118-121.

شارێکیش بەناوی *لاگا(بـ)لاگا* 'Laga(b)laga' وە لەووڵاتی زاموا هەبووە کە ئاشورناسیرپال لەکاتی جەنگەکانی زاموادا داگیری کردووە، هەمان ئەم توخمی *لاگا* 'laga' نموونەییەی تیادایە کە سەر بەهەمان ئەم گرووپەیە. بۆ دەقی نووسینە شاهانەکەی ئاشورناسیرپال کە ئەم ناوەی تیادا هێناوە، بڕوانە:

Grayson, *RIMA 2*, I, A.0.101.1 (No. 1), ii 19b-23a, p. 203.

[123] بڕوانە:

Gadd, "The Dynasty of Agade...," *CAH*, p. 455.

[124] بۆ نموونەی ئەم ناوە لەم نامانەدا، بڕوانە نامەکانی ژمارە:

8: 13, 14; 11: 8, 36 و هی تر لە:

Eidem and Læssøe, *The Shemshara Archives*, p. 79.

[125] Speiser, *Op. Cit.*, p. 98.

بەڵام جاکۆبسن هەوڵی داوە ڕیشەیەکی ئێتیمۆلۆجیی ئەکەدی بۆ ئەم ناوە بدۆزێتەوە؛ بە ڕای ئەو بریتییە لە شێوەیەکی کورت کراوەی *'Ḫataniš-qabi'* بە واتای: "ئەو (خواوەندێک) پەیمان دەدات کە بیپارێزێت." بڕوانە:

جار لە ناوی کەسیش و لە ناوی شوێنیشدا هاتبێت، وەک 'سیماش *Simaš*'، 'کیماش *Kimaš*' و 'تو کریش *Tukriš*' و زۆر لەوە دەچێت پەیوەستی‌یەکی لەگەڵ پاشگــری ‎-si‎ ی لوللوبی دا هەبووبێت.[126] هەرچی پاشگری ‎-an‎ یشە، لە ناوچەکانی زاگرۆس دا باو بووە و تەنها لە ناو گوتی‌یەکاندا باو نەبووە. هەندێکی کەم ووشەی گوتی لە هەندێک دەقی فەرهەنگی دا پارێزراون، هەرچەندە لەبارێکی خراپ دان و زۆریان شکاوی تێدایە، لەمانەش: *ḫara[mbi?]* بە واتای *barirtu* ی ئەکەدی کە ناوی جۆرە ڕووەکێکە. *elinu* بەرامبەر بە ووشەی *kurkanû* ی ئەکەدی، بەواتای 'ڕووەکی قاز'- کە نازانین مەبەست لێی چی جۆرە گیایەکە- . هەروەها ناوی چەند خواوەندێکی گوتی‌ش لە لیستی ناوی خواوەندانی ناسراو بە AN: *$^{d}$an-nu-um* دا هاتوون کە بەداخەوە تەنها ناوی دوایین خواوەندیان لە لیستەکەدا بەساغی ماوەتەوە کە ئەویش ناوێکی گوتیی نمونەیی‌یە: 'ئەبوبلاب *Abublab*.'[127]

## لوللو(بی)یەکان:

### ناونانیان:

لوللوبی‌یەکانیش گەلێکی تری کوردستانی کۆن بوون کە ناوەکەشیان بەسەر ئەو وولاتەدا دابڕابوو کە تیایدا دەژیان. ناوی ئەم گەلە و ناوی وولاتەکەیان بە چەند شێوەی

*SKL,* p. 98, note 168.

[126] Speiser, *Op. Cit.*, p. 98.

ئەم پاشگرە لە ناوە کاشی‌یەکانیشدا زۆر دێت، بەتایبەتی ناوی شوێن. لەم بارەیەوە شپایزەر پێشنیاز دەکات ناوی شاری بەناوبانگی سومەری 'لەگەش *Lagaš*' لە دوو بڕگەی گوتی laga و š– پێک هاتبێت، ئەوەش بیر دەخاتەوە کە چاخی زێڕینی ئەم شارە لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی گوتی‌یەکاندا بەرێکەوت نەبووە، بەڵکو پەیوەندی‌یەکی بە دەوروبەرە گوتی‌یەکەو تێکهەڵکێش بوون لەگەڵ گوتی‌یەکاندا هەبووە. بڕوانە:

*Mesopotamian Origins,* p. 99.

[127] Hallo, *RlA,* p. 719.

جیاواز لە سەرچاوە مێخی‌یکاندا نووسراوە، بەڵام جیاوازی‌یەکانی کەمترن لە جیاوازی‌یەکانی شێوەی ناوی گوتی‌یەکان. لەهەموو شێوەکان زیاتر *‘Lul(l)ubu(m)’* و *‘Lullumē’* و *‘Lulubuna’* ن. لە ژمارە بەشێوەی *‘Lullu(um)’* هاتووە[128] و لە نوزی بەشێوەی *‘L/Nullū’*.[129] نیشتیمانی لوللوبی‌یەکان بە گشتی لە ناوچەی ئێستای سلێمانی دا بووەو، بە تایبەتی لە دەشتی شارەزوور چەقی بەستبوو، لانی کەم لە سەردەمی ئاشوریی نوێ دا بەم جۆرە بووە. ناوی ’لوللوبی‘ لە دەقەکانی هەزارەی دووەمی پ.ز. دا، جگە لە واتا نەژادی‌یەکەی، "بیانی" و "چیایی" شی دەگەیاند.[130]

**شوێنیان:**

هەروەک ئاماژەی بۆ کرا، نیشتیمانی لوللوبی‌یەکان لە دەشتی شارەزوور و دەوروپشتەکەی چەقی بەستبوو. لە ڕێی دەقەکانی ئەڕراپخاوە دەزانین کە لوللوبو نزیکترین دراوسێی ئەڕراپخا بووە لە ڕۆژهەڵاتەوە.[131] هەروەک لە جوگرافیاکەی سارگۆنیشدا هاتووە، کە تیایدا وولاتی لوللوبی‌یەکان ڕاستەوخۆ لەپاش ئەڕراپخا ناوی هاتووە و دەڵێت کەوتوەتە "نێوان ئوورونا *‘Uruna’*[132] و سینو *‘Sinu’* وە".[133] ئەم ناوەی دوایی‌یان لەم ڕوژی ئێستادا هیچ شتێکی لەبارەوە نازانین. وولاتی لوللوبو لە ڕۆژهەڵاتەوە بە ڕادەیەکی نزیک لە گومان بەدەر تا ناوچەکانی دەوروپشتی مەریوان یان هەندێک بەشی باشوری دەریاچەی ورمێ دەکشا. ئەم ڕاستی‌یە لە ناوەڕۆکی

---

[128]Eidem and Læssøe, *Op. Cit.*, 3: 19; 12: 27; 36: 35; 39: 10 *etc.*

[129]Klengel, H., “Lullu(bum),” *RlA,* Band 7 (1987-1990), Beriln-New York, p. 164.

[130] Klengel, *Op. Cit.*, p. 615.

[131] Speiser, *Mesopotamian Origins,* p. 88.

[132]سەبارەت بە ئوورونا، بە ڕای فرەین لە نزیک یان لەگوێ ڕوباری دیجلە بووە، لە ناوچەی زێی خواروو. بڕوانە:

Frayne, *EDGN,* p. 89.

[133]Grayson, *AfO,* p. 59.

نووسینەکەی شەلمانیسەری سێ یەم (٨٥٨-٨٢٤ پ.ز.) ی پادشای ئاشورەوە هەڵهێنجراوە کە لەباسی لەشکر کێشیی‌یەکەیدا بۆ سەر لوللوبیی‌یەکان لە ٨٥٥ پ.ز. دا باسی "دەریا"ی زاموای ناوەوە دەکات،[١٣٤] و ئەم دەریاچەیە هەندێک بە دەریاچەی ورمێ ی دەزانن[١٣٥] و هەندێکی تریش بە دەریاچەکەی زرێباری نزیک مەریوان.[١٣٦] درێژبوونەوەی وولاتی لوللوبوم بۆ سەر دەریایەک، دەقێکی تریش دەیسەلمێنێت کە لە بۆغازکۆی دۆزراوەتەوەو ئاماژە بۆ شوێنێک بە ناوی 'Šudul شودول' دەکات کە لە وولاتی لوللوبوم لە ڕۆخی دەریا بووە.[١٣٧] بوونی نەخشی هەڵکەندراوی ئانوبانینی پادشای لوللوبیی‌یەکان لە قەد شاخێکی سەرپولی زەهاو وای کردووە زۆر لە توێژەران بێنە سەر ئەو باوەڕەی کە وولاتی لوللوبیی‌یەکان تا ئەم شوێنەی سەر ڕوباری ئەڵوەند لە باشورەوە درێژبووبێتەوە،[١٣٨] ئیتر لەئەنجامی سەرکەوتنی سەربازیی لوللوبیی‌یەکان بووبێت یان کۆچ و ڕەوی ئاشتیانەیان. بەڵام بوونی ئەم نەخشە لەم شوێنەدا ناکرێت بە بەڵگەی درێژبوونەوەیەکی دیمۆگرافیانە بژمێردرێت، چونکە، هەروەک زانراوە، زۆر جار لە مێژووی کۆن دا ڕووی داوە کە پادشایان و دەستەڵات دارانی سەرکەوتوو و براوە میلی

---

[134] Luckenbill, D. D., *Ancient Records of Assyria and Babylonia (ARAB)*, Vol. I, Chicago, 1926, p. 228, § 617; p. 247, § 686.
[135] Medvedskaya, I., "Zamua, Inner Zamua and Mazamua," *Variatio Delectat: Iran und der Westen* (Gedenkschrift für Peter Calmeyer, Herausgegeben von R. Dittmann, B. Hrouda, U. Löw, P. Mathiae, R. Mayer-Opificius and S. Thürwächter), Münster, 2000, p. 436; 442.
[136] Speiser, "Southern Kurdistan…," *AASOR*, p. 19.

تێبینی بکە شپایزەر ناوەکەی بە 'زێریبۆر' نووسیوە.

[137] Klengel, *Op. Cit.*, p. 166.

[138] شترێک لەو باوەڕەدابووە کە سەرپولی زەهاو نیشتیمانی بنەیان بووبێت و لە پاش دا بەرەو ناوچە کوێستانیی‌یەکانی نێوان سیروان و زێ ی خواروو کشابێتن، بڕوانە:

Streck, M., "Das Gebiet der heutigen Landschaften Armenien, Kurdistan und wetpersien nach den Babylonisch-assyrischen Keilinschriften," *Zeitschrift für Assyriologie (ZA)* XV (1900), p. 294.

بەڵام کامێرۆن بە پێچەوانەوە، باوەڕی وایە لە شارەزوورەوە بەرەو ئەو خواردوە داگەڕابێتن، بڕوانە:

Cameron, *History of Early Iran*, p. 40.

سەرکەوتنیان لە وولاتانی بێگانەدا چەقاندووە و نەخشی یادگارانەیان بۆ سەرکەوتنەکانیان تیایاندا هەڵکەندووە. ئەم نەخشەش دەشێت یەکێک بێت لەوانەو لەهەمان کاتیشدا دەشێت لەوانەش نەبێت، چونکە بۆ وولاتی لوللوبو نارەحەت نەبووە پەلی دەستەلاتی بۆ ئەم شوێنە بکێشێت، بەتایبەتی ئەگەر مەوداکەی وولاتی لوللوبو بهێنینەوە یاد کە جوگرافیاکەی سارگۆن بۆمانی تۆمار کردووە: ٩٠ بێرو *bēru*،[١٣٩] کە وادیارە هەموو ئەو سەرزەمینانەی حساب کردووە کە لە سەرچاوەکانی سیروان و زێ ی خوارووەوە دەکشان تا دەگاتە دەریاچەی ورمێ،[١٤٠] لەو شوێنەی کە باوەڕ وایە نەوەکانی لوللوبی‌یەکان بووبێتن کە لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پ.ز. دا دەوڵەتی *'مانا* *Manna*' یان بنیات ناوە.

وا پێ دەچێت زاموا کرۆکی وولاتی لوللو بووبێت. زامواش بەهەموو لێک دانەوەو بۆچوونێک هەر هەمان دەشتی شارەزوور بووە، بەشی هەرە زۆری شارو ئاوەدانی و چەقە شارستانی‌یەکانی لوللوی تێدابووە کە ناوەکانیان لە ساڵنامەو نووسینەکانی ئاشورناسیرپال و جێنشینەکانی دوای دا هاتوون کە تیایاندا باسی شەڕو شۆڕ و لەشکرکێشی‌یەکانیان لە زاموا دەکەن. جێگای سەرنج و گرنگی پێ دانە کە لەم نووسینانەدا باس لە دابەش کردنی ناوەکیی وولاتی زاموا کراوە، وەک *'زاموا* *Zamua*'، *'مازاموا* *Mazamua*' و *'زاموا شا بیتانی* *Zamua ša bitāni*'، کە کەمێک بە درێژی لەلایەن شپایزەر و مێدڤێدسکایا وە بۆ دیاری کردنی واتای تەواویان و شوێنیان لە ناو وولاتی زاموادا لێی کۆڵدراوەتەوە.[١٤١]

---

[139]Grayson, *AfO,* p. 60, l. 39.
[140] Diakonoff, *History of Media,* p. 158.

هەروەها نەخشەی لاپەڕە ٢٠٨ ی هەمان ئەم سەرچاوەیە.

[141]Speiser, *AASOR;* and Medvedskaya, *Op. Cit.*

## خەڵکی لوللو:

وەک دەردەکەوێت، لوللوبیەکان لەکۆمەڵگایەکی هۆزایەتی دا ژیاون و شانشین و میرنشینیان پێک هێناوە. ڕەنگە پادشاکانیان و میرەکانیان سەرۆک خێڵ و هۆزەکان بووبێتن کە لەکاتی شاڵاوو مەترسی دەرەکی دا یەکیان گرتووە و لەکاتی تریشدا ناحەزو ڕکابەری یەک بوون. لە نامەکانی شمشارەدا "پادشاکانی لوللو"[١٤٢] مان بەرچاو دەکەوێت و لە ساڵنامەکانی ئاشورناسیرپالیشدا باسی چەندین پادشا و میری لوللوبیمان بەرچاو دەکەوێت و ناوەکانیان دەبینین.[١٤٣] دەقێکی مێژوویی-ئەفسانەیی لە بۆغازکۆی دۆزراوەتەوە، ئەگەر بتوانین پشتی ببەستین، ئەوا لوللوبیەکان جارێک لە جاران "شاهان

---

میدڤیدسکایا گەیشتووەتە ئەنجامی ئەوەی کە مازاموا لەگەڵ زاموا دا تەواو یەک نایەتەوە، بەڵکو مازاموا ئەو ناوەیە کە شەمشی-ئەدەدی پێنجەم لەو هەرێمەی نا کە خۆی لە خاکی زاموای داپچڕی و جیای کردەوە، بڕوانە:

Medvedskaya, *Op. Cit.*, p. 439; 441; 443.

زاموا شا بیتانی (واتە: زموای ناوەوە) ئەو بەشەی وولاتی زاموا بووە کە کەوتبووە پشت ئەوەی پێی دەووترێت *chaîne magistrale* ( ئەممەش بەو بەشەی چیاکانی زاگرۆس دەووترێت کە بەرزترین شانی زنجیرەکەیەو بەبەشی هەرە زۆری کوردستان دا تێپەڕ دەبێت و سنووری ئێستای عێراق و ئێران پێک دەهێنێت، لە خاڵی سنووری تورکیای ئێستاوە دەست پێ دەکات و بەرەو باشوور تا ماهیدەشت دەکشێت و پاش ئەوەی ڕێگای گەورەی خوراسان لەم شوێنەدا دەبیڕێت، لە دوایەوە دەست پێ دەکاتەوە و بەرزاییەکانی بەختیاری پێک دەهێنێت)، و دەریای زاموایش، بە ڕای ئەو دەریاچەی ورمێ بووە نەک زرێبار، بڕوانە:

*Op. Cit.*, p. 435f.; 442.

[142] بڕوانە:

Eidem and Læssøe, *Op. Cit.*, 63: 24-25; 64: 22.

[143] بۆ باس و خواسی شەڕەکانی ئاشورناسیرپال لە زاموا و ناوی میرو پادشا لوللوبیەکان لە ساڵنامەکانی ئاشورناسیرپال خۆی دا، بڕوانە:

Grayson, *RIMA 2*, I, A.0.101.1 (No. 1), ii 19b ff.

شا"یەکیان هەبووە ناوی *ئیماشکو(ش)* *Immašku(š)*' بووە و هاوشانی پادشایانی توکریش و عیلام بووە.[١٤٤] لە زۆر نووسینی ئەدەبی دا، لوللوبی‌یەکانیش وەک گوتی‌یەکان، بە دوژمنکار و چیانشینی شەڕەنگێزی خاوەن هێزی لە سروشت بەدەر باس کراون، هەروەک لە ئەفسانەی نەرام-سین[١٤٥] و داستانی ئێرڕا و ئیشوم دا دەبینرێت.[١٤٦]

---

[144] Klengel, *RlA*, p. 166; Cameron, *Op. Cit.*, p. 29; 35.

[145] بڕوانە:

Lewy, "Assyria," p. 739;

هەروەها:

Westenholz, J. G., *Legends of the Kings of Akkade*, Eisenbrauns, 1997, p. 250-1.
[146] Hecker and others, *TUAT*, p. 798.

شێوەی ژمارە ١: ڕونووسی نووسینەکەی ئانوبانینی لە سەرپولی زەهاو. سەرچاوە:
B. Nasrabadi, "Beobachtungen zum Felsrelief Anubaninis," *ZA* 94 (2004).

خۆشبەختانە وێنەی چەند لوللوبی‌یەک لەسەر میلی سەرکەوتنەکەی نەرام-سین کە لە شوش (=سوسە) دۆزراوەتەوە، پارێزراوە. لەم وێنانەدا دەدەکەوێت پۆشاکیان پێستەی ئاژەڵ بووە، زۆر پێ دەچێت پێستەی مەڕ بووبێت، کڵاوی کلک درێژیان لەسەردایەو چەکیان ڕم و تیرو کەوانە. دووریش نیە ئەو دیلانەی لەسەر میلی سەرکەوتنی تری پادشایانی ئەکەد نەخش کراون و پرچی درێژیان هەیە، لوللوبی بووبێتن. لوللوبی‌یەکان بەگشتی جوتیار بوون، هەروەک لە نامەیەکی شمشارە (SH 812) وە دەردەکەوێت[١٤٧] دانەوێڵەیان دەچاند ودەفرۆشت. سەرباری ئەمانەش، وڵاتی لوللو سەرچاوەیەکی گرنگی کۆیلە بووە و کۆیلەکانی لە ئەڕڕاپخا بەهایەکی بەرزیان هەبوو.[١٤٨]

خواوەندەکانی لوللو زۆر بوون؛ ساڵنامەکانی پادشایانی ئاشور وەک تیگلات پیلێسەری یەکەم (١١١٥-١٠٧٧ پ.ز.)، کە تیایدا دەڵێت بێ ٢٥ خواوەندی لوللوبیی بەتاڵان بردووە،[١٤٩] و ئاشورناسیرپال، کە باسی بەتاڵان بردنی گایەکی کێوی مسینی (پیرۆز؟) ی کردووە، بەڵگەی ئەم ووتەیەن.[١٥٠] *ئانوبانینی*ش، پادشای لوللو، لە نووسینە شاهانەکەیدا لە سەرپولی زەهاو ناوی هەندێک لەو خواوەندانەی ڕیز کردووە کە پەرستوونی، ئەوانیش: *ئانو* *Anu*، *ئەنتوم* *Antum*، *ئێنلیل* *Enlil*، *نینلیل* *Ninlil*، *ئەدەد* *Adad*، *ئـ/عیشتار* *Ištar*، *سین* *Sîn*، *شەمەش* *Šamaš*،

[147] Eidem and Læssøe, *The Shemshara Archives-1- The Letters,* p. 134-5.
[148] Speiser, *Mesopotamian Origins,* p. 95.
[149] Grayson, *RIMA* 2, I, A.0.87.2 (No. 2), 23-24, p. 34.
[150] *ARAB I,* p. 152, § 454.
لەساڵنامە ئاشوری‌یەکاندا هەتا دەگاتە ئاشورناسیرپال، باسی هیچ تاڵانی‌یەکی لە ئاسن دروست کراو لە وڵاتی لوللوبی‌یەکاندا بەرچاو ناکەوێت، هەرچی باس دەکرێت، بە پلەی یەکەم برۆنزو مسە و بە برێکی کەمتر زیوو زێڕ. ئەمە ڕاستی‌یەکی سەیر و سەر سوڕهێنەرە، چونکە چاخی ئاسن چەند سەدەیەک بوو لە ناوچەکەدا دەستی پێ کردبوو و ئاشورناسیرپال خۆی پاچ و تەوری ئاسنینی بۆ ڕێگا کردنەوە لە دەربەند و تەنگەکانی وڵاتی لوللوبودا بەکارهێناوە، هەروەک لەم نووسینەی دا دەڵێت:
*RIMA* 2, I, A. 0.101.1 (No. 1), ii 49b- 60a, p. 205.

نین-ئەن-سیاننا ‘Nin-an-sianna’ و ناوی تر کە یان بەتەواوی شکاون یان هێندە سڕاونەتەوە کە ناخوێندرێنەوە.[١٥١] لەمانەش گرنگتر ناوبردنی خواوەند نیشبا ‘Nišba’یە، گەورەی (؟) خواوەندانی شانشینی ســـ/شیموررروم، کە لە دەقی دووەمی نووسینەکەدا ناوی هاتووە (ستوونی II, 1 44)، هەرچەندە باوەڕ زیاتر بەرەو ئەوە دەچێت کە ئەم نووسینەیان هی ئیددیـ(ـــن)-سین بوو بێت نەک ئانوبانینیی پادشای لوللوبوم (بۆ ئەمە بڕوانە بەشی سێ یەمی ئەم کتێبە).

**زمانیان:**

زمانەوانان لەچەند ووشەیەکی کەم بەولاوە زیاتریان نیە لەبارەی زمانی لوللوبیەوە بیلێن. ووشەیەکی لوللوبی کە "یانزو Ianzu"ە چەندساڵ لەمەوبەر لەلایەن دیاکۆنۆفەوە پێشنیازکرا بەوەی واتای "پادشا" دەگەیەنێت ئەویش بەبەراووردکردنی بە ووشەی پادشا لەزمانەکانی دواتردا. بەڵام لەم مەیدانەدا شپایزەرە کە هەوڵی داوە بە پشت بەستن بەو ناوە کەسی و ناوە جوگرافیانەی بە پلەی یەکەم لە سەرچاوە ئاشوورییەکاندا تۆمار کراون، هەندێک لە دیاردە جیاکەرەوەکانی زمانەکەیان هەڵبهێنجێنێت. یەکێک لەم جیاکەرەوانە پاشگری -ni یە لە ناوە کەسییەکاندا، وەک ناوی ئانوبانینی،[١٥٢] و ساتوی ‘Satui’، ئەو پادشا لوللوبییەی نەرام-سین بەسەریدا سەرکەوت،[١٥٣] سابینی ‘Sabini’ فەرمانڕەوای شاری کیسیرتو ‘Kisirtu’ی زاموایی،[١٥٤] و لەوانەیە بتوانین ئار-دونی

---

[151] بۆ دەقی نووسینەکەی ئانوبانینی لە سەرپولی زەهاو، بڕوانە:
Edzard, “Zwei Inschriften am Felsen von Sar-i-Pūl-i-Zohāb: Anubanini 1 und 2,” *AfO* 24 (1973), pp. 73-77.

[152] ئەمە ئەگەر ئەم ناوە ئەکەدی نەبێت *Anu- banini*> . شایانی سەرنج دانە هیوزینگ ناوەکەی بە ناوی خواوەندی عیلامی خومبان ‘Ḫumban’ەوە بەستووەتەوە، بڕوانە:
Hüsing, G., “Der Zagros und Seine Völker,” *Die Alte Orient* IX (1908), p. 16 ff.

[153] Barton, *RISA,* p. 142.

[154] Grayson, *RIMA* 2, I, A.0.101.1 (No. 1), ii 49b –60a, p. 206.

*Tar-dunni*' یش،[155] تخاوەنی نەخشە هەڵکەندراوەکەی دەربەندی بێلولە، لەگەڵیاندا ڕیز بکەین. بەڵام ناوی هاوسەرەکەی ئانوبانینی کە لە ئەفسانەکەی "پادشای کوثا" دا بە 'مێلیلی *Melili*' هاتووە[156] ناوێکی نمونەیی یە لەجۆری ناوە بڕگە دووبارەکانی گاسور. ناوی 'ئیماشکوش'ی شاهانشا لوللوبی‌یەکەش کە ئاماژەی بۆ کرا، زیاتر لە ناوێکی کاشی یان گوتی دەچێت وەک لەوەی لە لوللوبی بچێت.

پاشگری *si*- لە ناوە کەسی و جوگرافی‌یەکاندا زۆر دووبارەە دەبێتەوە، لە پاڵ کۆمەڵێک پاشگری تردا کە پاشگرە عیلامی‌یەکانمان یاد دەهێننەوە[157] وەک *k*-، *r*-، *s*- و *(a)n* – و ئامرازی کۆ : *p*- یان *b*-.[158] لێرەدا دووبارە نووسینەوەی نمونەکانی کە شپایزەر هێناونێتی‌یەوە لەوانەیە بە سوود بێت:

*Sim-aki* (زنجیرە چیا)
*Az-iru* (چیا)
*Kull-ar* (زنجیرە چیا)
*Bat-ir* (چیا)
*Ed-ir* (ڕوبار)

---

[155]یان بە پێی خوێندنەوەی دیاکۆنۆف: 'لیشیر-پیرئینی 'Līšir- Pir'ini، بڕوانە:
Diakonoff, "Media," *CHI*, p. 39;
هیوزینگ بە 'شیل-x-دون(؟)-نی 'Šil-x-dun(?)-ni خوێندوویەتی‌یەوە، بڕوانە:
Hüsing, *Op. Cit.*, p. 17.
دەبێت تێبینی بکەین کە پاشگری *ni*- یەکێک لە پاشگرە زۆر بەکارهاتووەکانی هەردوو زمانی خوری و ئورارتیشە.

[156]Cf.: Hallo, *RlA*, p. 709.

[157]وادیارە ئەمە هۆی بەستنەوەی زمانی لوللوبی‌یە بە زمانی عیلامی‌یەوە لەلایەن هیوزینگەوە، بڕوانە:
Hüsing, *Op. Cit.*, p. 19ff.

[158]Speiser, *Mesopotamian Origins*, p. 91.

*Zam-ṟi* (شار)

*Bā-ṟi* (شار)

*Lā-ṟa* (وولات)

*Lal-aṟ* (چیا)

*Ḫašm-aṟ* (دەربەند)

*Buna-s̱i* (قەلا)

*U-ẕi* (قەلا)

*Ḫud-uṉ* (شار)

*Sua-ṉi* (چیا)

*Radā-ṉu* (ڕووبار)

*Ḫalm-aṉ* (وولات)

*kini-p̱a* (چیا)

*Niš-p̱i* (چیا)

*Sum-ḇi* (چیا، لەسەردەمی سارگۆنی ئاشوورییەوە)[159]

وادیارە بەلایەنی کەمەوە یەک دیالێکتی تری زمانی لوللوبی هەبووە، چونکە لە سالنامەکانی ئاشورناسیرپالی دووەم دا هاتووە کە کاتێک لەشاری 'زامری *Zamri*' بووە لە زاموا، باج و سەرانەی وولاتی 'سیپیرمێنا *Sipirmena*' —کە بەشێکی زاموا بووە—ی بۆ هاتووە، کە "وەک ژنان قسە دەکەن."[١٦٠]

[159] Speiser, *Op. Cit.*, pp. 91-4.
شپایزەر هەندێک لە پادشا هەرەزووەکانی وولاتی ئاشوری سەدەی ١٩ و ١٨ی پ.ز. وەک *لوللای* *Lullai*' (ناوەکەی واتە: لوللوبی)، 'بازای *Bazai*'، 'لوبای *Lubai*' و 'ئەداسی *Adasi*' بە ڕەچەڵەک لوللوبی دەزانێت، بڕوانە:

*Op. Cit.*, p. 90, note 8.

[160] *ARAB* I, p. 153, § 456.

## خوری‌یه‌کان:

دوایین گه‌لێک له‌گه‌لانی کوردستانی ناوه‌ڕاست که لێره‌دا باسیان لێوه بکه‌ین خوری‌یه‌کانن (له‌ ته‌ورات دا : حۆریت)، که بۆ ماوه‌یه‌کی درێژ نه‌ته‌وه‌ی سه‌ره‌کیی ناوچه‌که بوون و ڕۆڵێکی ڕامیاری و فه‌رهه‌نگیی ئێگجار گه‌وره و گرنگیان له مێژووی هه‌موو ڕۆژهه‌ڵاتی نزیکی دێرین به‌گشتی و کوردستانی کۆن به‌تایبه‌تی دا، گێڕاوه. وادیاره خوری‌یه‌کان له‌بن خه‌ڵکی ناوچه‌که نه‌بوون، به‌ڵکو کۆچ هێنه‌ربوون. نیشتیمانی دێرینیان زیاتر له‌وه ده‌چێت کوێستانه‌کانی باکور و ناوچه‌کانی قه‌وقاز بووبێت، ئه‌مه‌ش به پشت به‌ستن به په‌یوه‌ندی‌یه زمانه‌وانی‌یه‌کانی نێوان خوری و ئورارتی که وایێ ده‌چێت بنه‌چه‌یه‌کی کۆنی هاوبه‌شیان هه‌بووبێت وله نێو زمانه‌وانه‌کاندا زمانی 'خوری-ئورارتیی بنه 'Proto Hurro- Urartian ی پێ ده‌ووترێت. باوه‌ڕ وایه ئه‌م زمانه هاوبه‌شه کۆنه له هه‌زاره‌ی سێ یه‌می پ.ز. به دواوه ئیتر بۆ دوو لقی جیای خوری و ئورارتی په‌ره‌ی سه‌ندبێت. جگه له‌مه‌ش دیاکۆنۆف چه‌ندێن ووشه‌ی خوریی ده‌ستنیشان کردووه که له‌یه‌ک چوون و هاوبه‌شی‌یان له‌گه‌ڵ زمانه‌کانی باکوری ڕۆژئاوای قه‌وقازدا هه‌یه.[١٦١] کات و مێژووی ووردی ئه‌م داکشانه خوری‌یه به‌ره‌و باشور نه‌زانراوه. کۆنه ناسان و زمانه‌وانان هه‌وڵیان داوه ئه‌م مێژووه به پشت به‌ستن به به‌ڵگه‌ی زمانه‌وانی و بابه‌تی نووسراو، دیاری بکه‌ن. به‌پێی ئه‌مانه، مێژووی جموجۆڵ و گه‌یشتنیان ده‌بێت له کۆتایی هه‌زاره‌ی سێ یه‌می پ.ز. دا بووبێت،[١٦٢] چونکه که‌مێک پاش ئه‌مه ئیتر یه‌که‌مین و

---

[161] Diakonoff, I. M. and S. A. Starostin, *Hurro-Urartian as an Eastern Caucasian Language,* Müchen, 1986; Hoffner, H. A., Hurrian Civilization from a Hittite Perspective, *Urkesh and the Hurrians,* p. 168.

[162] شتاینکێله‌ر کۆنترین ده‌رکه‌وتنیان له مێسۆپۆتامیا به ده‌می نێوان ٢٤٠٠ پ.ز. و سه‌رده‌می نه‌رام-سین دیاری کردووه، بڕوانه:

Steinkeller, *Op. Cit.,* p. 96.

سەرەتایی ترین شوێنەوارەکانی ناوی کەسیی خوری لە بەڵگەنامە نووسراوەکانی مێسۆپۆتامیادا تێبینی دەکرێن. ناوی وەک *'داخیش-ئەتال'* 'Dahiš-atal *'* کە پادشای *ئەزوخینوم* 'Azuhinum بووە و نەرام-سین بە دیلی گرتووە،[١٦٣] *'پوتتیم-ئەتال* 'Puttim-atal پادشای ســـ/شیموررروم، کە یەکێک لە یاخییەکانی دژی نەرام-سین بووە،[١٦٤] و بە پێی گێلب Gelb، چەند ناوێکی کەسیی لە گاسور یش (سەردەمی ئەکەدی) هەر خوری بوون.[١٦٥] بەڵام هەندێک لە توێژەران باوەڕیان وایە بوونی خورییەکان لە مێسۆپۆتامیادا هێشتا لەمەش کۆنتر بێت، ووشەی سومەری 'ti/abira' کە واتای "مزگەر"ە، بە گوێرەی ئەمان ووشەیەکی بە بنەچە خورییە،[١٦٦] و بەم جۆرە شاری *'باد-تیبیرا* 'Bad-tibira ی سومەری کە شاری بەناوبانگی پێش لافاو بووە، ناوەکەی بە بنەچە خورییە. لەسەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئوردا، بڵاوبوونەوە و دەستەڵات پەیداکردنی خورییەکان لە کوردستان دا و تەنانەت لەدەرەوەیشی دا بەئاکام گەیشت، زۆربەی *ئێنسی* ensi یەکان و دەستەڵات دارەکانی ئەم ناوچانە ناوی خورییان هەبوو،[١٦٧] پاش ئەمەش پەل کێشانیان هەر بەردەوام بوو تاوەکو لە سەدەکانی

---

[163] بۆ دەقی ئەو لەوحەی ئەم ڕووداوەی تێدا تۆمار کراوە، بڕوانە:

Foster, *ASJ*, p. 23.

وادەردەکەوێت دوو شوێن بەهەمان ناوی ئەزوخینوم هەبووبن؛ یەکێکیان لەباکوورترەوە لە ناوچەی خابور و ئەوی تریان لەباشوور لە ناوچەی ئەڕڕاپخا. ئەمەی دواییان بە شێوەی *ئەرزوخینوم* 'Arzuhinum یش ناوی هاتووە. سەبارەت بە شوێنی هەردوو ئەزوخینوم بڕوانە:

Steinkeller, *Urkesh and the Hurrians*, p. 92, note 61.

بۆ زانیاری ووردی زیاتریش بڕوانە:

Salvini, M., "The Earliest Evidences of the Hurrians Before the Formation of the Reign of Mittanni," *Urkesh and the Hurrians*, p. 100-102.

[164] Grayson, A. K. and E. Sollberger, "L'insurrection Générale Contre Naram-Suen," *RA* 70 (1976), p. 112, G l. 29.

[165] Gelb, *HS*, p. 52-53.

[166] Wegner, I., *Einführung in die hurritische Sprache*, Wiesbaden, 2000, p. 15.

[167] بۆ ئەمە، بڕوانە:

Astour, *SCCNH* Vol. 2, p. 15.

پاشتردا بە سەرکردایەتی پادشا چالاکەکانیان گەیشتنە باکوری سوریا و ئاسیای پچووک و ڕۆخی دەریای ناوەڕاست لە لوبنان و فەلەستینی ئێستا و بەم شێوەیە خوری‌یەکان توانیان لەئەنجامدا لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پ.ز. دا ئیمپراتۆری میتانی دابمەزرێنن.

**زمانیان:**

زمانی خوری لە ڕووی ڕێزمانەوە زمانێکی ئێرگاتیڤە.[١٦٨] بۆ نووسین، خوری‌یەکان خەتی مێخی‌یان بەکارهێناوە و بۆ ئەمەش گۆڕانکاری‌یان بەسەریدا هێناوە تاوەکو لەگەڵ دەنگەکانی زمانی خوری‌دا بگونجێت و لەهەمان کاتیشدا خەتەکەیان ساکارتر کردووە بە کەم کردنەوەی نیشانەکانی بۆ ٧٨ نیشانە و ژمارەیەکی زۆر کەم لۆگۆگرام[١٦٩] و نیشانەی پێناسین.[١٧٠] فرمان لە ڕەگێک و زنجیرەیەک پاشگر پێک دێت کە دەمەکانی

---

[168]واتە لەو زمانانەی کە حاڵەتێکی ڕێزمانی‌یان هەیە تیایاندا بکەری فرمانی ترانزیتیڤ دەردەخات و ئاماژە بۆ بوونی دەکات. نمونەی ئەم زمانانە لەمڕۆی ئێستادا زمانی باسک و زمانی گورجی (جۆرجی)، لە زمانە کۆنەکانیشدا خوری و سومەری. بۆ نمونە لەسومەریدا (e-) یەک لە پاش بکەرەوە پاشگری ئێرگاتیڤ دەنوێنێت. بۆ زانیاری زیاتریش، بڕوانە باسەکەمان لە گۆڤاری هەزارمێرد دا بە ناونیشانی "پێشەکی‌یەک بۆ زمانی خوری."

[169] Speiser, E. A., "Introduction to Hurrian," *AASOR* (1941), p. 11.

بەگوێرەی شپایزەر جیاکەرەوە سەرەکی‌یەکانی شێوازی نورسینی خوری دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمانی ئاشوریی کۆن، بڕوانە:

*Op. Cit.*, p. 13.

logogram= ئەو نیشانەیەی بە تەنها ووشەیەکە.

[170]بەگوێرەی دەقی بەناوبانگی 'نامەی میتانی،' بڕوانە:

Bush, F., *A Grammar of the Hurrian Language* (A dissertation presented to the Faculty of the Graduate School of Arts and Sciences, Brandies University, Department of Mediterranean Studies), Brandies, 1964, p. 20-21.

determinative= ئەو نیشانانەن کە دەخرێنە پێش یان پاش ناوەوە بۆ دیاری کردنی جۆرەکەی، ئایا ناوی شوێنە یان کەسە یان ئاژەڵە یان کەل و پەلە و بەم جۆرە.

فرمانەکە و بارەکەی (cases) و ڕاناوە پاشگرییەکان دیاری دەکەن.[171]

دەقی نووسراو بە زمانی خوری لە زۆر شوێنەواری ڕۆژهەڵاتی نزیک دا دۆزراونەتەوە، نامەکەی ئەرشیفی 'تەل العمارنە' ی میسر کە بە 'نامەی میتانی'ش ناسراوە بە زمانی خوری نوسراوە و پادشای میتانی *توشراتتا Tušratta* بۆ پادشای میسری ناردووە، ئێستا یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکانی لێکۆڵینەوەی ئەم زمانە و درێژترین دەقی خورییە کە تائێستا بەدەست گەیشتووە. هەندێک دەقی تری خوری لە ئوگاریت (راس الشمرا لە باکوری سوریا) و براک لە خابور[172]و دەقی جووت زمانی زۆر گرنگی خوری بە هیتی لە *خاتوششا* (ناوەڕاستی ئەنەدۆڵ) دۆزراونەتەوە، کە زانیاری بەکەڵکی زۆریان لەبارەی خورییەوە تێدایە.[173] نووسینەکەی پادشای خوری *تیش-ئەتال Tiš-atal*،[174] کۆمەڵە دەقی پچووک و پارچەی شکاوی لەوحی بەخوری نووسراوی تریش لەم چەند دەساڵەی دواییدا لە شوێنەوارەکانی لارسا و ماری و ئێمار و هەندێک لە شوێنەوارەکانی باشوری ئەنەدۆڵ دۆزراونەتەوە.[175] دەقەکانی *نوزی Nuzi* ش لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە (یۆرغان تەپە لە نزیک کەرکوک) زانیاری بەسوودیان لەبارەی زمانی

---

[171] Wegner, *Op. Cit.*, p. 45 ff.

بڕوانە هەروەها خشتە پەیوەندی دارەکانی ئەم بابەتە لە لاپەڕەکانی:

65; 69; 80; 82 and 86;
Speiser, Introduction…, p. 82 ff.

بابەتە بەبەهاکەی جیۆرجێریش لە بارەی پاشگرە خورییەکانەوە زانیاری وورد و بەنرخی لەم بوارەدا تێدایە:

Giorgeri, M., "Die hurritischen Kasusendungen," *SCCNH* 10, 1999, 223-256.
[172] Wegner, p. 25.
[173] Wegner, p. 24.

[174] بۆ نوێترین لێکۆڵینەوە لەبارەی ئەم نووسینەوە، بڕوانە:

Wilhelm, G., "Die Inschrift des Tišatal von Urkeš," *Urkesh and the Hurrians, Bibliotheca Orientalis,* Vol. 26, Malibu, 1998, pp.117-143.

[175] بڕوانە:

Wegner, pp. 18-23.

خوری‌یەوە بەدەستەوە داوە، هەرچەندە بە زمانی ئەکەدی نووسراون، بەلام کاریگەری زمانەوانیی خوری زۆریان پێوە دیارە، زۆر زاراوەو شێوازی دەربڕینیان تێدایە کە بۆ لێکۆڵینەوەی زمانەوانی خوری زۆر بەکەڵکن، سەرباری ژمارەیەکی زۆر ناوی کەسی و ناوی جوگرافی.[176] گرنگیی ووشەی خوری و ناوی کەسیی خوری کە لە دەقە ئەکەدی‌یەکانی شوێنەوارەکانی تری وەک 'کول تەپە' (*کانیش Kaniš* ی دێرین لە ناوەڕاستی ئەنەدۆڵ) و 'تەل سولەیمە' (لە ناوچەی حەمرین) و شوێنی تردا هاتوون، لەیاد نەکەین.[177]

**بلاوبونەوەیان:**

لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمەوە خوری‌یەکان کۆمەڵێک شانشینیان دامەزراند کە لە باکوری سوریاوە تا ڕۆژهەلاتی دیجلە و چیاکانی زاگرۆس درێژ دەبونەوە. ئەم شانشینانە ئەوانەی فەرمانڕەوایی‌یان دەکردن بەشی هەرە گەورەیان ناوی خوری‌یان هەبوو. شانشینەکەی *کواری Kuwari*' لە دەشتی ڕانیە و شانشینی '*تورووککو* 'Turukkû بە پادشایەتی '*تەلپوشەڕڕی Talpušarri*' ناوێک و '*ئیتابالخوم* 'Itabalḫum و هی تر،[178] تەنانەت لەوانەیە شانشینی '*شیکشاببوم Šikšabbum*'یش، هەموویان شانشینە خوری‌یەکانی ئەم سەردەمەی کوردستانی کۆن بوون. لە نزیکەی ۱۵۰۰ پ.ز.ەوە خوری‌یەکان بەسەرکردایەتی چینێکی فەرمانڕەوای هیندو-ئەورووپی، ئیمپراتۆری میتتانی‌یان دامەزراند کە هەموو سەرزەمینەکانی نێوان زاگرۆس و کەنارەکانی

---

[176] سەبارەت بە ناوە کەسی‌یەکان، بڕوانە:

Gelb, I. J., P. M. Purves and A. A. MacRae, *Nuzi Personal Names (NPN)*, Chicago, 1943.

[177] Wegner, p. 16.

[178] بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم شانشینە خوری‌یانەی ئەم سەردەمەوە، بڕوانە بەشی چوارەمی ئەم کتێبە.

دەریای ناوەڕاستی دەگرتەوە بە وولاتی ئاشوریشەوە. ئەم ئیمپراتۆرییە بەردەوام بوو هەتاوەکو لەژێر زەبری شالاوەکانی هیتتـــییەکان و ئاشورییەکاندا و گەندەڵ بوون و لێک هەڵوەشانی ناوخۆییدا لەبەر یەک هەڵوەشا و ڕووخا. ئەو دەوڵەتە بەرفراوانەی میتتانی پووکایەوە و دەوڵەتێکی پچووکی لە ناوچەی سەرووی خابور لێ مایەوە پێی دەووترا 'خانیگالبات *Hanigalbat*.' پادشایانی ئەم سەردەمەی ئاشور؛ *ئەدەد-نیراری* یەکەم (١٣٠٧- ١٢٧٥ پ.ز.) و *شەلمانیسەری* یەکەم (١٢٧٤- ١٢٤٥ پ.ز.) و *توکولتی- نینورتای* یەکەم (١٢٤٤- ١٢٠٨ پ.ز.) بەشی هەرە گەورەی توانای سەربازیی خۆیان بۆ دژایەتی و جەنگان لەدژی خانیگالبات تەرخان کرد تاوەکو لەسەردەمی توکولتی-نینورتا دا ئەویش ڕووخا.[١٧٩] بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، وادیارە خورییەکان توانیویانە تا ماوەیەکی درێژتر لە دوای ئەم ڕووداوانەش دەستەڵاتی سیاسیی خۆیان لە ڕۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ (کوردستانی ژێر دەستی تورکیا) بپارێزن، ئەمەش لە چەند میرنشین و شانشینێکی پچووک دا ڕەنگی دابووەوە کە لە ساڵنامە ئاشورییەکانەوە شتێک لەبارەیانەوە دەزانین. ئەم ساڵنامانە باسی پێک هێنانی بەرەیەکی خوریی بەرفراوان دەکەن بەسەرکردایەتی پادشای *ئەلزی* '*Alzi* کە ناوی *ئێخلی-تێشوپ* *Ehli-Teššup*' بووە بۆ سەندنەوەی خانیگالبات لەدەست ئاشورییەکان. لەسەدەکانی دواتردا، خورییەکان بەگشتی لە ناوچەکەدا بەرە بەرە بەرەو توانەوە و نەمان دەچوون، هەروەها لەکوردستانیشدا. ئەمەش بەشێکی لەئەنجامی لەشکرکێشییە یەک لەدوای یەکەکانی ئاشورییەکان بوو لە دژیان و بەشی گەورەشی لە ئەنجامی کۆچ هێنانی نەتەوەی نوێ (هیندو-ئێرانییەکان) بۆ ناوچەکە. بەڵام سەرباری ئەمەش، خەڵکانی خوری تاوەکو سەردەمی ئاشوری نوێ و تەنانەت تا ڕووخانی دەوڵەتی ئاشوریش لە

---

[179] بۆ زانیاری وورد و بەبەڵگەی نووسراوەوە سەبارەت بە شەڕەکانی ئەم پادشا ئاشورییانە لە دژی خانیگالبات، بڕوانە دکتۆرانامە بە بڕشتەکەی حەڕراق:

Harrak, A., *Assyria and Hanigalbat,* Texte und Studien zur Orientalistik, Zürich, 1987.

ناوچەکانی باشور و باشوری ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی وان هەر مابوون، با بە ژمارەی کەم و گرووپی پچووک پچووکیش بوو بێتن. بەڵگە بۆ ئەمە ئەو ناوە خوری‌یانەیە کە نووسەرە ئاشوری‌یەکان لەباسی ئەم ناوچەیەدا تۆماریان کردووە، نیشانەی ئەوەی کە زمانی خوری تا ئەو سەردەمەش لەو دەوروبەرەدا زمانی ئاخاوتن بووە.[180]

**ئایینیان:**

پانتیۆنی[181] خوری لە ژمارەیەکی گەورەی خواوەندان پێک دەهات، سالاریان و پادشای هەموو خواوەندانیان تێشوپ *Teššup*ی خواوەندی باوباران بووە کە مەڵبەندی پەرستنی لە کومێ *Kumme* بووە. خواوەندانی تر شاوشکا *Šauška* (هاوتای ئیشتار)، کە بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە زۆر جێگای ڕێزو وبەرز نرخاندن بووە و مەڵبەندی پەرستنی لە نینەوا بووە؛ کوماربی *Kumarbi* و خێپات *Ḫepat* کە زیاتر لە باکوری سوریا باویان هەبوو؛ نوپاتیک *Nupatik* (یان لوبادا‌گا *Lubadaga* ی نووسینەکەی تیش-ئەتال)؛ شیمیکێ/ــا *Šimike/a*ی خواوەندی خۆر؛ کوشو/ــاخ *Kušu/aḫ* خواوەندی مانگ؛ و هی تر.[182] بێگومان خوری‌یەکان خواوەندی تریان لە نەتەوەکانی تری دراوسێ و بوومی وولاتەکەش وەرگرتووە و خستویاننەتە سەر پانتیۆنەکەی خۆیان[183] یان لەگەڵ خواوەندە هاوتاکانی خۆیاندا یەکیان هێناونەتەوە. یەکێک لەمانە نێر(یــ)گال *Ner(i)gal* ە کە بە "پادشای خاویلوم *Ḫawilum* ناوزەد کراوە و دوو نووسینــی بنکاری[184] زۆر گرنگــی بۆ نووســراوە

[180] Wilhelm, p. 41.

[181] Pantheon = کۆمەڵەی یاخود ئەنجومەنی خواوەندانی نەتەوەیەک یان وولاتێک یان شارێک.

[182] Wilhelm, p. 49 ff.

[183] Speiser, *Oriental and Biblical Studies*, p. 249.

[184] ئەو نووسینانەیە کە لەسەر لەوح یان بت، شەش لا، ئەستون یان لەوحی تری شێوە جیاواز بەبۆنەی بنیات نان یان نۆژەن کردنەوەی پەرستگاو کۆشک و شورای شارەوە دەنووسران و دەخرانە ژێر بناغەکانیانەوە یان ژێر گرێژەنەی دەرگاکانیانەوە بۆ پاراستنی ناوی بنیات نەر و مێژووەکەی و بۆ کێ و

شێوەی ژمارە ٢: جیَ مۆرێک کە ناوی ئیتخی-تێششوپ ی پادشای ئەڕڕاپخای لەسەر نووسراوە و وێنە و دروشمی چەندین خواوەندی خوریی لەسەر هەڵکەندراوە. سەرچاوە:

Diana L. Stein, "Mytologische Inhalte der Nuzi-Glyptiek," *Hurriter und Hurritisch: Konstanzer Altorientalische Symposien-* Band II, Herausgegeben von Volkert Haas, Konstanz, 1988.

---

بۆ چی. هەروەها بەم جۆرە بیناکە پێشکەش بە خواوەندی مەبەست دەکرا و لەلایەنیەوە دەپارێزرا. بەم شتە نووسراوانە دەووترێت Foundation Deposits و دکتۆرا نامەکەی ئێللیس بە ووردی لەبارەیانەوەی نوسیود:

Elllis, R. S., *Foundation Deposits in Ancient Mesopotamia,* New Haven, 1968.

وتەرخان کراوە.[١٨٥] نێر(ی)گال لە کوردستای کۆن دا، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە، لەپاڵ شاوشکا و تێشوپ دا زۆر برەوی هەبووە و لە مەڵبەندی تری وەک ئەزوخینوم و ئەڕاپخا و *کورڕوخانی Kurriḫani*[١٨٦] (تەل الفەخار، لە باشوری کەرکوک)یشدا دەپەرستران، سەرباری پێک هێنانی بەشی تیۆفۆریی زۆر ناوی کەسی. تێبینی ئەوەش دەکرێت کە جۆرێک جیاکردنەوە ودابەش کردن لە نێوان پانتیۆنی خوری لە ڕۆژئاوا، لە باکوری سوریا و کەناری دەریای ناوەڕاست و، لەنێوان پانتیۆنی ڕۆژهەڵات لە نوزی و مەڵبەندەکانی تری ڕۆژهەڵاتی دیجلە دا، هەبووە.[١٨٧]

[185] Thureau-Dangin, F., “Tablette de Samarra,” *RA* 9 (1912), No. 1, p. 1-4; Wilhelm, p. 9; 11; 54.
[186] Wilhelm, p. 54.

[187] دەربارەی ئەمە،بڕوانە:

Wilhelm, p. 55ff.

هەروەها:

Salvini, *Op. Cit.,* 99ff.

کوردستانی ناوەڕاست لە کۆنترین ڕۆژگارەکانییەوە

تا ڕمانی بنەماڵەی سێ یەمی ئور

## پێش مێژوو:

مرۆڤی پێش مێژوو لە بەرەبەیانی مێژووەوە لەدۆڵەکانی ئەم وولاتەدا ژیاوە و ئەشکەوتەکانی کردووەتە یەکەمین پەناگاو شوێنی نیشتەجێ بوونی. کۆنترین شوێنەوارەکانی بوونی مرۆڤ لەم ناوچەیەدا بریتین لەو ئامرازە بەردینە هەرە کۆنانەی بە (Pebble Tools) ناسراون کە لە شکاندنی پەڵ و چەوی درشت دروست کراون. ئەم جۆرە ئامرازانە لە دۆڵی دیجلەی سەروو لە باکوری موسڵ دۆزراونەتەوە و مێژوویان بۆ

سەردەمی ئاشولی سەروو (Upper Acheulaean) دەگەڕێتەوە،[1] کە بە واتا فراوانەکەی نزیکەی ٥٠٠,٠٠٠-١١٠,٠٠٠ ساڵێک پێش ئێستا بووە (دوا کەرتی پالیۆلیتیی خواروو Lower Palaeolithic). لە '**بەردەبەلکە**'ش، کە شوێنەوارێکی کراوەیە لە نزیک چەمچەماڵ، لە نێوان سلێمانی و کەرکوک دا، ئامرازی بەردینی لە هەمان جۆری 'Pebble Tools' دۆزراونەتەوە کە مێژوویان بۆ سەردەمانی ئاشولی-تایسی- موستیری Acheulaean- Taycian- Mousterian (نزیکەی ٨٠,٠٠٠ ساڵ پێش ئێستا) دەگەڕێتەوە[2] (شێوەی ژ. ٣). لە دۆزراوە گرنگەکانی بەردەبەلکە، پاشماوەی ئاژەڵی وەک فیلی هیندی و راینۆسێرۆس Rhinoceros و ڕەشەووڵاخی گەورەو لەوانەیە *Bos Primigenius* و تەنانەت ئۆناگەری جۆری *Equus hemionus* یش.[3] شوێنەواری تری ئەم سەردەمە کە ژمارەیان دەوری ٢٢ دەبێت، لە دۆڵی سەرووی دیجلە لە باکوری موسڵەوە دۆزراونەتەوە و دەست نیشان کراون، بەزۆری لە کاتی پشکنین و پێماڵەکانی (=survey) پێش بنیات نانی بەستی موسڵ لە هەرێمەکەدا.[4] لە '**هەزارمێرد**،' ئەشکەوتەکەی زنجیرەی بەرانان بەرامبەر شاری سلێمانی، خاتوو دۆرۆثي گارۆد ئامرازو ئێسکی مرۆڤی دۆزییەوە کە مێژوویان بۆ فەرهەنگێکی بەردینی تێکەڵ لە لیڤالوازی-موستیری Levalloiso-Mousterian (دەوروبەری ٥٠,٠٠٠ساڵ پێش ئێستا)

---

[1] Inizan, M. I., "Des indices acheuléen sur les bordes du Tigre, dans le nord de l'Iraq," *Paléorient,* XI, 1 (1985), p. 101-102.

[2] Wright, H. E. and B. Howe, "Preliminary Report on Soundings at Barda Balka," *Sumer* VII (1951), p.109.

[3] Matthews, R., The Early Prehistory of Mesopotamia 500,000 to 4,500 bc, *Subartu* V (2000), p. 14.

ئۆناگەر Onager کەری کێوییە و لە کاتی خۆیدا زۆر ڕاوکراوە و لەناوچەکانی کوردستان دا زۆر هەبووە. لە شارۆچکەی کوڕڕوخانی ی خورییەکان (تل الفخار لە باشوری کەرکوکەوە) ئێسکە پەیکەری یەکێک لەم کەرە کێوییانە دۆزراوەتەوە. لە عەرەبیدا بە 'الحمار الاخدر' ناسراوە.

[4] *Op. Cit.*, p. 13-14.

دەگەڕێتەوە.[5] خۆراکی دانیشتوانەکەی، هەروەک ئێسک و پروسکی دۆزراوەی ئەشکەوتەکە دەری دەخەن، بریتی بووە لە ئاژەڵ و گیانداری وەک بزنە کێوی، وورچی سوور، ئاسک، مشکی دەردوە (Field mouse)، جرج، مشکە کوێرە، کەروێشکی کێوی، شەمشەمە کوێرە، هێلکە شەیتانۆکە و هی تر کە تێکەڵەیەکن لە ئاژەڵ و

شێوەی ژمارە ٣: ئامرازی لە پەڵ و چەو دروست کراوی بەردە بەلکە، سەرچاوە:

Howe and Braidwood.

[5]Garrod, D. A. E., "Primitive Man in Egypt, Western Asia and Europe in Palaeolithic Times," *CAH* I, part 1, Cambridge, 1970, p. 87.

ئەنجامەکانی کنە و پشکنینەکانی لەم سەرچاوەیەدا بلاو کردووەتەوە:

Garrod, D. A. E., "The Palaeolithic of Southern Kurdistan: Excavations in the Caves of Zarzi and Hazar Merd," *Bulletin o f American School of Prehistoric Research,* VI (1930).

گیانداری نزار و دەوەن و پووشەڵانی وەک دەوروبەرەکەی ئێستای.[6] ئەشکەوتی گەورەی 'شانیدار' لە چیای برادۆست لە پارێزگای هەولێر (وێنەی ٢)، بە چوار چینە سەرەکی‌یەکەیەوە یەکێک لە گرنگترین شوێنەوارەکانی ئەم سەردەمەیە لە ناوچەکەدا. ڕالف سۆلێکی R. Solecki کە لە ساڵانی پەنجاکادا تیایدا دەستی کردە کنە کردن؛[7] تێکەڵەیەک لە ئێسک و خۆڵەمێش و ئامرازی بەردینی لە یەکەم چینی ئەشکەوتەکەدا (چینی D)، کە کۆنترین چینێتی و بۆ سەردەمی پالیۆلیتی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە، دۆزی‌یەوە. سۆلێکی لەو باوەڕەدایە کە کۆنترین نیشتەجێ بوون لە ئەشکەوتەکەدا ١٠٠,٠٠٠ ساڵێک لەمەوبەر بووە و نزیکەی ٣٠٠٠ پشت یەک لەدوای یەک تیایدا ژیاون.[8] بەڵام لەمانە سەرنج ڕاکێشتر، ئەو نۆ ئێسکەپەیکەرە مرۆیی‌یە بوون کە توانرا دەست نیشان بکرێت لە مرۆڤی جۆری 'نیاندرتال 'Neanderthal'ن. ئەم ئێسکەپەیکەرانە "یەکێک لە شوێنەوارە مرۆیی‌یە هەرە بە بڕشت و زانیاری بەخشەکانی سەردەمی پالیۆلیتی ناوەڕاستی هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێک دەهێنن."[9] کۆمەڵی ئێسکەپەیکەرەکان بریتین لە ئێسکی حەوت هەراش و دوو منداڵ، مێژوویان بە پێی شیکاری ڕادیۆکاربۆنی ١٤ و بەراوردکاری چینەکان بۆ ماوەیەک دەگەڕێتەوە کە لە ٧٠,٠٠٠ەوە تا ٤٦,٠٠٠ ساڵ پێش ئێستای خایاندووە.[10] وەک دەردەکەوێت،

---

[6]Matthews, *Op. Cit.*, p. 18.
[7] Lloyd, Seton, *The Archaeology of Mesopotamia-From the Old Stone Age to the Persian Conquest,* London, 1985 (revised edition), p.24.
[8]Solecki, R., "Shanidar Cave," *Old World Archaeology: Foundations of Civilization,* San Françisco, 1972, p. 43.

هەروەها بڕوانە:

Matthews, *Op. Cit.*, p. 17.
[9] Matthews, *Op. Cit.*, p. 18.
[10] Solecki, R. S., "Two Neanderthal Skeletons From Shanidār Cave," *Sumer* XIII, part 1&2 (1975), p. 59-60;

هەروەها بڕوانە:

Solecki, "Shanidār Cave," *Op. Cit.*, p. 47.

یەکێک لەم مردووانە لە مردن و ناشتنی دا بە دانانی تاجە گوڵینەیەک لەسەر لاشەکەی ڕێزی لێ نراوە[11] و بەمەش نیاندرتاڵەکانی شانیدار یەکەمین خەڵکێکن لە مێژوودا کە گوڵیان بۆ ڕێزلێنان بەکارهێناوە. بە گەرکی گوڵەکاندا دەرکـــەوتووە کە ئەو کەسە لە

وێنەی ژمارە ٢: ئەشکەوتی شانیدار لە ناوەوە لە کاتی کنە دا. سەرچاوە:
J. McIntosh, *Archeologisch Handboek,* Veenendaal, 1987.

---

لێکۆڵینەوەی زیاتر لەبارەی ئەم ئێسکەپەیکەرانەوە زۆرن، لەمانەدا دەبینرێن:

Stewart, T. D., *Sumer*, Vols. XIV (1958); XVII (1961); XIX, (1963) and Stewart and Trinkaus XXXVI (1980) and Solecki, Vols. XIII (1957); XVII (1961) and Trinkaus, Vol. XXXIII (1977)

و هی تر.

[11] جواد، د. عبد الجليل، "النياندرتاليون وتراثهم الثقافي،" سومر ٢٧، الجزء ١ و ٢(١٩٧١)، ص. ٣٠–٣١.

بەهارێکی درەنگدا مرووە، چونکە گەرکەکەی هی جۆرە گوڵێکن کە تا ئێستاش لەو ماوەیەدا لە دەوروپشتی برادۆست شین دەبن. یەکێکی تر لە ئێسکەپەیکەرەکان هی کەسێکی ترە کە دیارە کەم ئەندام بووە بەڵام ئەندامانی خێزانەکەی کە لەگەڵی ژیاون سەردەمانێکی دوور و درێژ خزمەتیان کردووە و ئاگاداری‌یان کردووە.[12] چینەکانی دواتری ئەشکەوتەکە بەڵگەی بەبایەخی تریان بە کۆنەناسان بەخشی، لەوانە بەڵگەی بوونی "فەرهەنگی ئەورگنیشی Aurignacian Culture" (چینی C) کە تیایدا جۆرێک لە ئامراز سازی ی خۆماڵی دەست نیشان کرا، سۆلێکی بە ناوی چیای برادۆستەوە ناوی نا 'ئامراز سازیی برادۆستی Bradostian Industry.'[13]

بەشەکانی سەرەوەی شانیدار (چینی B1) فەرهەنــگی مێسۆلیــتی Mesolithic Culture پیشان دەدەن و لە نزیکەی ١٠,٠٠٠-٩,٠٠٠ پ.ز. دەگرێتەوە. جگە لە شانیدار (چینیB1) ، لە ئەشکەوتی **'زەرزی'** ش لە باکوری رۆژئاوای سلێمانی جۆرێک ئامرازسازیی خۆماڵی دۆزرایەوە کە لەناوچەکەیدا تاکە، گارۆد فەرهەنگی ئەم ئامرازسازی‌یەی ناونا 'فەرهەنگی زەرزی Zarzian Culture.'[14] شوێنەوارێکی تر کە پێی دەووترێت **'زەوی چەمی شانیدار،'** نشینگەیەکی پچووکی سەر رۆخی رۆژهەڵاتی زێ ی سەرووە، رووبەرەکەی ٢٧٥ ×٢١٥مەترە و نزیک ئەشکەوتی شانیدارە،[15] لە کنە و پشکنینی دا جگە لە زۆر ئامرازی بەردین، دیوارێکی کەوانەییشی تیادا دۆزراوەتەوە کە لە بەرد و تاوێری چەم بنیات نراوە.[16] وا پێ دەچێت ئەم بەشە دیوارە بۆ راگرتنی

---

[12] *Ibid.*

[13] Solecki, "Shanidār Cave," *Old World Archaeology*, p. 45; Garrod, *Op. Cit.*, p.87.

[14] Lloyd, *Op. Cit.*, p. 23; Mellaart, J., *Earliest Civilizations of the Near East*, London, 1965, p. 16.

[15] Solecki, R., *An Early Village Site at Zawi Chemi Shanidar*, Malibu, 1980, p. 1.

[16] بەرای ماثیوس ئەمە پاشماوەی بینایەکی بازنەیی تیرە نزیک بە دوو مەتر بووە، بروانە:

Matthews, *Op. Cit.*, p. 33.

سەری کولێتێک یان دەوارێک بوو بێت کە دەشێت بە کۆنترین بینایەک لەقەڵەم بدرێت کە مرۆڤ لەهەموو ناوچەکەدا بنیاتی ناوە.[17] وا دیارە دانیشتوانی ئەشکەوتی شانیدار بەشێکی ساڵەکەیان -لەوانەیە هاوینان- لێرەدا بەسەر بردبێت، تاوەکو نزیکی ڕوبارەکە بن هەم بۆ پێویستیی ئاوی خۆیان و هەم بۆ چنینەوەی خۆراک و ڕاوی گیانداری ڕوبارەکەو لە هەمان کاتیشدا بۆ ئاسانکاری ڕاوی ئەو ئاژەڵ و گیاندارانەی بۆ ئاو ڕوویان لە ڕوبارەکە کردووە. شایانی باس کردنە کە لە زەوی چەمی شانیداریش ئێسکەپەیکەری هەشت کەسی هەراش دۆزراونەتەوە و هەریەکێکیان ئێسکەپەیکەری منداڵێکیشی لەگەڵدایە کە وا پێ دەچێت کردارێکی پەیوەندی دار بە بیروباوەڕ و نەریتەوە هەبوو بێت.[18] بە پێی شیکاری کاربۆن ١٤ پێ دەچێت نیشتەجێ بوون لەم شوێنەدا لە دەورو بەری ٨٩٢٠ ± ٣٠٠ پ.ز. دەستی پێ کردبێت و نزیکەی هەزارەیەک درێژەی کێشابێت.[19]

دوو شوێنەواری تری هەمان سەردەم **'کەریم شاهر(کەریم شایەر؟)'** و **'موعەلەفات'**ن؛ یەکەمیان ١٠کم لە ڕۆژهەڵاتی چەمچەماڵەوەیە و لە یەک چینی نیشتەجێ بوون پێک هاتووە لە سەر ڕووبەرێکی کراوە. وادیارە کەریم شاهر خێوەتگای کۆمەڵێک خەڵکی نیمچە نیشتەجێ بووە.[20] چەند دەمەداسێکی بەردین و بووکەڵەی قوڕ و ئەڵقەی مەڕمەڕی و بازنگ و هەندێک پارچەی تر کە لەم شوێنەوارەدا دۆزراونەتەوە، هەموویان ئاماژە بۆ سەردەمێکی دواتر لە سەردەمی زەوی چەمی شانیدار دەکەن؛ سەردەمێکی

---

[17] *Op.Cit.*, p. 53.
[18] Mellaart, J., The *Neolithic of the Near East*, London, 1981, p. 72.

هەروەها بڕوانە:

Ferembach, D., "Étude Anthropologique des Ossements Humains Proto-Néolithique de Zawi Chemi Shanidār (Irak )," *Sumer* XXVI, part 1&2 (1970), p. 21-46.
[19] Mellaart, *The Neolithic of the Near East,* p 70.
[20] Braidwood and Howe, *Op.Cit.*, p. 52; 170.

نزیک لە ۸۰۰۰-٦٥۰۰ پ.ز.[٢١] شوێنەواری دووەمیان، واتە موعەلەفات، کە لەسەر ڕێگای نێوان هەولێرو موسڵە لە نزیک ڕوباری خازر، نیشتەگایەک بووە کە خانووەکانی بریتی بوون لە چاڵ لە زەوی دا — ئەم جۆرە خانووانە لە هەندێک ناوچەی کوردستانی ژێر دەستی ئێران دا هەبوون و پێیان دەووترا خازە، هەرچەندە لەوێ خانووەکان گەورەتر و ئاڵۆزترن- هەندێک لە خانووەکان بە دیواری بەردین دەورە دراون و زەوی ناو ماڵەکانیان چەوڕێژ کراون.[٢٢] پێویستە لێرەدا ئاماژەیەک بۆ ئەو هەندە پەرەسەندنەی لەم سەردەمەدا ڕوویان دا، بکەین، کە گرنگترینیان گواستنەوەی لەسەرخۆی تەرزی ژیان بوو بۆ تەرزی نیشتەجێ بوون و جێگیر بوون لە خێوەتگای وەرزیانەو تەنانەت لەوانەیە لە هەندێک شوێنیشدا، بۆ خێوەتگای هەمیشەیی. ئەم پەرەسەندنەو و هەندێک بەرەوپێش چوونی تر ڕچە شکێن و ڕێگا خۆشکەر بوون بۆ هەنگاوە هەرە گرنگ و مەزنەکەی کە مرۆڤایەتی نای: شۆڕشی نیۆلیتی (=چاخی بەردینی نوێ).

چاخی نیۆلیتی کە پاش مێسۆلیتی (=چاخی بەردینی ناوەڕاست) هات، دەشێت بە هەرە گرنگترینی چاخەکانی مێژووی کوردستان و تەنانەت جیهانیش بژمێردرێت. پەرەسەندنەکانی کە پاش فێربوون و دۆزینەوەی کشتوکاڵ و چاندن و ماڵی کردنی ئاژەڵ بە دوای یەکدا هاتن ئێگجار گرنگ و چارەنووس ساز بوون. بوونە هۆی هاتنە کایەی ژیانی جێگیر و دامەزراو، بنیات نانی یەکەمین خانووەکانی نیشتەجێ بوون و کۆکردنەوەیان لە خاڵێکدا کە واتای لەدایک بوونی یەکەمین گوند و سەرەتاکانی کۆمەڵگای مرۆیی بوو و، لەڕێی ئەمانەشەوە سەرهەڵدانی شار بە دامەزراوە ڕامیاری و کومەلایەتی و ئایینی و فەرهەنگیو ئابووری‌یە ئاڵۆزەکانیانەوە.

---

[21] Mellaart, *The Neolithic of....*, p. 74.
[22] *Ibid*, p. 50.

نەخشەی ژمارە ٤: شوێنەوارە سەرەکی‌یەکانی پێش مێژوو لە کوردستانی ناوەڕاست. سەرچاوە:
D. and J. Oates, *The Rise of Civilization.*

لە باشورەوە، لە نزیک شاری چەمچەماڵەوە کە ئاماژەی بۆ کرا، گوندی نیۆلیتی ی گرنگی **'چەرمۆ'**٢٣، هەیە (مێژووەکەی نزیکەی ٦٧٥٠ پ.ز. ە)٢٤ کە ڕۆبەرت

---

[23]جێگای خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بکەین بۆ ناوی ڕاستی ئەم شوێنەوارە کە 'چەرمۆ' یە و بە کوردی واتای 'سپی' دەبەخشێت و وەسفی شوێنەوارەکەیە کە بریتی‌یە لە بەرزایی‌یەک کە پێ ی دەووترێت 'قەڵای چەرمۆ.' ئاشکرایە ئەم هەڵەی نووسینی ناوە بە 'جەرمۆ' کە لە نووسین و کتێب و بڵاوکراوە بێگانەکاندا کراوە و لەڕێی ئەوانیشەوە دیسانەوە هاتووەتەوە ناو نووسین و کتێبە عەرەبی و کوردی‌یەکانەوە، لەوەوە هاتووە کە کاتێ خۆی تیپەکەی کنە و پشکنینی تیادا کرد، ناوەکەی لە

بڕەیدوود R. Braidwood لە ١٩٤٨ ەوە تیایدا دەستی کردە کنەکاری (وێنەی ژ. ٣ و ٤). چەرمۆ بریتیە لە شوێنەوارێکی نزیکەی ١,٢١٥ هێکتاری، گوندێکی ٢٠-٣٠ ماڵیی ژوور چوارگۆشەیی کە لە قوڕی شێلراو (*pisé*) لەسەر بناغەی بەردین بنیات نراون. بڕەیدوود ژمارەی دانیشتوانەکەی بە دەوروبەری ١٥٠ کەسێک خەملاندووە کە بە درێژایی ساڵ لێی ژیاون. زۆر دۆزینەوەی گرنگ لە شوێنەوارەکەدا بەدەست هاتوون، وەک پاشماوەی دان و دانەوێڵەی کە چەرمۆیی‌یەکان چنیویانەتەوە یان چاندوویانە (وێنەی ژ. ٥) و ئێسکی ئاژەڵی کێوی و ماڵی کراو. بڕو ڕێژەی ئەم ئێسکانە زیاد بوونێکی بەردەوام لە ڕێژەی ئاژەڵی ماڵی کراو و بەرهەم هێنانی کشتوکاڵی بە درێژایی تەمەنی گوندەکە پیشان دەدەن. هەرچەندە دەفرو ئامانی بەردین لە چەرمۆ هەبووە، بەڵام لە کۆی ئەو شانزدە چینەی گوندەکە پێک دەهێنن، یانزدەی ژێرەوەیان هی سەردەمی پێش گلێنەن Pre-pottery کە بەشی کۆنی چاخی نیۆلیتیە. گلێنە تەنها لە پێنج چینی سەرەوەیدا دۆزراونەتەوە و بریتین لە جۆرێکی دەستیی دیوار ئەستووری زبر[٢٥] (وێنەی ژ. ٦). بڕەیدوود لە ڕێی تێبینیی ووردو لێکۆڵینەوەی پاشماوەی دانەوێڵەو ئێسکی ئاژەڵی شوێنەوارەکەوە توانی بەدوای بەرەوپێش چوون و پەرەسەندنی ئاژەڵداری و کشتوکاڵ لە چەرمۆدا بچێت. تێبینیی کرد کە بە درێژایی ٤-٥ سەدەی ئاوەدانیی گوندەکە ڕێژەی ئێسکی ئاژەڵی کێوی لە کەمبوونەوەیەکی لەسەرخۆ، بەڵام بەردەوام دا بووە، لە جیاتیی، ڕێژەی ئێسکی ئاژەڵی ماڵی لە زیادبوون دا بووە. واتە، دانیشتوانی چەرمۆ ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر بەرەو جێگیر بوون و پشت بەستن بە بەرهەمی کشتوکاڵیی خۆیان و ئاژەڵی ماڵیی خۆیان بەستووە وەک لە ڕاو و چنینەوە، ئەمەش نیشانەی زیاتر شارستانی بوونە.

---

تۆمارەکانی دایەرەی گشتیی شوێنەواری عێراقەوە ڕونووس کردووەتەوە و لەوێشدا، لەبەر ئەوەی بە عەرەبی بووە، (چـ) یان بە (جـ) نووسیوە.

[24] Mellaart, *Earliest Civilizations of the Near East*, p. 51.

[25] Braidwood, R. and Howe, B., *Prehistoric Investigations in Iraqi Kurdistan*, Chicago, 1960, p. 64.

دۆزینەوەی سەرنج ڕاکێشی تر لە چەرمۆ داسی لە بەردە چەخماخ دروست کراون کە لە چەند پارچەیەکی تەڵەزم کراو پێک هاتوون و دیارە کاتی خۆی بە دەسکێکی دارەوە چەسپ کراون (وێنەی ژ. ٧). سوژنی لە ئێسک دروست کراو، بووکەڵەی قوڕینی مرۆڤ و ئاژەڵ،[٢٦] دۆڵ، دەسکەدۆڵ، گرێژەنەی بەردینی دەرگا، بازنگ، گەردانە و موورو و بڕێکی گرنگ دانەوێڵەی بە خەڵوز بوو کە بۆ لێکۆڵینەوەی ڕووەکی ناوچەکە لەو کاتەدا و جۆری خۆراکی دانیشتوانی چەرمۆ ماددەیەکی زۆر بەسوود بوون.[٢٧]

وێنەی ژمارە ٣: وێنەی گوندی چەرمۆ لە ئاسمانەوە گیراوە لە کاتی کنە کردنی دا.
سەرچاوە: Howe and Braidwood.

وێنەی ژمارە ٤: خانووەکانی چەرمۆ کە بە قوڕی شێلراو دروست کراون. سەرچاوە:
Howe and Braidwood.

---

[26] نزیکەی ٥٥٠٠ بووکەڵەیەکی لەم جۆرە لە شوێنەوارەکەدا دۆزراونەتەوە، بڕوانە:
Matthews, p. 45.

[27] Braidwood, R. and Howe, B., *Op. Cit.*, p. 44ff;
هەروەها بڕوانە:
Braidwood, R., "The Agricultural Revolution," *Old World Archaeology: Foundations of Civilization,* San Françisco, 1972, p. 75f.

گوندێکی نیۆلیتی تری هەمان چاخ و لەوانەشە کۆنتر، لە لایەن تیپێکی پۆڵەندی یەوە لە سالاّنی هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا دۆزرایەوە. ئەم گوندەیان لە شوێنەوارێکە ناوی 'نمریک' ە لە ناوچەی بەستی موسڵ. کۆنترین چینەکانی هی سەردەمی پێش گلێنەن و خانووەکانی ئەمیش لە قوڕی شێلراو بنیات نراون، ئێسکی ئاژەڵ و بووکەڵەی سەری باڵندەی[28] لەبەرد داتاشراوی تیادا دۆزراوەتەوە. جگە لەمەش ئامراز سازی‌یەکی بەردینی گرنگیش لە گوندەکەدا دەست نیشان کراوە.[29] لە سیما جیاکەرەوەکانی بیناسازیی ئەم گوندە خانووە بازنەیی و نیمچە لاکێشەیی‌یەکانیەتی کە هەندێکیان نزیکەی ٥م تیرەیانە.[30] خانووەکان لە قۆناغەکانی زووی دا لە قوڕێکی زەردباو دروست کراون و لە پاشتردا لە خشتی کاڵی درێژکۆڵەی لەم سەر و سەرەوە باریک (cigar-shaped) (٥٠سم)، دیوارەکانی سیواغ دراون و هەندێک جاریش ڕەنگ کراون، بانەکانی لەسەر پایە ڕاگیراون. هەندێک لە گۆڕەکان لە ناو گوندەکە خۆی دا و هەندێکی تریشی لە دەرەوەی هەڵکەندراون.[31]

قۆناغەکانی پاشتری پێش مێژووی کوردستان زنجیرەیەک چاک بوون و پەرەسەندنی بەرهەم هێنانی خۆراک و تەکنیکی گلێنەسازی و بەرەو پێش چوونی بیروباوەڕی ئایینی و بەکارهێنانی کانزایە. سێ فەرهەنگەکەی پاش ئەم سەردەمە دێن کە فەرهەنگەکانی 'حەسسونە Hassuna' و 'سامەڕا Samarra' و 'حەلەف Halaf'ن، بە تایبەتی باکوری مێسۆپۆتامیایان دادەپۆشی، کە دەکاتە بەشی زۆری سەرزەمینەکانی کوردستانی

[28]Cf. Matthews, p. 38-9.
[29] Kozowsky, S. K., A. Kempisty, K. Szymczak, R. Mazurowsky, A. Reiche, "Second Report on Excavations of the pre-Pottery Neolithic site Nimrik 9 in 1986, Saddam's Dam Salvage Project," *Sumer* XLVI, Part 1&2 (1989-90), p. 18.
[30]Matthews, p. 38.
[31]Kozowsky, S. K., A. Kempisty, K. Szymczak, R. Mazurowsky, A. Reiche, W. Borkowski, "A Preliminary Report on the Third Season 1987 of Polish Excavations at Nimrik 9/ Saddam's Dam Salvage Project." *Sumer* XLVI, Part 1&2 (1989-90), p. 24.

دێرین. بەڵام لەپاش حەلەفەوە، واتە لە سەردەمی فەرهەنگی 'عوبەید Ubaid'ەوە، ئیتر نیشتەگای مرۆڤ لە باشووریش بەدی دەکرێن.[٣٢]

وێنەی ژمارە ٥: هەندێک دانەوێڵەی بە خەڵوز بوو لە چەرمۆ. سەرچاوە: Howe and Braidwood

پاش سەردەمی چەرمۆ سەردەمی 'حەسسونە' (دەوروبەری ٥٨٠٠-٥٥٠٠ پ.ز.) دێت. لەم سەردەمەدا بنیات نانی خانوو بە قوڕی شێلراو لەسەر بناغەی بەردین بەردەوام بوو، ژمارەی ژوورەکان زیاد کران و زەویی ناوماڵەکانیان بە قوڕی تێکەڵ بە کاو گەچ سیواغ دەدران.[٣٣] دانەوێڵە، هەروەک لە چەرمۆ، لە کووپەی گەورەی لەقوڕی کاڵ

---

[32]شایانی ئاماژە بۆ کردنە کە لەم ساڵانەی دوایی دا هەندێک چینی کۆنتر لە سەردەمی عوبەید لە گردی 'تل العویلی' نزیک 'لارسا' لە لایەن تیپێکی کۆنەناسیی‌یانەی فەرەنسی‌یەوە دۆزراونەتەوە. ئەم چینانە ناونران Ubaid Zero و گڵێنەکانی لە هی سامەڕا دەچن، بۆ ئەمانە بڕوانە:
Hout, J.-L., “Un village de basse Mésopotamie: Tell el-‘Oueili à l’Obeid 4,” *Préhistoire de la Mésopotamie,* Paris, 1987,p. 293ff.
[33] Mellaart, *The Neolithic of....,* p. 146.

دروست کراودا هەڵدەگیرا و کووپەکان هەتا دەمەکانیان دەخرانە چاڵەوە. لەم سەردەمەشدا داسی بەردینیان بەکار دەهێنا، هەروەها ئامرازی تری بەردین و قوڕین دۆزراونەتەوە، وەک سەرە تەشی و دۆڵ و بووکەڵەی ژنی دانیشتوو. منداڵی مردوو لە کووپەڵەدا لەگەڵ هەندێک دەفرو ئامانی گڵێنەدا دەنێژران. چۆنایەتی گڵێنە لەم سەردەمەدا باشتر بوو و بەرەنگێکی بۆری پڕ ڕەنگ دەکرا و هەندێک جاریش ڕەنگیش دەکرا و خەتیشی تیادا هەڵدەکەندرا.[٣٤]

وێنەی ژمارەی ٦: گڵێنەی چەرمۆ. سەرچاوە:
Howe and Braidwood.

وێنەی ژمارە ٧: داسە بەردینەکەی چەرمۆ لە شوێنی خۆی دا. سەرچاوە:
Braidwood and others, *Prehistoric Archaeology along the Zagros Flanks,* Chicago, 1983.

---

[34] Lloyd, S. and Safar, F., “Tell Hassuna,” *JNES,* IV, No.2 (1945), p. 279-81.

هەروەها بڕوانە:

Dabbagh, T., “Hassuna Pottery,” *Sumer* XXI, part 1 &2 (1965), p. 93-111.

مۆتیفەکانی نیگارەکانی سەریان بریتی بوون لە هێڵی تەریب و ڕیزە سێگۆشەی تەنیشت یەک و شێوەی ئێسکەماسی (= ئەم مۆتیفە بە Herringbone ناسراوە و مەبەستی شێوەیەکە لە ئێسکی ماسیی جۆری هێرینگ دەچێت) کە زیاتر لە گوڵە گەنم و گوڵەجۆ دەچن. ئەو فەرهەنگەی ئەم گڵێنەیەی بەرهەم هێناوە وادیارە فەرهەنگێکی خۆماڵی بووە، بۆیە گڵێنەکانی تەنها لە شوێنەوارەکانی باکوری مێسۆپۆتامیادا دۆزراونەتەوە، بە تایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە، بەدرێژایی هێڵێک دابەش بووە کە لە شنگارەوە دەست پێدەکات و بە نینەوا (موسڵی ئێستا) و ڕەواندزدا تێ دەپەڕێت تا دەگاتە ناوچەی ورمێ. هەرچەندە گڵێنەی حەسسونە لە گردی شمشارەی سەر زێی خواروو (چینەکانی ٩-١٦)[٣٥] و هەندێکی تر لە شوێنەوارەکانی دەشتی ڕانیەش دۆزراونەتەوە، وەک لە گردی دێم[٣٦] و کەمەریان.[٣٧] بەڵام پێ دەچێت بوونی ئەم فەرهەنگە لە ناوچەکانی باشوری ئەو هێڵەوە لاوازتر بوبێت؛ وادیارە زێی خواروو سنووری باشوری بووە.[٣٨]

لە چینەکانی سەرەوەی زۆر لە نشینگەکانی سەردەمی حەسسونەدا، وەک حەسسونە و شمشارە و مەتتارە، جۆرێکی نوێی گڵێنە پەیدا دەبێت کە لەگەڵ گڵێنەی حەسسونەدا تێکەڵە. ئەم جۆرە گڵێنەیە بۆ یەکەم جار لە چینەکانی بنەوەی شوێنەواری سامەڕای پایتەختی جارانی عەبباسییەکاندا دۆزرایەوە، بۆیە پێی دەووترێت گڵێنەی **'سامەڕا'** و فەرهەنگەکەشی، فەرهەنگی سامەڕا (دەوروبەری ٥٦٠٠-٥٠٠٠پ.ز.). ئەم جۆرە

---

[35] Mortensen, P., *Tell Shemshara, The Hassuna Period,* København, 1970, p. 2.

[36] التكريتي، عبد القادر، "التنقيبات في تل الديم (دوكان)،" سومر ١٦، الجزءان الاول والثاني (١٩٦٠)، ص. ٩٥؛ ٩٦؛ هەروەها:

Es-Soof, B., "Uruk Pottery from the Dokan and Shahrazur Districts," *Sumer* XX, part 1&2 (1964), p. 39.

[37] Es-Soof, *Ibid.*

[38] Mellaart, *The Neolithic of the Near East,* p. 144;

هەروەها بڕوانە:

Mellaart, *Earliest Civilizations of the Near East,* p. 64.

گڵێنە نوێ یە کە وورده وورده جێی کۆنەکەی حەسسونەی گرتەوە،[٣٩] زیاتر بریتی‌یە لە لەگەنی گەورە و کووپە و دەفر، کە بە ڕەنگی سور و سەوزی پڕ یان مۆر نەخشی ئەندازەیی و شێوەی مرۆیێ و ڕووەکی ڕازێندراونەتەوە کە بەشێوازی هاوشێوەی بەرامبەر یەک (Symmetrical) و هاوسەنگ لەگەڵ یەک نەخشێندراون[٤٠] (وێنەی ژ. ٨).

شوێنەواری 'تل الصوان' لە کەناری ڕۆژهەڵاتی دیجلە لە باشوری سامەڕاوە شوێنەوارێکی نمونەیی ئەم فەرهەنگەیە، لەوێ خانوی گەورە گەورەی عەمباردار دۆزراونەتەوە کە هەموویان بە شورایەک و کەنداوێک (moat=) دەورە دراون.[٤١] بەکارهێنانی خشتی کاڵ لە بیناسازی ئەم سەردەمەدا جێگای سەرنجە.[٤٢] سەرباری ئەمەش، دانیشتوانی ئەم شوێنەوارە، هەروەک هاوچەرخەکانیان لە شوێنەوارە گرنگەکەی 'چۆغەمامی' لە نزیک مەندەلی، کۆنترین شێوازی زانراوی ئاودێری‌یان بەکارهێناوە بە

---

[39] بۆیە هەندێک فەرهەنگی سامەڕا بە حەسسونەیەکی پەرەسەندوی باشوری لە قەڵەم دەدەن نەک فەرهەنگێکی نوێ. بوونی شوێنەوارە گرنگەکانی سامەڕا لە باشورتری ئەوەکانی حەسسونەوە ئەم بڕوایەی پتەوتر کردووە، بۆ نمونە بڕوانە:

Forest, J.-D., *Mésopotamie, L'apparition de L'etat. VII$^e$-III$^e$ Millénaires*, Paris, 1996, p. 36.

[40] Lloyd and Safar, *Op. Cit.*, p. 281-3,

هەروەها:

Mellaart, *Earliest*....., p. 66.

[41] Matthews, p. 73-4.

[42] Mellaart, *The Neolithic of* ....., p. 150ff; Oates, D. and Oates, J., *The Rise of Civilization,* Lausanne, 1976, p. 64(لەگەڵ وێنەدا),

هەروەها بڕوانە:

Matthews, p. 73 ff.

سەبارەت بە دۆزراوەکانی تل الصوان یش، تەماشای ڕاپۆرتەکانی ئەنجامی کنەکاری‌یەکانی لە گۆڤاری سومر دا بکە: المجلد XIX(١٩٦٤)(بە عەرەبی)؛ XXI(١٩٦٥)؛ XXIII(١٩٦٧)؛ XXIV(١٩٦٨)؛ XXV(١٩٦٩)(بە عەرەبی)؛ XXVI(١٩٧٠)؛ XXVII(١٩٧١)؛ XXVIII(١٩٧٢)(بە عەرەبی).

هەڵکەندنی تۆڕێک جۆبار و جۆگا کە لە چۆغەمامی باشتر بەچاو جیا دەکرێتەوە.[٤٣] لەدۆزراوە بەرچاوەکانی هەردوو شوێنەوارەکەش ژمارەیەکی زۆر بووکەڵەی قوڕ (بە زۆری لە چۆغەمامی) و مەڕمەڕ (لە صوان)، کەبەشی هەرە زۆریان هی ئافرەتن، قوڕینەکانیان ڕەنگ کراون و مەڕمەڕەکانیان بە گوێچکەماسی و قیر ڕازێندراونەتەوە. گڵێنەی سەردەمی سامەڕرا لە گردی کەمەریانی دەشتی ڕانیەش دۆزراوەتەوە.[٤٤]

پەرەسەندن و تازەگەریی فەرهەنگی‌یانەی زۆر لە سەردەمی **'حەلەف'** (دەوروبەری ٥٥٠٠-٤٥٠٠پ.ز.)[٤٥] ی پاش سامەڕرا هاتنە کایەوە. خانوو هێشتا بە خشتی کاڵ و هەندێک جار بە قوڕی شێلراو بنیات دەنران و دیوارەکانیان بە گەچ سیواغ دەدران؛ بەلام بەگشتی پچووکتر بوون لە خانووەکانی سەردەمی پێشوو، هەروەک بەتایبەتی لە شوێنەواری 'ئەرپەچی‌یە' و 'تەپەگەورە'[٤٦] ی ڕۆژهەلات و باکوری ڕۆژهەلاتی موسڵ تێبینی دەکرێت. لە تازەگەری‌یەکانی ئەم فەرهەنگە داهێنانی تەرزێکی نوێی بیناسازی بوو کە وا پێ دەچێت خەڵکانی فەرهەنگی حەلەف، ئەگەر وەک هەندێک باوەڕیان وایە کۆچ هێنەر بووبێتن، لەگەڵ خۆیان هێنابێتیانە کوردستانی کۆنەوە. هەرچەندە زیاتر وا پێ دەچێت کە خەڵکی وولاتەکە خۆی بووبێتن و ئەو تازەگەری‌یانەش داهێنانی خۆیان بووبێت. تەرزی ئەم بیناسازی‌یە بریتی‌یە لە بینایەکی بازنەیی کە داڵانێکی لاکێشەیی پێوە

---

[43] Oates and Oates, *Ibid,*

هەروەها بڕوانە:

Mellaart, *The Neolithic of the Near East,* p. 155.

[44] Es-Soof, "Uruk Pottery from Dokan and Shahrazur Districts," p. 39.

[45] شایانی ووتنە کە هەندێک لێکۆڵینەوەی کاربۆنی ١٤ ای تیشکدار C14 ی دۆزراوەکانی شوێنەواری 'تل صبي ابیض ' لە سوریا مێژوویەکی کەمێک کۆنتری دەست پێکردنی حەلەفیان داوە؛ نزیکەی ٦١٠٠-٦٠٠٠ پ.ز.، بۆ ئەمە بڕوانە:

Forest, *Op. Cit.*, p. 27.

[46] Matthews, p. 85 and 88; Mellaart, *The Neolithic of......*, p. 159.

بووه (شێوەی ژ. ٤).

وێنەی ژمارە ٨: لەگەنێکی سەردەمی سامەڕا. سەرچاوە: Mallowan, *The Earliest...*

لەیەک چوونی ئەم جۆرە بینایانە لەگەڵ 'ثۆلۆس *Tholos*'ی مایکینیەکاندا وای کرد ئەمانیش لەلایەن کۆنەناسەکانەوە ناوی ثۆلۆیان لێ بنرێت. لەهەمان کات دا شایانی ئاماژە بۆ کردنە کە هەندێک لە گوندەکانی نزیک حەلەب خانووی لەم جۆرەیان تیادایە و بانەکانیشیان بە گومەز گیراوە. تیۆریی لەیەک جیاواز سەبارەت بە بەکارهێنانی ئەم بینایانە هەن، هەندێک لایان وایە پەرستگا بووبێتن و هەندێکی تر بە بینای گشتیی

گوندەکانی دەزانن و تەنانەت هەندێکی تر بە خانووی ئاسایشیان دەزانن. کەمیی کەلوپەلی دۆزراوەی ناویشیان ئەوەندەی تر کاری دیاری کردنی سروشتیانی بۆ کۆنەناسانی سەخت تر کردووە. هەرچۆنێک بێت، هەندێک لەم بینایانە قەبارەی ئاسایی‌یان هەیە و هەندێکی تریشیان گەورەن (یەکێکیان تیرەکەی ١٠مەترە) و بە لە ناوەوە بە تیغ بەشەکانیان تیادا جیاکراونەتەوە. باوەڕ وایە کە بانەکانیان گومەزی لە قوڕ هەڵبەستراو بووبێتن، هیچ نەبێت ئەوەکانی ئەرپەچی‌یە، کە شوێنەواری نمونەیی ئەم فەرهەنگەیە، وا بوون. هەندێک لە ڕێگا و کۆڵانە بەردرێژ کراوو چاک کراوەکانی نێوان خانووەکانی سەر تەختی گردەکە[٤٧] لەوانەیە ئاماژە بن بۆ یەکەمین کاروبار و چالاکیی شارەوانی‌یانە لەم سەردەمە زووەدا. دیاردەیەکی جیاکەرەوەی تری فەرهەنگی ئەم سەردەمە گلێنەکەیەتی. پەرەسەندنێکی بەرچاوو دیار لە بەکارهێنانی ڕەنگدا هاتە کایەوە؛ گلێنە بوونە فرەڕەنگ و شێوە نەخش کراوەکانی سەریان جوانتر و وورد تر بوونەوە، لەپاڵ نەخشاندنی کۆمەڵێکی بەرفراوان و دەوڵەمەندی مۆتیفی ئەندازەیی و ڕووەکی و ئاژەڵی، کە لەهەموویان دیارتر 'بوکرانیوم *Bucranium*' [٤٨] (=سەرەگا) بـــوو (وێنەی

---

[47] Mellaart, *Ibid.*

[48] بڕوانە:

Lloyd and Safar, *Op. Cit.*, p. 283; Mellaart, *Earliest Civilizations*..., p. 120.

گا بۆ ماوەیەکی ئێگجار دوورو درێژ ڕەگەزێکی سەرەکیی هونەرو وێژەی ڕۆژهەڵاتی نزیکی دێرین بووە و تائێستاش. بۆ نمونە، هەروەک لێرەدا دیبینین، لەسەر گلێنەی سەردەمانی پێش مێژوو نەخشێندراوە، لە سەردەمانی دواتریشدا لەسەر دەفرو وکووپەو مۆری لوولەکی Cylinder Seal و مۆری تەخت Seal Stamp و پەیکەرتاشیی سەردەمانی نیمچەمێژوویی (Proto-history) و مێژوویی شدا نەخشێنراوە، بەتایبەتی لە وولاتی سومەر. سەرەگا لەوێنە دیواری‌یەکان (Fresco)ی شاری نوزی و شوێنەوارەکانی سەردەمی ئاشوریی ناوەڕاست و دواتریشدا دەبینرێن. تەنانەت ئەخەمینی‌یەکانیش گایان لە نەخشە هەڵکەندراوەکانیاندا نەخشاندووە و تاجی ستوونەکانی کۆشکەکانیشیان لە پەرسیپۆلیس و شوش لە شێوەی دووگای دانیشتوودا دروست کردووە. فەرهەنگەکانی ئورارتو و عیلام و وولاتی هیتتی‌یەکان و بابلیش لەمە بەدەر نەبوون.

ژ. ٩). هەرچەندە هێشتا دۆلابی گلێنەسازی[٤٩] دانەهێنرابوو، بەڵام دیواری دەفرەکان تەنک تر و ڕێک و پێک تر دروست دەکران. وادیارە بازرگانی لەسەردەمی حەلەف دا لە برەودا بووە هەروەک بڵاوبوونەوەی گلێنەی ئەم فەرهەنگە بەسەر ناوچەیەکی زۆر بەرین دا پیشانی دەدات، و سەرباری ئەمەش بوونی بەردی 'ئۆبزیدی Obsidian' لە بەشی هەرە زۆری شوێنەوارەکانیدا.[٥٠] تێبینی دەکرێت کە ناوچەی بڵاوبوونەوەی فەرهەنگی حەلەف لە شێوەی نیوەمانگێکی گەورەدایە کە سەرزەمینەکانی کشتوکاڵی دێمی باکور و باکوری ڕۆژهەڵات دەگرێتەوە، تەنانەت هەندێک لە توێژەران ناوچەکانی 'ماردین' و 'دیاربەکر/ئامەد' بە "لانکەی گومان بۆچووی سەرهەڵدانی فەرهەنگی حەلەف"[٥١] دەزانن. دیارە دابەش بوونی جوگرافیانەی ئەم فەرهەنگەیە کە وای کردووە هیچ نیشانەیەکی کشتوکاڵی ئاودێری و بەراو بە شوێنەوارەکانیانەوە دیار نەبێت، وەک ئەوانەی لای خەڵکی فەرهەنگی سامەڕای پێشوو هەبوو. بەڵام لە لایەکی ترەوە، دۆزینەوەی ئامرازو کەل و پەلی کانزایی وەک سوژن و گەردانەی مس و قورقوشم لە

---

[49] لە کوردەواریدا بە چەرخی ئاوکێشان و تۆپی ئاشیش هەردەڵێن دۆلاب. ئەم ئامێری گلێنەسازی‌یەش هەر ئامێرێک بووە لەو بابەتانە و لەسەر تەوەرێک سووڕاوەتەوە، بۆیە منیش هەر ووشەی دۆلابم بۆ دانا. لەوانەشە لەکوردیدا ناوێکی سەربەخۆی خۆی هەبێت کە من نایزانم.

[50] Mellaart, *Op. Cit.*, p. 161.

بەردی ئۆبزیدی لەڕاستیدا شووشەیە زیاتر لەوەی بەرد بێت، ئەویش شووشەیەکی ڕەنگ ڕەشە کە گڕکان فڕێی داوەتە دەردوە و لە هەموو شوێنێک دەست ناکەوێت چونکە لە هەمووشوێنێک گڕکان نیە. نزیک ترین شوێنێک لە شوێنەوارەکانی بابەتەکەمانەوە کە ئەم جۆرە بەردەی لێ بێت ناوچەکانی دەوروپشتی 'وان'ن. لەسەردەمانی زووش دا ئەم ئۆبزیدی‌یە بەهادار بووە و داوای زۆر لەسەر بووە بۆ دروست کردن و داتاشینی ئامرازی بەکارهێنانی ڕۆژانە لە جیاتی بەرد. ئەم دەگمەنی‌یەشی وای لێ کردووە کە ئەگەر لە شوێنێک بدۆزرێتەوە بوونی لەو شوێنەدا بە نیشانەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی ولەگەڵیدا ئاموشۆی فەرهەنگی لەقەڵەم بدرێت.

[51] Mellaart, *Earliest Civilizations....*, p. 64.

ئەرپەچیەیە، بە نیشانەی پێشکەوتنێکی گەورە دەبینرێت.[٥٢]

کنە و پشکنین لە تل الصوان پیشانی داوە کە خەڵکی حەلەف لەکۆتایی سەردەمی سامەڕڕا دا بەرەو ئەم ناوچەیە داکشاونەتە خوارەوە، بە بەڵگەی دۆزینەوەی هەندێک پارچە سواڵەتی حەلەف و شوێنەواری بینایەک کە بە ثۆلۆی دەچێت.[٥٣] بەلای ڕۆژهەلاتیشەوە، گلێنەی حەلەف لە گردی 'حەسەن' لە ناوچەی بەنداوی حەمرین[٥٤] و 'کودیش صغیر' و 'قالینج ئاغا' لە دەشتی کەرکوک وهەولێر و لە گردی 'بەگم' لە شارەزوور دۆزراوەتەوە.[٥٥]

شێوەی ژمارە ٤: پلان و دروستکردنەوەی ثۆلۆیەک. سەرچاوە: Mallowan, *Early Mesopotamia and..*

وێنەی ژمارە ٩: لەگەنێکی سەردەمی حەلەف. سەرچاوە: Mallowan

لە کۆتایی سەردەمی حەلەف دا گۆڕانێکی گەورە لە گلێنە سازی دا ڕووی دا، گۆڕانەکە تەنها لە مۆتیفەکاندا نەبوو کە بەرەو سادەیی ڕۆیشتن، یان لە ڕەنگەکاندا کە ژمارەیان کەم بووەوە، بەڵکو لە چۆنایەتی قوڕەکەی و چۆنایەتی دروست کردنی و

---

[52]Mellaart, *Neolithic of* ……, p. 161; 166.
[53] Al-Soof, B., “Tell es-Sawwan, Fifth Season’s Excavations (1967-1968),” *Sumer* XXVII, part 1&2 (1971), p. 4-5.
[54] Fiorina, P., “Excavations at Tell Hassan,” *Sumer* XL, Part 1&2 (1981), p. 49.
[55]Matthews, p. 105-6.

سوور کردنەوەشی دا بوو. لەگەڵ ئەمەشدا بە ناوچەیەکی زۆر بەرفراواندا، فراوانتر لە ناوچەی فەرهەنگی حەلەف، بلاو بووەوە. دەرکەوتنی ئەم جۆرە گڵێنەیە و لەپاڵیشیدا دەرکەوتنی سیماو ڕەگەزی نوێ لە فەرهەنگی ماددییانەدا، ئاماژەن بۆ سەرهەڵدانی فەرهەنگێکی نوێ کە کۆنەناسان فەرهەنگی 'عوبەید Ubaid' (دەوروبەری ٤٠٠٠-٣٥٠٠ پ.ز.) ی پێ دەڵێن. لە سەرزەمینەکانی کوردستانی دێرین دا، ووردتر لە ناوچەکانی باکوری بەری ڕۆژهەڵاتی دیجلە، جۆرێک فەرهەنگی عوبەید بەرچاو دەکەوێت کە هەر لەناو خودی فەرهەنگی عوبەید دا خاوەنی سیما و جیاکەرەوەی تایبەتی خۆیەتی، جیا لە عوبەیدی باشوری مێسۆپۆتامیا.[٥٦] ئەم جیاکەرەوانە زیاتر لە بەکارهێنانی بەرد لە ئامرازسازی دا و لە نەریتەکانی مردوو ناشتن -هەروەک لە تەپەگەورە دەبینرێت- و لە گڵێنەسازییەکەیدا ڕەنگ دەدەنەوە کە ڕەنگی زیاتری تیادا بەکارهاتووە بۆ ڕەنگ کردنیان، زیاتر لە ڕەنگەکانی گڵێنەکانی باشور. شوێنەواری وێران کاری و سوتاندن لە چینەکانی نیشتەجێ بوونی حەلەف لە ئەرپەچییە بە نیشانەی هاتنێکی شەڕئامێزانە و توندو تیژانەی عوبەیدییەکان ڕاڤە کراوە، کە وایێ دەچێت پاش زیاد بوونی ژمارەی دانیشتوانیان لە باشور بەهۆی بوونی زیادەبەرهەمی بەروبوومی کشتوکاڵی کە لە بەکارهێنانی ئاودێری لە کشتوکاڵ دا پەیدا بووە، بۆ باکور کۆچیان هێنابێت.[٥٧]

---

[56] Lloyd, *The Archaeology of Mesopotamia,* p. 65.

هەروەها بڕوانە:

Nissen, H. J., "Western Asia before the age of Empires," *Civilizations of the Near East,* Vol. II (Ed. by J. M. Sasson), London, 1995, p. 795.

[57] Mellaart, *Earliest Civilizations……,* p. 129; Lloyd, *Op. Cit.,* p. 81.

فۆرێ باوەڕی وایە کە بەهاتنی فەرهەنگی عوبەید هیچ گۆڕانێکی نەژادی لە باکور ڕووی نەداوە، بەڵکو هەر حەلەفییەکان بوون و فەرهەنگە نوێ یەکەیان وەرگرتووە. بڕوانە:

Forest, *Op. Cit.,* p. 53.

پەرەسەندنێکی گرنگ لە باکور دروست کردنی ئامێرو ئامرازی کانزایی بوو بە تەکنیکی دارشتن، لێرە بۆ یەکەم جار تەوری دارشتەی مس و کەل و پەلی زێرین دۆزراونەتەوە.[٥٨] زۆر لە دۆزراوە گرنگەکانی عوبەیدی باکور لە تەپە گەورە بەدەست هاتوون، وەک مۆری تەختی لە جۆرەها بەردی جیاواز هەڵکەندراو، لەوانەش بەردی لاجیوەرد. کووپەیەکی سەردەمی درەنگی عوبەید لە تەپەگەورە دۆزراوەتەوە، لەم بوارەدا تاکە و هەڵدەگرێت بەتایبەتی باسی بکەین. هەرچەندە پارچە پارچەیە و چاک کراوەتەوە، بەڵام وێنەیەکی لەسەر نەخشێندراوە کە تائێستاش دیارە، وێنەکە ڕووبارێک پیشان دەدات لە نێوان دوو زنجیرە شاخ دا دێتە خوارەوە، لە خواریشەوە لە نزیک ڕۆخی

وێنەی ژمارە ١٠: کوپەکەی سەردەمی عوبەید لە تەپە گەورە. سەرچاوە:
Basmachi, F., *Treasures of the Iraq Museum.*

---

[58] Mellaart, *Op. Cit.*, p. 130; Lloyd, *Op. Cit.*, p. 65.

ڕوبارەکە ڕاوچی‌یەک لەگەڵ سەگەکەیدا ڕێ دەکات و لەوبەری ڕوبارەکەشەوە دوو گیانداری شاخدار هەن، کە لەوانەیە بزنە کێوی بن[٥٩] (وێنەی ژ. ١٠).

هونەری بیناسازیی ئەم سەردەمە بە بوونی مەودایەک لە ناوەڕاستی خانووەکەدا جیا دەکرێتەوە کە هەندێک بە ژووری نشیمەنی سەرەکی لەناوەڕاستی خانووەکەدای دەزانن،[٦٠] لە کاتێکدا زۆر زیاتر لەوە دەچێت کە ئەو مەودایە ژوور نەبوبێت، بەڵکو حەوشەی ناوەڕاستی خانووەکە بووبێت و ژوورەکانی تری خانووەکە لەدەوری بووبن، کە یەکێکە لە جیاکەرەوەکانی 'خانووی ڕۆژهەڵاتی' کە تائێستاش لە هەموو کوردستان و مێسۆپۆتامیادا دەبینرێت. لەمەش گرنگتر سەرهەڵدانی بیناسازیی ئاینی‌یە، هەروەک ڕیزێک بینا کە بە پەرستگا دەست نیشان دەکرێن و لە تەپەگەورە دۆزراونەتەوە، پیشانی دەدەن. ئەم بینایانە وا بەتەنیشت یەکەوە ڕیزکراون کە لە سێ لاوە دەوری ڕووبەرێکی کراوەیان داوە، لەسەر دیواری یەکێکیشیان پاشماوەی وێنەیەکی دیواریی کۆنی بە ڕەنگی سور و ڕەش و خاکی ڕەنگ کراو دۆزراوەتەوە.[٦١] لەدەشتی ڕانیەش، پاشماوەی پەرستگایەکی پچووکی دیوار لۆچدار (= Buttresses and Recesses)، هەرچەندە زۆر وێرانەیە، لە 'گردی قورەشینە' دۆزراوەتەوە.[٦٢] سواڵەتی ئەم سەردەمە لە 'گردی دێم'[٦٣]، و 'کەمەریان'[٦٤]، و 'قەڵای ڕانیە' و 'بۆسکێن'[٦٥]یش دۆزراوەتەوە. لە خوارتریشەوە، سواڵەتی

---

[59] Basmachi, F., *Treasures of the Iraq Museum,* Baghdad, 1976, p. 109, Photo No. 17 on page 120.

[60] بۆ نموونە بڕوانە:

Forest, *Op. Cit.,* p. 56.

[61] Mallowan, M.E.L., "The Development of Cities from Al-'Ubaid to the End of Uruk," *CAH* I, part 1, Cambridge, 1970, p. 382.

[62] الآلوسي، س.، "اخبار و مراسلات،" سومر ١٥، الجزءان الاول والثاني (١٩٥٩)، ص. ١١٤.

[63] التكريتي، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل. ٩٦.

[64] Es-Soof, "Uruk Pottery…..," p. 39.

[65] Mallowan, "The Development of………..," p. 375.

سەرْدەمی عوبەید لە شارەزوور لە گردی 'دوانزە ئیمام'[٦٦] و 'عەربەت' و 'گردەڕەش'[٦٧] دۆزراوەتەوە. لە ناوچەی کەرکوکیش لە 'نوزی' و 'مەتتارە.'[٦٨] لە ناوچەی بەنداوی حەمرینیش لە زۆر لە شوێنەوارەکانی دا گلێنەو بەڵگەی بیناسازییانەی گرنگ لە گردەکانی 'عەبادە'[٦٩] و 'تەل حەسەن'[٧٠] و 'ئەبو قاسم'[٧١] و 'خێط قاسم'و 'مەظهور'[٧٢] و 'سونگور' و هی تریش دا دۆزراونەتەوە.[٧٣]

لەسەردەمی 'ئوروک' Uruk (یان شێوە سامییەکەی: وەرکا Warka) (نزیکەی ٣٥٠٠-٣٠٠٠ پ.ز.)[٧٤] دا کە لە پاش عوبەید دێت، فەرهەنگی ماددییانەی هەموو مێسۆپۆتامیا و کوردستان بەرەوپێش چوونێکی ئێگجار گەورەی بەخۆیەوە دی. ئەم بەرەوپێش چوون و پەرەسەندنە، گەشەیەکی تری ژمارەی دانیشتوانی بە دوای خۆیدا هێنا

---

[66] الآلوسي، "اخبار ومراسلات: لمحات احصائية عن اعمال اقسام و فروع مديرية الآثار العامة،" سومر ١٦، الجزءان الاول والثاني (١٩٦٠)، ص. ١٤٨.

[67] حجارة، اسماعيل، "التنقيب في سهل شهرزور،" سومر ٣١، الجزءان الاول والثاني (١٩٧٥)، ص. ٢٧٦.

[68] Mallowan, "The Development of..........," p. 375.

[69] Jassim, S. A., "Excavations at Tell Abada," *Sumer* XL, Part 1&2 (1981), p. 46.

[70] Fiorina, P., "Excavations at Tell Hassan," p. 49.

[71] Al-Kassar, A., "Tell Abu-Qasim Excavations," *Sumer* XL, Part 1&2 (1981), p. 589.

[72] Roaf, M., "Excavations at Tell Madhur, The Results of the Third Season," *Sumer* XL, Part 1&2 (1981), p. 147.

گلێنەکەی لەهی چینەکانی ١٦-١٣ی تەپەگەورە و خەندەکە قوولەکەی نوزی و عوبەیدی درەنگ دەچێت، بڕوانە:

*Op. Cit.* p. 148.

[73] Forest, *Op. Cit.,* p. 56ff.

[74] بۆ ئەم مێژووە بڕوانە:

Bauer, J., R. K. Englund and M. Krebernik, Mesopotamien- Späturuk Zeit und frühdynastische Zeit, Annäherungen 1, Herausgegeben von P. Attinger- M. Wäfler, *Orbis Biblicus et Orientalis (OBO)* 160/1, Vandenhoeck und Ruprecht, Göttingen, 1998, p. 23.

و ئەمەش بووە هۆی زیاد بوون و گەشەسەندنی گوند و نشینگەکان، هەم لە ژمارەیاندا و هەم لە قەبارەیاندا.[٧٥] لەهەمان کاتیشدا پەرەسەندنی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیش تێبینی دەکرێت، سیستەمی دەستەڵات لە کۆمەڵگادا لەم سەردەمەدا ڕوونتر دیارە[٧٦] و دابەش بوونی چینایەتی ئاشکراتر بوو، شمەکی گرانبەها لەدەرەوە دەکرێدرا و لەلایەن چینێکی پیشەسازەوە بۆ چینێکی بالاتر دروست دەکرا و دەکرایە کەل و پەلی ژیانی خۆشنودی و هەردوو چینەکەش لەسەر بەری ڕەنجی چینێکی تر دەژیان. کوردستانی کۆن لەو ڕەوتە تایبەتەی خۆیدا کە لەسەردەمی عوبەیدەوە گرتبووی هەر بەردەوام بوو، جیاوازی لە فەرهەنگی کوردستان و فەرهەنگی بەشەکانی تری مێسۆپۆتامیادا لە زیاد بوون دا بوو و بەم جۆرە کەلێنی نێوانیان لە گەورە بوون دا بوو. گرنگترین و باشترین نمونەی ئەم فەرهەنگە لە کوردستان دا تەپەگەورەیەکە گردێکی گەورەیە و نزیکەی ٢٢,٥ کم لە ڕۆژهەلاتی دیجلەیە لە باکوری ڕۆژهەلاتی موسڵەوە. فەرهەنگی ماددییانەی ئەم سەردەمە

---

[75] بۆ روون کردنەوەی ئەم ووتەیە بەراوردی ئەوە بکە کە لە سەردەمی زووی ئوروک دا (ناوەڕاستی هەزارەی چوارەمی پ.ز.) لە باشوری مێسۆپۆتامیا ١٧ نشینگەی پچووک و ٣ ی گەورە هەبوون؛ کەچی لە ئوروک ی درەنگ دا (کۆتایی هەزارەی چوارەمی پ.ز.) گەشەیان سەند بۆ ١١٢ ی پچووک و ١٠ ی گەورە و یەک شاری شێوە پایتەخت. بۆ ئەم ڕێژەو ژمارانە بڕوانە:
Klengel, H. (Editor), *Kulturgeschichte des alten Vorderasien*, Berlin, 1989, p. 26.
نشینگەکانی سەردەمی ئوروک و دابەش بوون و بلاوبوونەوەیان بەگشتی، بەدووورو درێژی و ووردی لە کارەکانی ئەدامز Adams و نیسسێن Nissen دا توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە، سەبارەت بەمە بڕوانە سەرچاوە سەرەکییەکانیان:
Adams, R. McC. and H. Nissen, *The Uruk Countryside, The Natural Setting of the Urban Societies*, Chicago, 1972;
سەبارەت بە سەردەمی ئوروکیش لە ناوچەی بەنداوی حەمرین و ناوچەی دیالە:
Adams, R. McC., *Land Behind Baghdad*, Chicago, 1965, p. 36 f.
هەروەها:
Adams, *Heartland of Cities*, Chicago, 1981, p. 46-7.
[76] Forest, *Op. Cit.*, p. 103.

«ئەوەندە لە سیما و ئاکاری‌دا تاک و سەربەخۆیە کە ناوی لێ بنرێت "سەردەمی تەپەگەورە" ی باکوری عێراق».[77] بەڕادەیەکی گەورە مس بەکار دەهات و خشڵ سازیی زێڕیش لە برەوی دا بوو، بە تایبەتی مورووی زێڕین، هەروەک گۆڕە دەوڵەمەندەکانی ئەم شوێنەوارە [78]و ئەوەکانی قالینج ئاغا (١ کم لە باشوری قەڵای هەولێرەوە) دەری دەخەن.[79]

شوێنەوارە بیناسازی‌یەکانی تەپەگەورە بەهایەکی تایبەتی‌یان هەیە، بۆ نمونە بینا بازنەیی‌یە گەورەکەی چینی XIی ناوەڕاستی گردەکە، تیرەکەی ١٨مەترە و ئەستوریی دیوارە دەرەکی‌یەکەی ١مەترە. لەناوەوە کەندوویەک هەبووە و لە ژوورێکی تریشدا پەرستگایەکی پچووک، هەروەک چاڵاڵی‌یەکانی دیوارەکەو تاقی ناو دیوارەکە کە بۆ دانانی پەیکەری خواوەندەکە یان دروشمەکەی بووە، پیشانی دەدەن[80] (شێوەی ژ. ٥). ئەگەر قەبارەی گەورەی خانووەکەو بوونی لە ناوەڕاستی گردەکەدا و بوونی هۆڵێکی گەورەی درێژیش لە ناوەڕاستی خانووەکە دا بەهەند وەربگرین، ئەوا لەوانەیە ئەم بینایە خانووی فەرمانڕەوای ئاوەدانی‌یەکە بووبێت.[81] بینایەکی تری ئەم سەردەمە پەرستگاکەی

---

[77] Lloyd, *Op. Cit.*, p. 67.

[78] بۆ بینینی هەموو دۆزراوەکانی تەپەگەورە، تەماشای ئەنجامەکانی کنەکاری‌یەکانی بکە لە:

Speiser, E., *Excavations at Tepe Gawra,* Vol. I, Philadelphia, 1935; Tobler, A., *Excavations at Tepe Gawra,* Vol. II, Philadelphia, 1950;

بەم دوایی‌یانەش ئەم کتێبە بەهادارو بەپێزەشی لەسەر دەرچووە:

Rothman, M. S., *Tepe Gawra: The Evolution of a Small Prehistoric Center in Northern Iraq,* Philadelphia, 2002.

[79] El-Waily, F., "Foreword," *Sumer* XXII, part 1 & 2 (1966), p. e.

[80] Mallowan, "The Development of...........," p. 379.

[81] Mallowan, M. E. L., *Early Mesopotamia and Iran*, London, 1965, p. 79.

سەرلەنوێ دروستکردنەوەیەکی ڕێک و پێکی ئەم خانووە بە وێنە لەم سەرچاوەیەدا هەیە:

Rothman, *Tepe Gawra: The Evolution of.....,* p. 97,

بەڵام ئەم توێژەرە باوەڕی وایە کەئەم خانووە عەماری دانەوێڵەی ئاوەدانی‌یەکە بووبێت، بڕوانە:

چینی VIIIه کە نەخشەیـــەکـــی ســـێ لۆی هەیە و دیوارەکانـــی دەرەوەی بە لـــۆچ (Buttresses and Recesses) ڕازێندراونەتەوە و بیناکانی سەردەمی پێش یۆنانییەکان کە بە *مێگارۆن Megaron* ناسراون، بەبیر دەهێنێتەوە.[٨٢] زۆر سەرنج ڕاکێشیشە کـــە

شێوەی ژمارە ٥: خانووە بازنەیییەکەی تەپە گەورە. سەرچاوە: Mallowan

ئێگجار زۆر لە پەرستگاکەی شاری ئوورووک دەچێت کە *کاراینداش*[٤] ی پاشای کاشییەکان لەسەردەمی فەرمانڕەواییاندا لەوێ بنیاتی ناوە و هەر بە پەرستگاکەی کاراینداش ناسراوە.[٨٣] یەکێک لە سیماکانی ئەم پەرستگایەی تەپەگەورە ئەو "دالانە

---

Rothman, M. S., “The Tigris Piedmont, Eastern Jazira, and Highland Western Iran in the Fourth Millennium B. C.,” *Uruk Mesopotamia and its Neighbors*, Oxford, 2001, p. 387.

[82] Lloyd, *Op. Cit.*, p. 76.

[83] بۆ تەماشاکردنی پلان و نەخشەی هەردوو پەرستگاکە و بەراوردکاری، بڕوانە:

قوولە"ی پێشەوەیەتی کە مالۆوان لەبارەیەوە دەڵێت "ئەمە سیمایەکی بیناسازی‌یانەی نوێ بوو، وا پێ دەچێت لە کوێستانەکانی باکوری ڕۆژهەلاتەوە یان کوردستانی ئێرانەوە وەرگیرابێت."[٨٤] لێ ووردبوونەوەیەکی باش دەری دەخات ئەمە کۆنترین نمونەی ئەو ڕەگەزە بیناسازی‌یە بەناوبانگەیە کە لە بیناسازیی کوردستانی و ئێرانی دا بە 'هەیوان' ناسراوە و لە ڕۆژگارە هەرە دێرینەکانەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش لە بیناسازی‌دا پەیڕەودەکرێت و بیناسازیی سەردەمانی ئیسلامیش هەر بەهەمان ناوی 'ایوان' وەری گرتووە و بەکاری هێناوە. لە چینی سێ یەمی قالینج ئاغاش دوو پەرستگای سێ لۆیی دۆزراونەتەوە، پاشماوەی وێنەیەکی دیواریش بە ڕەنگی سوور و ڕەش و نیگاری ئەندازەیی لەسەر یەکێک لە دیوارەکانی دۆزراوەتەوە.[٨٥] چینەکانی سەردەمی ئوروک لە تەپەگەورە بە گۆڕە تێروتەسەل بە کەل و پەلەکانیان ناسراون کە بڕێکی باش خشڵی زێڕین و ژمارەیەکی زۆر مورووی لە کانزا و ئێسقان و عاج و جۆرەها بەردی بەنرخ و نیمچە بەنرخ و بەردی ئاسایی دروست کراویان بەدەستەوە داوە. یەکێک لە گۆڕەکان بەتەنها ٢٥,٠٠٠ مورووی تێدا بووە،[٨٦] گۆڕێکی تر ٤٥٠ مورووی لاجیوەردی تێدا بووە.[٨٧] بەلام لە نێو هەموو دۆزراوەکاندا سەرە گورگێکی ئەلیکترۆم جێگای بایەخێکی تایبەتی‌یە، ئەویش لەبەر ئەو تەکنیکەی پێی دروست کراوە (وێنەی ژ. ١١). هەندێک بەشی بە جیا لە کانزایەکی تر دروست کراون و لە قۆناغێکی تری دروست کردن دا بە سەرە لە قیر پڕ کراوەکەوە بەند کراون.[٨٨] گۆڕەکانی تەپەگەورە چەند جۆری جیاوازن؛ هەندێکیان بە جوانی و ڕێک و پێکی لە بەرد و خشتی کاڵ لە سەرەوەی گردەکە لە نێوان خانووەکاندا

---

Parrot, A., *Sumer*, Paris, 1960, p. 316.
[84] Mallowan, *Op. Cit.*, p. 78.
[85] Es-Soof, "Tell Qalinj Agha," *Sumer* XXV, part 1&2 (1969), p. 6.
[86] Lloyd, *Op. Cit.*, p. 82.

بۆ وەسفی وورد و ژماردنی هەموو دۆزراوەکان بڕوانە:

Rothman, "The Tigris Piedmont………………," p. 392-5.
[87] Mallowan, *Early Mesopotamia and Iran,* p. 80.
[88] Lloyd, *Op. Cit.*, p. 82; Mallowan, *Op. Cit.*, p. 79; 81.

هەڵبەستراون، جیاوازی‌یەکی کەم لە نێوان گۆڕەکانی ئەم جۆرەیان دا هەیە و لەوە دەچێت وەک مەزارگە و جێ نەزەرگە بەکار هاتبن.[89]

هەندێکی تر لە مردووەکان بە پێ ی نەریتە کۆنەکان لە ژێر زەوی خانووەکاندا نێژراون، هەندەکەی تریش لە دەرەوەی ئاوایی‌یەکە لە گۆڕستان، یان ئەوەی هەندێک پێی دەڵێن 'شاری مردووان،' نێژراون، ئەمەشیان ئەو نەریتەی هیندو-ئەوروپایی‌یەکان یاد دەهێنێتەوە کە لەگەڵ خۆیان هێنایانە ئێران و لە شوێنەواری 'تەپـە سیەلک' لە نزیـک

وێنەی ژمارە ١١: سەری گورگێکی لە ئەلیکترۆم دروستکراو لە تەپەگەورە. سەرچاوە: Mallowan

کاشان دەبینرێت.[90] ئەم جیاوازی‌یە بەرچاوانەی نەریتەکانی ناشتن و گۆڕ هەڵبەستن نیشانەیِ فرەیی بیرو باوەڕی ئایینیی دانیشتوانە و ئەمەش بۆ خۆی لەوانەیە نیشانەی فرەیی نەژادی‌یان بێت.

---

[89] سەبارەت بەم گۆڕانە و لەسەر کاغەز دروست کردنەوەیان، بڕوانە:

Rothman, *Tepe Gawra: The Evolution of……*, p. 171ff.; 181.

[90] Ghirshman, R., *Iran from the Earliest Times to the Islamic Conquest,* London, 1954, p. 77.

لەدۆززراوە گرنگەکانـــی تری ئەم شوێنـــەوارە ژمارەیەکی زۆر مۆری تەخت Stamp Seals ن. بابەتی هەمەچەشنەی زۆری وەک ئەفسانەیی و ئایینی و سروشتیيان لەسەر نیگار کراوە، لەسەر هەندێکیان پیاوی بەدەمامک بەدی دەکرێن و هەندێکی تریان شێوەی سەریان نارێکە.[٩١] دۆززراوەکانی ئێرە دەیسەلمێنن کە سەرهەڵدان و گەشەکردنی شارستانی لە شوێنی تری دەرەوەی وولاتی سومەریش، هیچ نەبێت لەم سەردەمەی ئۆروک دا، شیاو بووە.

گڵێنە و شوێنەواری تری ئۆروک لە هەردوو دەشتی ڕانیە و شارەزووریش زۆرن؛ لە شوێنەوارەکانی گردی دێم،[٩٢] کەمەریان،[٩٣] گردە بۆر[٩٤] لە دەشتی ڕانیە و لە شوێنوارەکانی دوانزە ئیمام، بەکراوا،[٩٥] حسێن فەتاح، چراغ،[٩٦] گردی ڕەش و عەربەت

---

[91]بۆ بینینی دۆزراوە ووردەکان، بڕوانە:

Rothman, *Op. Cit.*, p. 61-8;

بۆ مۆرەکانیش بڕوانە:

Tobler, *Excavations at Tepe Gawra*, plates CLVIII-CLXX.

شایانی باسکردنە کە هەندێک لە کەللەسەرەکانی لە ئەرپەچی‌یە دۆزراونەتەوە شێوەیەکی نائاسایی‌یان هەیە و دیارە کە لەکاتی خۆیدا و لە کاتی ژیانی خاوەنەکانیاندا شێویندراون و ئەم شێوانەیان دراوەتێ. بۆیە دەشێت وێنەکانی سەر ئەم مۆرانە وێنەیەکی ڕیالیستی‌یانەی کەسەکان بن. سەبارەت بەم کەللەسەرانەی مێژوویان بۆ سەردەمانی حەلەف تا عوبەید دەگەڕێتەوە، بڕوانە:

Molleson, Th. and S. Campbell, "Deformed Skulls at Tell Arpachiyah: The Social Context," *The Archaeology of Death in the Ancient Near East*, Ed. Stuart Campbell and Anthony Green, Oxford, 1995, pp. 45-55.

[92] Es-Soof, "Mounds in the Rāniya Plain and Excavations at Tell Bazmusian," *Sumer* XXV, part 1&2 (1970), p. 66.

[93]Es-Soof, "Uruk Pottery...............," p. 39.

[94] Es-Soof, "Mounds in the...............," p. 66

[95]Es-Soof, "Uruk Pottery...............," p. 41-2.

[96] الآلوسي، "اخبار ومراسلات: نبذ احصائية و ....،" ص. ١٤٨.

له دەشتی شارەزوور.[٩٧] له ناوچەی بەنداوی حەمرینیش گلێنەی ئورو ک له گردی ئەبو حەسەن دیاری کراوە.[٩٨] له باشور تریشەوە پاشماوەی ئەم فەرهەنگە له ناوچەی دیاله دۆزراوەتەوە. دۆزینەوەیەکی گرنگی ئەم ناوچەیەش ئەو لەوحە قوڕانەن کە هەندێک پێیان دەڵێن 'ئەرشیف' و بە مێخی‌یەکی هەرەکۆن (=ئەرکایی Archaic) نووسراون و مێژوویان بۆ سەردەمی ئوروک دەگرێتەوە.[٩٩]

لەگەڵ سەردەمی ئوروک و داهێنانی نووسین له وولاتی سومەر، مێژووی نووسراوە و بەمەش سەردەمە مێژوویی‌یەکان له باشوری مێسۆپۆتامیا دەست پێ دەکەن. کۆنترین نمونەکانی ئەم نووسینە له شاری ئوروک/وەرکا (چینی IV، نزیکەی ٣٤٠٠پ.ز.) دۆزراونەتەوە. هەرچەندە کاتی پێ چوو هەتا گەیشتە پلەیەکی پەرەسەندن کە بتوانرێت ڕووداوە مێژوویی‌یەکانی پێ بنووسرێتەوە. بەڵام مێژوونووسان سوود له چاکەی ئەم داهێنانە بۆ مێژووی ئەم سەردەمەی باکور، واتە کوردستان، نابینن، چونکە بەڵگەی نووسراو لەکوردستانی ئەم سەردەمەدا بەدەستەوە نیە. بۆیە مێژوونووسان و کۆنەناسان بۆ مێژووی کوردستان تا چەند سەدەی پاش ئوروک و زیاتریش، پشت تەنها بە بەڵگەی کۆنەناسی‌یانە دەبەستن.

ئەو سەردەمەی له کوردستان پاش ئوروک دێت هاوچەرخی سەردەمی ئوروکی درەنگ Late Uruk و 'جەمدەت نەصر Jamdat Nasr' و 'سەردەمی سەرهەڵدانی بنەماڵەکانی ١ Early Dynastic I'ی باشورە، بەڵام له فەرهەنگدا بە ڕوونی و ئاشکرایی لێیان جیایە و له کوردستان پێی دەووترێت '**نینەوای ٥** Nineveh V.' جێگای داخە کە زانیاریمان لەبارەی ئەم فەرهەنگەوە هەندی زانیاریمان دەربارەی

---

[97] حجارة، " التنقيب في سهل شهرزور،" ص.٢٧٦.

[98] Al-Kassar, *Op. Cit.*, p. 59.
[99] Englund, *OBO*, p. 31.

هاوچەرخە باشوری‌یەکانی، زۆر نیە.

لە رووی کۆنەناسی‌یانەوە، ئەم فەرهەنگە بە گلێنەکانی جیادەکرێتەوە کە پێیان دەووترێت گلێنەی نینەوای ٥، چونکە بۆ یەکەم جار لە خەندەکە قوولەکەی شاری نەینەوا دۆزرایەوە کە مالۆوان هەڵی کەند.[١٠٠] گلێنەکان بە رەنگ یان بە خەت هەڵکەندن یان بە هەردووکیان لەیەک کات دا، نەخشێنراون، مۆتیفەکانی لە هی فەرهەنگەکانی پێشووی جیاوازن و بە گشتی بریتین لە شێوەی مرۆیی دەستکاری کراو و شێوەی ئاژەڵیی دووبارەکراوە کە بەشی زۆریان ملی درێژیان هەیە، هەروەها ماسی و باڵندە و نیگاری ئەندازەیی تریش. رەنگەکان لە رەشەوەیان تێدایە تا سوور و مۆر.[١٠١] یەکێک لە شێوە جیاکەرەوەکانی دەفری ئەم فەرهەنگە ئەوانەن کە بە 'دەفری میوە' ناسراون و بریتین لە لەگەنێک کە پایەکی گەورە و بەرزی هەیە (شێوەی ژ. ٦)، و جۆرێک کووپەڵەی پچووکی کون دار کە لەوانەیە بۆ هەڵواسین تەرخان کرابێتن و وەک چرا یان بۆ سووتاندنی بخور بەکارهاتبن.[١٠٢] فەرهەنگی نینەوای ٥ بە ناوچەیەکی تارادەیەک گەورەدا بلاو بووە؛ لە نەینەوا و دەورووپشتەکەی (لە گردی بییللا، شێنشی، تەپەگەورە، ڕیجیم، گردی محەمەد عەرەب، فسنە و جیکان)، و بەلای رۆژئاوادا بۆ شنگار و شاگر بازار و براک، لە رۆژهەڵاتیشەوە گەیشتبووە هەولێرو دەشتی رانیە و هەردوو سلێمانی و کەرکوک.[١٠٣] پەل کێشانی ئەم فەرهەنگە بۆ ناو بانی ئێران و سەرزەمینەکانی

---

[100] Mallowan, M. E. L., "Ninevite V," *Vorderasiatische Arcäologie, Studien und Aufsatze,* Berlin, 1964, p. 142ff.
[101] Forest, *Op. Cit.,* p. 167ff.
[102] Mallowan, "Ninevite V," p. 145.
[103] Es-Soof, B., "Distribution of Uruk, Jamdat Nasr and Ninevite V Pottery," *Iraq* XXX, Part 1 (1968), p. 77-78,
لەم سەرچاوەیەدا لیستێک هەیە بە ناوی هەموو ئەو شوێنەوارانەی لەسەر رووی خاکەکەیان گلێنەی ئەم سەردەمانانەیان تیادا دۆزراوەتەوە.

کوردستانی ئەوێ (وەک لە شنۆ، دەوروبەری ورمێ، دینخا تەپە، حەسەنلو،[104] گردی حەسەن عەلی و لەدەرەوەی کوردستانیش وەک لە حیسار، سیەلک[105])، وای کردووە هەندێک لەکۆنەناسان پێشنیاز بکەن ئەم فەرهەنگە بنەماکەی لەوێوە هاتبێت،[106] و بەمەش پێچەوانەی بۆچوونی هەندێکی تر بن کە سوورن لەسەر بنەچە باکوری مێسۆپۆتامیایی‌یەکەی و ووردتریش لە ناوچەی نینەوا.[107] هەندێکی تریش هەن هەردوو ناوچەکە پێکەوە بە بنەچەی سەرهەڵدانی دەزانن.[108]

شێوەی ژمارە ٦: دەفرێکی نمونەیی فەرهەنگی نینەوای ٥. سەرچاوە: Mallowan

لەئەنجامی کنەکاری‌یە ڕزگارکاری‌یەکانی لە ساڵانی هەشتاکاندا لەو ناوچانەدا ئەنجام

[104] Mallowan, *Early Mesopotamia and Iran,* p. 82.
[105] Mallowan, *Op. Cit.*, p. 147.

[106] وەک مالۆوان و مەککاون لە:

Mallowan, *Early Mesopotamia and Iran,* p. 20; Mallowan, "Ninevite V," p. 153; McCown, D., *The Comparative Stratigraphy of Early Iran,* Chicago, 1942, p. 48, Note 88.
[107] Forest, p. 173.
[108] Perkins, A. L., *The Comparative Archaeology of Early Mesopotamia*, Chicago, 1949, p. 164-5.

دران که به ئاوی هەردوو بەنداوی موسڵ و حەمرین دادەپۆشران، دۆزینەوەی بەبەها و گرنگ لەبارەی ئەم فەرهەنگەوە بەدەست هاتن. بنیا و گۆڕەکانی لە هەموویان لەبەرچاوترن. بۆ نمونە، خانوویەک لە گردی کوتان لە نزیک موسڵ دۆزراوەتەوە کە نەخشە و پلانەکەی تەواو لە نەخشە و پلانی خانووەکانی سەردەمی تەپەگەورەی پێشوو جیاوازە، سیستەمێکی ئاوەڕۆی تاکی بە لوولەی گڵین بۆ دروست کراوە.[١٠٩] لە حەمرینیش، پێنج بینای بازنەیی مەحکەم دۆزراونەتەوە کە کۆنەناسەکانی دۆزیویانەتەوە بە 'دژ' ناوزەدی دەکەن. یەکێکیان ئەوەکەی 'تەل ڕەزووق'ە کە بینایەکی گەورەیەو مێژووەکەی بۆ دەوروبەری ٢٧٠٠-٢٦٥٠ پ.ز. دەگەڕێتەوە و سەرباری ئەوەی وەک دژ بەکار هاتووە، جێگای ژیان و دانیشتنی بنەماڵەیەکی دەستەڵات داری ئەوێش بووە.[١١٠] خانووی تری لەم جۆرە لە 'تەل گوببە'[١١١] و 'ومەظهور'[١١٢] و 'ئەبو قاسم' و 'سولەیمە' ش دۆزراونەتەوە و هەموویان شورای مەحکەمیان هەبووە. ئەمە دیارە نیشانەی دەوروبەرێکی نائارامی ئەم سەردەمەیە لە ناوچەکەدا.

گۆڕەکانی ئەم سەردەمەش لەگەڵ مردووەکاندا کەل و پەلیان تێ دەکرا کە بە پلەی یەکەم لە گڵێنە پێک دەهاتن و هەندێک جاریش بە ژمارەی زۆر، هەروەک گۆڕەکەی گردی ڕیجیم (لە بەنداوی موسڵ) دەری دەخات. لەم گۆڕەدا ٢٨ دەفری هەمەجۆری گڵێنە لە تەنیشتی ئێسکەپەیکەرێکی نوشتاوەوە دۆزراونەتەوە. ئەم ژمارەیە بە نیشانەی ئامادە بوونی ٢٨ کەس لە کاتی ناشتنەکەدا ڕاڤە کراوە.[١١٣] خدە و نەریتەکانی مردوو ناشتن لە حەمرین لەوەکانی تەپەگەورە دەچن؛ مردووەکانیان لەدەرەوەی ئاوەدانییەکان

---

[109] Forest, p. 171-2.
[110] *Op. Cit.*, p. 201.
[111] Fujii, H., "Outline of the Japanese Excavations," *Sumer* XL, Part 1&2 (1981), p. 51-52.
[112] Roaf, M., "Tell Madhur, A Summary Report on the Excavations," *Sumer* XLIII, Part 1 & 2 (1984), p. 116-18.
[113] *Op. Cit.*, p. 171.

دەناشت، هەروەک لە خێط قاسم ( دەوروبەری ٢٨٥٠-٢٨٠٠ پ.ز.، سەردەمی سەرهەڵدانی بنەماڵەکانی ١ لە دیالە) و ئەحمەد الحەتتو[١١٤] دەبینرێت. (گۆڕەکانی کە لە دەرەوەی ئاوەدانیەکە بە خشتی کاڵ دروست کراون مێژوویان لە دەوروبەری ٢٧٥٠ پ.ز. دایە).[١١٥]

لەهەندێک لە دۆزراوەکانی ناوچەی بەنداوی حەمرینەوە، وەک پاشماوەی جۆبارێکی ئاودێریی کۆن لە نزیک خێط قاسم،[١١٦] ئەوە هەڵدەهێنجرێت کە کشتوکاڵی ئەم ناوچەیە لە هەندێک شوێن و کاتدا پشتی بە ئاودێری بەستووە. بەڵام کشتوکاڵ تاکە چالاکی ئابووریی دانیشتوان نەبووە، بەڵکو، هەروەک خەڵکانی سەردەمی ئوروک، بازرگانیشیان کردووە. بەڵگەی ئەمەش دەفرێکی پەیوەندی دار بە هەڵسوکەوتی ئایینیەوەیە کە لە گۆڕستانەکەی خێط قاسمدا دۆزراوەتەوە و کاریگەریی هونەریيانەی ڕوون و بەهێزی ئێرانیی پێوەیە. تەورە مسینەکان و ئامرازەکانی لە تەل گوببە دۆزراونەتەوە و هی سەرەتاکانی هەزارەی سێ یەمی پ.ز. ن، خاوەکانیان هەر دەبێت لە کانە مسەکانی ئێرانەوە هێنرابێتن، سەرباری ئەمەش، تەپە قوری مۆر کراو کە بۆ سەرمۆر کردنی کووپە بەکار هاتوون، ئاماژەن بۆ چالاکیی بازرگانی و ئاڵ و گۆڕی شمەک.[١١٧]

لەم سەردەمە بەدواوە، بۆ پێکەوەنانەوەی پارەکانی مێژووی کوردستانی کۆن ئیتر دەکرێت پشت بە تۆمارە نووسراوەکانی سومەر و کەمێک پاشتریش، هی ئەکەد

---

114 Sürenhagen, D., "Excavations of the Deutsche Orient Geselschaft at Tell Ahmed Al-Hattu," *Sumer* XL, Part 1& 2 (1981), p. 61.
115 *Op. Cit.,* p. 196.
116 Forest, p. 202.
117 Forest, p. 200.

سەبارەت بەم مۆرانە و نیگارەکانی سەریان، بڕوانە:

Lebeau, M., "Notes sur les Sceux et Emprient des Sceux de Kheit Qasim," *Sumer* XL, Part 1&2 (1981), p. 115-18.

ببەستریێت، ئەمەش واتای لەباشورەوە تەماشاکردنی مێژووی کوردستانە، نەک لە ناوەوەی.

لەم نووسراوانەوە دەگەینە ئەنجامی ئەوەی کە کۆنترین ناوی تا ئێستا زانراوی خاکی کوردستانی دێرین 'سوبیر Subir/سوبارتو Subartu' بووە و گەلەکەشی 'سوبارییەکان.'

## سەردەمی سەرهەڵدانی بنەماڵەکان:

پێدەچێت نووسینەکەی 'لوگال-ئەننێ-موندو Lugal-anne-mundu' ی پادشای 'ئاداب Adab'ی سومەری تائێستا کۆنترین بەڵگەیەکی نووسراو بێت کە ناوی سوبیر و سەرزەمینەکانی دەوروبەری وەک نیشانی سەربازیی لەشکرکێشییەکانی بیات. لەو نووسینەیدا دەڵێت گوایە خەرج و باجی لە 'چیاکانی ئورز' و وولاتانی 'عیلام Elam' و 'مارخاشی Marḫaši' و 'گوتیوم Gutium' و 'سوبیر Subir' و 'مارتو Martu' و 'سوتیوم Sutium'ەوە هێناوەتەوە.[118] فەرمانڕەوایەکیش بەناوی '[پـ]ــو-زو-زو [p]ù-zu-zu'ەوە کە قەڵەمڕەوی لە ڕۆژگاری ئێستادا نەزانراوە، لە نووسینێکی دا لەسەر دەفرێک کە لە شاری ئوروک دۆزراوەتەوە، خۆی بە "خەمازی بەزێن" ناو دەبات.[119]

---

[118]Gelb, *Hurrians and Subrians*, p. 33-34.

[119] Gelb, I. J. and B. Kienast, Die altakkadischen Königsinschriften des dritten Jahrtausends v. Chr., *Freiburger altorientalische Studien (FAOS)*, Band 7, Stuttgart, 1990, vp 11 (Nippur 2), p. 32.

ئەم نووسینە کە بە ناساغی و پارچە پارچەیی بەدەست گەیشتووە، بەهۆی ئەوەی بەهەڵە بە پارچەیەکی تردەوە نرابوو کە ناوی 'ئوخوب Uḫub'ی فەرمانڕەوای 'کیش Kiš' و خواوەند 'زەبابا Zababa'ی لەسەرە، ئەمیش هەر بە هی ئوخوب دەزانرا. کووپەر Cooper دەری خست کە دوو پارچەکە هی

لەدەوروبەری ئەم سەردەمەدا شتێک زیاتر لەبارەی خەمازی و ڕۆڵە سەرکەوتووانەکەیەوە کە تاوەکو سەردەمی *ئیسن-لارسا* ʿIsin-Larsa درێژەی هەبوو، دەکەوێتە بەر چاو. هەروەک لە بەشی پێشووشدا ئاماژەی بۆ کرا، خەمازی لە لیستی پادشایانی سومەردا وەک چەقی بنەماڵەیەکی شاهانە ناوی هاتووە. ʾ*خەت/دانیش* ʿ*Hat/daniš*ی پادشای، دەوڵەت-شاری *کیش*ʾ ی بەزاندووە و پادشایەتی‌یەکەیی بۆ شارەکەی خۆی گواستووەتەوە و هەر بە پێی لیستەکە ٣٦٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە، تا ئەو کاتەی ئوروک لە سەردەمی *ئێن-شاکوش-ئەننا(ک)* ʿEn-šakuš-anna(k)ی پادشای دا شالاوی کردووەتە سەری و پادشایەتی‌یەکەیی بۆ ئوروک گواستووەتەوە.[١٢٠] بە پێی هەندێک کرۆنۆلۆجیای نوێ، ئەم ئێن-شاکوش-ئەننا(ک)ە یەک پشت، یان بەلایەنی کەمەوە ٤٠ ساڵ پێش سارگۆنی ئەکەدی ژیاوە.[١٢١] هەندێک لەو باوەڕەدان کە باشوری مێسۆپۆتامیا، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بوو‌بێت، کەوتۆتە ژێر دەستەڵاتی

---

دوو دەفری جیان و ئەمەش واتای ئەوەیە کە ئوخوب، هیچ نەبێت لەم جارەیان دا، ئەو کەسە نەبووە کە شەڕێکی لە خەمازی بردووەتەوە، بڕوانە:

Cooper, J. S., "Studies in Mesopotamian Lapidary Inscriptions. III," *Iraq* 46 (1984), p. 92-3,

هەروەها بڕوانە وێنەی Va لەهەمان سەرچاوەدا.

ناوی ئوخوب جاران بە *ئوتوگ/ک*ʾ Ú. Tug/k دەخوێندرایەوە، بۆ نمونە بڕوانە:

Thureau-Dangin, F., *Die sumerischen und akkadischen königsinschriften,* Leipzig, 1907, p. 160: 1.

[120] Jacobsen, Th., *The Sumerian King List*, p. 97-101.

[121] Bauer, *OBO,* p. 480 (بەگوێرەی ڤیستینهۆلتس)

ڤینهۆف Veenhof مێژوویەکی ووردی بۆ دیاری نەکردووە بەڵکو بە بەرینی لە نێوان ٢٥٠٠ و ٢٣٥٠ پ.ز. دای داناوە، بڕوانە:

Veenhof, K. R., Geschichte des Alten Orients bis zur Zeit Alexanders des Großen, *Grundriss zum Alten Testament* 11, Göttengen, 2001, table II.

ڕاستەوخۆی خەمازی‌یەوە، بەڵگەشیان بۆ ئەمە ناواخنی لیستەی پاشایانی سومەرە.[١٢٢] هەر لەم بارەیەشەوە شایانی ئاماژە بۆ کردنە کە ناوی خەتانیش لە لیستی بەناوبانگی AN: *ᵈan-nu-um* دا وەک کەسێکی خواوێندراو (Deified) ناوی هاتووە. جاکۆبسن ڕاڤەی ئەم ڕاستی‌یەی بەوە کردووە کە خەتانیش وەک 'UTUK' (=ڕۆحیانەت) یێک خراوەتە پانتیۆنی سومەری‌یەوە، چونکە وەک ڕۆحیانەتێک یان گیانێکی پیرۆز لە پەرستگای ئێکور 'Ekur' ی شاری نیپپور 'Nippur' دا پەرستراوە، لەبەر ئەوەی وادیارە بتێکی بۆ خۆی لەوێ دا داناوە،[١٢٣] ئەمەش خۆی لە خۆی دا "دەشێت نیشانەی ئەوە بێت کە خەتانیش لە ڕاستیدا نیپپوری لە ژێر دەست دا بووبێت."[١٢٤] دیارە ئەم ڕاستی‌یانەن هۆی پەسەند کردن و ڕووی یاسایی پێ بەخشینی شانشینێکی دوورەدەست و بێگانەی کوێستانەکانی زاگرۆس بەوەی لە لیستی پاشایانی سومەردا لەپاڵ بنەماڵە شاهانەکانی خۆیان دا تۆماری بکەن.

دەمێنێتەوە دەقەکەی تر کە باسی سەرکەوتن بەسەر خەمازی دا دەکات. هەندێک گومان و دوودڵی سەبارەت بە ناسنامەی نووسەرەکەی هەیە، بەڵام هەرچۆنێک بێت، مەرج نیە ئەم سەرکەوتنەی ئەو کۆتایی یەکجارەکی بە شانشینی خەمازی و دەسەڵاتەکەی هێنابێت؛ لەوانەیە پەلامارێکی خێرا بووبێت بۆ سەر شارەکە، یان لەوانەشە پاش شاڵاوەکەی ئوروک بووبێت.

هەندێک تۆپۆنیمی کوردستانی دێرین لە نووسینە شاهانەکانی *ئێن ئەنناتوم*

[122] Pettinato, *The Archives of Ebla, An Empire Inscribed in Clay*, p. 107.
[123]Jacobsen, *Op. Cit.*, p. 98, note 168.

هەروەها بڕوانە:

Steinkeller, The Historical Background of …, *Urkesh and the Hurrians,* p. 80, note 18.
[124] *Ibid.*

*Eannatum*‘ ی فەرمانڕەوای بنەماڵەی یەکەمی *لەگەش Lagaš* (دەوروبەری ٢٤٥٤-٢٤٢٥ پ.ز.) دا ناویان هاتووە. لە دووسێ شوێن دا ناوی *شوبور Šubur*‘ (= سوبارتو) وەک یەکێک لە نیشانە سەربازیەکانی دەبات.[١٢٥] گاد Gadd کاریگەریە سومەریەکانی لە پەرستگای هەرە کۆن(= Archaic)ی عیشتاری شاری ئاشور دا دەبینرێن، بە بوونی لەگەشیەکانی ئەم سەردەمە لە وولاتی شوبور دەزانێت کە یەکێک لە ئەنجامەکانی ئەم لەشکرکێشیانە بووە.[١٢٦]

نامەیەکی دیپلۆماسیانەی گرنگ لە *ئیرکاب-دامو Irkab-Damu*‘ (دەوروبەری ٢٣٢٠ پ.ز.)[١٢٧] ی پادشای *ئێبلا Ebla*‘ (لە باکوری ڕۆژئاوای سوریا) وە بۆ *زیزی Zizi*‘ ی پادشای خەمازی لە لایەن زۆر لە مێژوونووسان و ئەسیریۆلۆجیستانەوە گرنگیەکی تایبەتی پێ دراوە. هەندێکیان بە تاکە نمونەی نامەی شاهانەی ئاڵ وگۆڕکراوی نێو نەتەوەیی پێش سەردەمی بابلیی کۆنی لەقەڵەم دەدەن.[١٢٨] نامەکە، کە ڕونووسێکی لەبەر گیراوەیە -وا دیارە بۆ پاراستنی لە ئەرشیفـــی شاهانەی ئێبلادا-، لە ڕێی باڵیۆزەکەی زیزیەوە لە ئێبلا بۆ زیزی نێردراوە و تیایدا داوای سەربازی لێ دەکات[١٢٩] و باسی ئاڵ و گۆڕی دەست و دیاریش کراوە.[١٣٠]

---

[125] Steible, H. and H. Behrens, Die altsumerischen Bau- und Weihinschriften, Teil 2, *FAOS* 5, Wiesbaden, 1982, En. 1 RS 6: 10; En. 2. 6: 17; En. 5, 2: 2.

[126] Gadd, C. J., “The cities of Babylonia,” *CAH* I, part 2, Cambridge, 1971, p. 117.

بەڵام گێلب Gelb بەگومانە لەوەی فەرمانڕەوایەکی ناوخۆی وەک ئێ ئەنناتوم توانیبێتی هەموو وولاتی شوبور داگیر بکات و فەرمانڕەواییشی بکات:

Gelb, *HS*, p. 34.

[127] بۆ ئەم مێژووە بڕوانە:

Astour, M., “Reconstruction of the History of Ebla (part 2),” *Eblaitica: Essays on the Ebla Archives and Eblite Language,* Vol. 4, p. 77.

[128] Steinkeller, *Op. Cit.*, p. 81.

[129] Pettinato, *The Archives of Ebla....*, p. 98; 161.

گرنگیی ئەم نامەیە لە چەند خاڵێکدا کۆ بووەتەوە، لەوانە پلە و پایەی شانشینێکی کوێستانیی وەک خەمازی کە لەو کات و سەردەمەدا هەیبووە، بەڕادەیەک کە پادشای ئێبلا بە "برا" ناوی پادشای خەمازی ببات، براش لە زمانی دیپلۆماسیی جیهانی کۆن دا ئاماژە بووە بۆ هاوتایی و هاوشانی دوو شانشین یان دەوڵەت، بە پێچەوانەی "سەروەرت" و "بەندەت/ نۆکەرت" کە لەنامەی تری نێوان دوو هێزی نا هاوتادا بەکار هاتوون. پادشای هێزێکی گەورەی وەک ئەوسای ئێبلا داوای هاوپەیمانێتی و هاوکاری لە خەمازی کردووە، کە لەوانەیە بۆ بەرپەرچ دانەوە و بەر گرتن لە پلانە دوژمنکارانەکانی *کیش* یان *ماری* بووبێت. سەرباری ئەمەش، دۆزینەوەی لیستی زۆر لەیەک چوو و تەنانەت تەواو لەیەکچوو، کەناوی پیشەوەرانیان تێدا ڕیز کراوە، لە هەردوو گاسور و ئێبلا بەڵگەی پەیوەندیی فەرهەنگییانەی نێوانیانە.[١٣١] بوونی پەیوەندی و ئاموشۆی بازرگانی لە نێوان ئێبلا لە لایەک و *ئیربیل* (هەولێر) و *کاکموم* و *گاسور* لە لایەکی ترەوە[١٣٢] وا دەکات زۆر شیاو بێت پەیوەندی لەو جۆرە لەگەڵ خەمازی نزیک

---

بەڵام ئاستۆر Astour لەگەڵ وەرگێڕانی ووشەکەدا بە "سەرباز" نیە، ئەو پێی وایە "تۆناگەر و کەری دوو ڕەگ Hybrid" ڕاست ترە، بڕوانە:

Astour, *Op. Cit.*, p. 129-130, note 477.

وۆکەر Walker یش هەر پێی وایە جۆرێک ئاژەڵ و گیانلەبەرە نەک سەرباز، بڕوانە:

Walker, M. F., *The Tigris Frontier from Sargon to Hammurabi- A Philologic and Historical Synthesis*, (A Dissertation presented to the Faculty of the Graduate School of Yale University), Yale, 1985, p. 18.

[130] دەتوانرێت تەواوی نامەکە بەڕونووس Transcription وخوێندنەوە Transliteration و وەرگێڕان Translation ەوە لەم سەرچاوەیەی خوارەوەدا تەماشا بکە:

Pettinato, *Op. Cit.*, p. 97-8.

لێکۆڵینەوەیەکی بە پێزیش لەبارەی فۆرم و گرنگیی نامەکەوە لەم سەرچاوەیەدا بڵاوکراوەتەوە:

Shea W.H., "The Form and Significance of the Eblaite Letter to Ḫamazi," *Orients Antiqvvs,* Vol. XXIII (1984), pp. 143-158.

[131] Pettinato, *The Archives*....., p. 240.

[132] Pettinato, *Ebla, A new*...., p. 161.

لەمانیشەوە هەبووبێت. ئەم ڕاستی‌یانەی خرانە پێش چاو جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە مەبەست لە خەمازیی ناو نامەکە ئەم خەمازی‌یەی کوردستانی کۆن بووە، نەک خەمازی‌یەکی تر لە سوریا، هەروەک هەندێک پێشنیاز دەکەن.[١٣٣] دۆزینەوەی خەمازی ڕۆژێک لە ڕۆژان بە ئەرشیفە دەوڵەمەندە چاوەڕوان کراوەکەیەوە بۆ ئەسیریۆلۆجیستەکان مژدەیەکی زۆر خۆش دەبێت.

## سەردەمی ئەکەدی:

بەدەرکەوتنی سارگۆنی ئەکەدی (٢٣٣٤- ٢٢٧٩ پ.ز.)، سەردەمێکی نویٚ ی داگیرکاریی مێسۆپۆتامیا دەستی پێ کرد. پەل کێشان و فراوان بوونی خێرای ئەم شانشینە نویٚ یە هەندێک بەشی کوردستانیشی گرتەوە، بە تایبەتی ڕۆژهەڵاتی دیجلە. هەرچەندە نووسینە شاهانەکانی سارگۆن هیچ باسێکی لەشکرکێشی لەم ناوچە و سەرزەمینانەدا ناکەن، بەڵام هەواڵنامە و دەقی فاڵگرەوەیی سەردەمانی دواتر دەڵێن پەلاماری سوبارتوی

---

بۆ هەندێک نمونە لەسەر پەیوەندی نێوان ئێبلا و کاکموم کە لە نامەی ئاڵ و گۆڕکراودا خۆیان دەنوێنن، بڕوانە:

Walker, *Op. Cit.,* and p. 13-14.

133 ئاستۆر لە نووسینێکی دا خەمازیی نامەکە لە گەڵ ئەم خەمازی‌یەدا بەیەک دادەنێت:

Astour, M., "Semites and Hurrians in Northern Trantigris," *Studies in Civilization and Culture of Nuzi and the Hurrians (SCCNH),* Vol. 2, Eisenbrauns, 1987, p. 8,

بەڵام لە نووسینێکی دواتری دا بیرو ڕای گۆڕیوە و بەبێ دانی هیچ بەڵگەیەک یان لێکدانەوەیەکی گومان بڕ، پێشنیازی کردووە کە مەبەست لە خەمازیی نامەکە شارێکی تر بووبێت بەم ناوە لە ناوەڕاستی باکوری سوریا، نەک خەمازیی ڕۆژهەڵاتی دیجلە. بڕوانە:

Astour, "Reconstruction of the History of Ebla," p. 77, note 477.

هەروەها تەماشای بەشی یەکەمی ئەم کتێبەش بکەردوە.

داوە و "بەزاندنی، (لاشەکانیانی) کەڵەکە کرد و کۆمەڵە بێ شومارەکانیانی شکاند."[١٣٤] دیباچە- مێژوویەک (Date-formula) یش دەڵێت: " ئەو ساڵەی (تیایدا) سارگۆن چوو بۆ سیمورروم."[١٣٥] هەر لە دەقە جوگرافی‌یەکەی سارگۆندا، جگە لە سوبارتو و سیمورروم، ناوی چەند تۆپۆنیمێکی تریش هاتوون کە لە کوردستان دا بوون، وەک ئەرراپخا، لوللوبوم، گوتیوم، ئاشور و هی تر.[١٣٦] یەکێک لە گرفتەکانی مێژووی سەردەمی سارگۆن و بە ڕادەیەکی کەمتر، سەردەمی جێنشینەکانیشی، ئەوەیە کە زۆربەی سەرچاوەکانی دەربارەی ئەم مێژووە نووسینێ ئەدەبی‌یانەی سەردەمانی دواترن و سیمایەکی ئەفسوناوی و داستان ئاسا بە سەریان دا زاڵە، ئەمەش وای کردووە مێژوونووسان بە ووریایی و دوودڵی‌یەکی زۆرەوە بەکاریان بهێنن. سەرچاوەی لەم جۆرە باس لە ڕاپەڕینێکی گەورە و گشتی لە دژی سارگۆن لە دوا دوایی‌یەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایی‌دا دەکەن، کە هەموو وولاتانی ژێر ڕکێفی ئەکەدی‌یەکان بەشداری‌یان تیادا کردووە. بە پێی دەقەکە سارگۆن ڕووبەڕویان بووەتەوە و توانیویەتی هەموویان بشکێنێت.[١٣٧] ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، ئەوا هەموو ئەو سەرزەمینانەی کوردستانی کۆن کە لە جوگرافیاکەی سارگۆن دا وەک ژێر دەستە ناویان هاتووە، هەموویان لەم ڕاپەڕینەدا بەشدار بوون.

پاش سارگۆن 'ڕیموش *Rimuš*' (٢٢٧٨-٢٢٧٠ پ.ز.) و '*مانیشتوسو*

---

[134] Gadd, C. J., "The Dynasty of Agade and the Gutian Invasion," *CAH* I, Part 2, p. 430.

[135] Gelb, I. J. and B. Kienast, *FAOS*, p. 49.

[136] بڕوانە:

Weidner, "Das Reich Sargons von Akkad," *AfO* XVI, p. 4-5.

بلاوکردنەوەیەکی دواتریش لە لایەن گرەیسن Grayson ەوە:

Grayson, "The Empire of Sargon of Akkad," *AfO* XXV, p. 59-61.

بابەتی ڕاستی و دروستی ئەم دەقە و ئایا هی سارگۆنی ئەکەدی بووە یان سارگۆنی ئاشوری، وسەبارەت بە مێژووی نووسینی، پێشتر لە بەشی یەکەم دا باسی کراوە.

[137] Gadd, *CAH* , p. 433.

*Maništusu*ʿ (٢٢٦٩- ٢٢٥٥ پ.ز.) یەک لە دوای یەک لەسەر تەخت جێ نشین بوون. هەردووکیان لەشکرکێشی‌یان کردووەتە سەر کوردستانی کۆن و عیلام، بەڵام زۆر کەم لە بارەی ئەم لەشکرکێشی‌یانەوە دەزانرێت. لە ماوەی فەرمانڕەوایی مانیشتوسو و نەرام-سین (٢٢٥٤- ٢٢١٨ پ.ز.) ی جێنشینی دا چەند پەرستگایەک لە شارەکانی نینەوا و ئاشور بنیات نراون.

ماوەی فەرمانڕەوایی تا ڕادەیەک درێژی نەرام- سین پڕ لە ڕووداو و بەسەرهاتە و برێکی باش بەڵگەنامەی نووسراو و کاری هونەری لێ جێماوە کە ئەم ڕووداوانە دەگێڕنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ناتوانن لە پێکەوەنانەوەی وێنەیەکی ڕوون و تەواوی سەردەمی فەرمانڕەوایی‌یەکەیدا یارمەتیدەر بن. ئەم وێنەیە هەر بە تەماوی ماوەتەوە، چونکە، هەروەک گاد دەڵێت: "لە توانادا نیە نە سەرگوزشتەیەکی ڕیالیستی‌یانە و نە بەدوای یەکدا هاتنی ڕووداوەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایی نەرام-سین بنووسین. نە کرۆنۆلۆجیایەکی سی وحەوت ساڵەی فەرمانڕەوایی‌یەکەی بە دەستەوە هەیە و نە بەڵگەش لەسەر ڕاستیی ڕووداوە گێڕدراوەکان هەیە، چونکە نزیکەی هەموو سەرگوزشتەکان دەقی نووسراوی سەردەمانی دواتر و ئەفسانەن."[١٣٨] هەرچۆنێک بێت، دەتوانین ئەوەندە لەم سەرچاوانەوە هەڵبهێنجێنین کە نەرام-سین لەسەر خەتی پێشینانی خۆی بەردەوام بووە، لە ناردنی سوپا بۆ باکور و ڕۆژهەڵات و باشور و ڕۆژئاوا. لە یەکێک لە نووسینەکانیدا بە خۆی دەڵێت "فەرمانڕەوای عیلام و بەرەوژوور هەتا بارخاشی و (فەرمانڕەوای) شوبارتوم و بەرەوژوور هەتا دارستانی ئورز."[١٣٩] لە یەکێکی تردا دەڵێت گوایە لە کاتی چوونە پێشی دا ئێنسی *ensi* یەکانی شوبیر و سەردارانی وولاتە بەرزەکان (*bêlū a-lí-a-tim*) دەست و دیاری‌یان بۆ هێناوە.[١٤٠] سەرنج ڕاکێشە کە ناوی

[138] Gadd, *Op. Cit.*, p. 441.
[139] Gelb and Kienast, *FAOS*, p. 249.
[140] Gelb, *HS*, p. 36.

یەکێک لە فەرمانڕەواکانی سوبیر کە لەم بابەتەدا ناویان هاتووە ناوێکی خوریی لەگومان بەدەرە؛ لە دیباچە-مێژووەیەک دا ناوی بە شێوەی *داخیش-ئاتیلی* *‘Dahiš-atili’* هاتووە و وا دیارە فەرمانڕەوای *ئەزوخینوم* *‘Azuhinum’* بووە.[١٤١] زۆر دەشێت پەیکەرە برۆنزی‌یەکەی باستکی کە لە بەشی یەکەم دا باسی کرا پەیوەندی بەم ڕووداوەوە هەبوو بێت؛ کە تیایدا بەرەو سوبیر و بەرزایی‌یەکان کە بە ئورز داپۆشراون چووە و لە نووسینەکەی سەری دا دەڵێت: "(توانی) لە ماوەی یەک ساڵدا لە نۆ شەڕدا سەر بکەوێت، و پادشایانی (چیاکانی داری) ئورز (؟)ی زنجیر بەست کرد."[١٤٢]

زۆر پێ دەچێت ئەکەدی‌یەکان لەسایەی دەستەڵاتی نەرام-سین دا، هیچ نەبێت بۆ ماوەیەکی کورت، دەستەڵاتیان گەیاندبێتە سەرزەمینەکانی باکور و باکوری ڕۆژهەڵات، لەوانەش ڕۆژهەڵاتی دیجلە. نیشانەی ئەمە لەو پێگە سەربازی‌یانەدا ڕەنگ دەداتەوە کە بە پانتایی ناوچەکانی باکوری سوریا هەتا ڕۆژئاوای ئێرانی ئێستادا بلاو کرابوونەوە[١٤٣] و هەروەها دۆزینەوەی نەخشی هەڵکەندراو و نووسین کە ناوی ئەم پادشایەیان لەسەرە، لە

---

پارچەیەک لە ڕونوسی نووسینێکی شاهانەی نەرام-سین کە لە سەردەمی بابلیی کۆن دا ڕونوس کراوەتەوە (UM 29-16-103) و هی ئەنتیکەخانەی زانکۆی فیلادێلفیایە و لە ١٩٨٦ دا میشالۆڤسکی بلاوی کردووەتەوە، ئاماژە بۆ کردەوەیەکی سەربازیی نەرام-سین لە سوبارتو دەکات و دەڵێت: "تێک شکێنی چەکەکانی سوبیر،" بڕوانە:

Mchalowski, P. “The Earliest Hurrrian Toponymy: A new Sargonic Inscription,” *ZA* 76 (1986), p. 5, lines 6-8.

[141] Michalowski, *Op. Cit.*, P.9, note 10

[لە: B. Foster, *ASJ* (1982) 23 و W. G. Lambert, *RA* 77 (1982) 95 دوە]

ئەو دیباچە-مێژووە دەڵێت: "ئەو ساڵەی تیایدا نەرام-سین لە ئەزوخینوم شەڕی لەگەڵ سوبارتو کرد،" بڕوانە:

Gelb and Kienast, *FAOS*, p. 51.

[142] رشيد، د. فوزي، "دراسة اولية لتمثال باسطكي،" ص. ٥٢.

[143] Kuhrt, A., *Op. Cit.*, p. 50.

شوێنی وەک باستکی لە باشوری دهۆک و لە 'پیر حسێن' لە باکوری ڕۆژهەڵاتی ئامەد/ دیاربەکر و میلە بەناوبانگەکەی سەرکەوتـــن کـــە لـــە شوش دۆزراوەتـــەوە و یادگـــاری سەرکەوتنەکەی بەسەر لوللوبی‌یەکانـــدا تۆمار دەکات، ئەو میلەی کە هەندێک باوەڕیان وایە نەخشەکەی 'دەربەندی گاور' لە قەرەداغ ڕونوسێکی گەورەتری بێت.[144] هەر بە پێی سەرچاوە نووسراوەکان، نەرام-سینیش وەک سارگۆن ڕووبەڕووی ڕاپەڕینێکی گەورە بووەوە کە "هەر چوار لای جیهان" لە دژی بەرپایان کرد و لە بەشدارانی '*پوتتیم-ئەتال* *Puttim-atal*' (ناوێکی خوری‌یە) ی پادشای شیموررروم و '*گولا-ئان* *Gula-AN*' ی گوتیوم و سیانی تر بوون کە ناوەکانی خۆیان لە لەوحەکەدا شکاوە و تەنها ناوی وولاتەکانیان ماوەتەوە و ئەوانیش پادشایانی '*کاکموم*' و '*لوللوم*' و '*تورووککوم*' بوون.[145] بەسەرمان دا تێنەپەڕێت کە ئەم سەردارانە هەموو بە "پادشا" ناوبراون، لە کاتێکدا سەردارانی تری بەشداری ڕاپەڕینەکە، وەک سەردارانی '*ئامورررو* *Amurru*' و '*کانیشوم* *Kanišum*' و '*دێر* *Dēr*' و '*مێلوخخا* *Meluḫḫa*' و هی تر، کە هەموویان هی دەرەوەی سەرزەمینەکانی کوردستانی کۆنن، تەنها بە "کابرای ....." ("*lú*..." =) ناو براون. لەوانەیە ئەمە پەیوەندی‌یەکی بە هێز، پلە و پایە، بەرەوا ناسین، قەڵەمڕەو یان هۆزایەتی و ناهۆزایەتیی ئەم سەردارانەوە هەبووبێت. هەرچۆنێک بێت، نەرام-سین شانازی بە سەرکەوتنەکەی و بەزاندنی دوژمنەکانی‌یەوە دەکات، هەرچەندە هەندێک ووردەکاریی سەرگوزشتەکە لەبەر شکاوی و پارچە پارچەیی لەوحی دەقەکە نادیارن.

---

[144] دوور نیە ئەم نەخشەی دەربەندی گاور هی پادشایەکی خۆماڵی، بۆ نمونە لوللوبی، نەبووبێت کە هاوچەرخی نەرام-سین بووە و نەخشەکەی کاریگەریی هونەری‌یانەی ئەکەدی پێوە دیار بێت.

[145] Grayson, A. K. and E. Sollberger, “L’insurrection Général Contre Naram-Suen,” *RA* 70 (1976), p. 120-121; Westenholz, *Op. Cit.*, p. 243; 248 ff.

هەروەها تەماشای ئەمەش بکە:

Wilcke, C., “Amar-girids Revolte gegen Narām-Su’en,” *ZA* 87 (1997), the text: p.22ff.

هەروەک دەبینین، هەردوو جەمسەری ململانێ، لە لایەکەوە دەوڵەتانی باشور و لەلایەکی تریشەوە گەلانی کوێستانەکان، ئیتر ئەمانە لە شانشین دا خۆیان ڕێک خستبێت یان ئەمارەت یان یەکێتی هۆزایەتی دا، لە ململانێ و تێک ئالآنێکی توند و بەردەوام دا بوون. دووبارە گوتی‌یەکان، کە وا دیارە لە سەردەمی نەرام-سینەوە هەندێک بنە و بارەگایان لە ناوچەی دیالە هەبووە،[146] لە دژی *'شارکالیشەرری Šārkališarrī'* (٢٢١٧- ٢١٩٣ پ.ز.) ی جێنشینی نەرام-سین کەوتنەوە جموجۆڵ، لەو کاتەدا کە ئەکەدی‌یەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە لە عیلام و لە ڕۆژئاواوە لە چیای *'باسار'* بە ڕۆژانێکی سەخت دا تێ دەپەڕین. لە دیباچە-مێژووەوە دەردەکەوێت کە شارکالیشەرری هێرشی کردووەتە سەریان، تەنانەت بە پێی یەکێکیان توانیویەتی "*شارلاک Šarlak* ی پادشای گوتیوم" بە دیل بگرێت.[147] بەڵام ئەمانە نەیانتوانی نە هەرەشەی برەو سەندنی هێزی گوتی‌یەکان ڕابگرێت و نە ئیمپراتۆری لەیەک هەڵوەشاوی ئەکەدی‌یەکانیش ببوژێنێتەوە و ڕزگار بکات، کە لەم کاتەدا بە هۆی ناکۆکی ناوخۆیی ناویان لە سەر دەستەڵات بەرەو هەڵوەشان دەچوو. ئەم ڕاستی‌یە لە ڕستە بەناوبانگ و پڕ واتاکەی لیستی پادشایانی سومەردا بە جوانترین شێوە دەربڕراوە کە دەڵێت: "کێ پادشا بوو؟ کێ پادشا نەبوو؟."[148] گوتی‌یەکان لەم کاتەدا بۆ ئەکەد هەڕەشە و مەترسی‌یەکی بەردەوام بوون، بە پێچەوانەی ڕابوردوو، کاتێک کە سارگۆن و نەرام-سین بۆ ئەوان و گەلانی دەوروبەریان هەڕەشە بوون. ئەم هەڕەشە و مەترسی‌یە لە نامەیەک دا بە جوانی ڕەنگی داوەتەوە کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی شـــارکالـــیشەرری دا لە لایەن *لوگال ڕا 'Lugal-ra'* ناوێکەوە بۆ *'ئیشکون- داگان Iškun-Dagan'* نێردراوە، تیایدا فەرمانی پێ دەدات زەوی‌یەکە بکێڵێت و بوونی گوتی‌یەکان لەو نزیکانە نەکات بە بیانوو، خۆ

---

[146] Kuhrt, *Op. Cit.*, p. 52; 56.
[147] Gadd, *Op. Cit.*, p. 455.
[148] Jacobsen, *The Sumerian King List,* p. 113

ئەگەر هاتوو گوتی‌یەکان دایان بەسەر ناوچەکەشدا، ئەوا ڕانەکە کۆ بکاتەوە و بیهێنێت بۆ شار.[١٤٩]

وا پێ دەچێت ڕمانی ئیمپراتۆری ئەکەد لە ڕۆژانی فەرمانڕەوایـــی 'شو-د/تورول *Šu-d/turul*' (٢١٦٨- ٢١٥٤ پ.ز.) ی پادشای ئەکەد دا بوو بێت، ئەویش لە ئەنجامی هێرشێکی گوتی‌یەکان دا. سەربازە گوتی‌یەکانی لە سوپای ئەکەدی دا بوون، کە لەوانەیە هەر لە ڕۆژانی نەرام-سینەوە تیایدا لەکاردا بووبێتن،[١٥٠] دەبێت لەو هێرشەدا بۆ خزم و کەسەکانیان پاڵپشتیکی بە سوود بووبێتن.

هەرچەندە ئەم هێرشە بۆ سەر ئەکەد و ڕمانی بنەماڵە فەرمانڕەواکەی زیاد لە شەست ساڵێک پاش فەرمانڕەوایی نەرام-سین بووە، کەچی نووسەرانی پاشتری ئەکەد لەسەر ئەوە سوورن کە ئەم ڕووداوە گەورەیە تۆڵەیەکی خودایی بووە بەرامبەر سووکایەتی کردنی نەرام- سین بە 'ئیکور *Ekur*' ی پەرستگای ئینلیل لە نیپپور. بۆ ئەم مەبەستەش دەقی 'نەفرەتی ئەکەد' دەڵێت:

> "گوتیوم، گەلێک کە سرەوتن نازانن، کە بەهرەی مرۆڤانەیان هەیە، بەڵام زرنگیی سەگانە و ڕووکەشی مەیمونانە- ئینلیل لە چیاکانەوە هێنانیە دەردەوە. وەک پۆلە کوللە دایان بەسەر وولات دا، چەکەکانیان بۆ ئەو (=ئینلیل) بەسەر دەشت دا باڵیان کێشاوە، وەک تۆڕ بۆ نێچیر. چەکەکانیان هیچ شتێک ناهێڵنەوە، هیچ کەس لە

---

[149] Kienast, B. and K. Volk, *Die sumerischen und akkadischen Briefe, Des III. Jahrtausends aus der Zeit vor der III. Dynastie von Ur- FAOS 7*, Stuttgart, 1995, 89-94;

هەروەها تەماشای ئەم سەرچاوەیەش بکە:

Oppenheim, A. L., *Letters from Mesopotamia*, Chicago, 1971, p. 71-2.

[150] Kuhrt, *Op. Cit.*, p. 56.

چەکەکانیان دەرباز نابێت."[151]

لە هەواڵنامەیەکی پاشتر دا خواوەند مەردوک هەمان ڕۆڵ دەبینێت و هۆکانیش هەر هەمان هۆن:

"خواوەند مەردوک دووجار ڕەوگی گوتییەکانی لە دژی (=نەرام-سین) هەڵساند، (ئەوانیش) خەڵکەکەیان خستە ژێر ڕکێف و وولاتەکەیان لە خوداوەند بە دیاری وەرگرت."[152]

سەیر ئەوەیە کە ئەو گەلەی ڕچەی شاڵاوەکانی بۆ سەر خاکی ئەکەد و ژێر دەستەکانی ئەکەد شکاند وادیارە لوللوبییەکان بوون، ئەمەش بە پێی ناوەڕۆکی ڕونووسێکی سەردەمی بابلیی کۆنی دەقێکی ئەدەبی کە بە "ئەفسانە کوثی یەکەی نەرام-سین" ناسراوە. ئەم بۆچوونە لە ئامازەیەکی دەقەکەوە بۆ *ئانوبانینی* ‘*Annubanini*‘ ناوێک هەڵهێنجراوە کە پادشا بووە و سەرکردایەتی لەشکرە شاڵاو بەرەکانی کردووە و لە هەمان کاتیشدا ناوەکەی لەگەڵ هەمان ناوی *ئانوبانینی*‘ ی پادشای لوللوبییەکان دا یەکە. بەپێی دەقی ئەفسانەکە، شاڵاو بە ڕامالینی سەرزەمینەکانی کە لە هەرە باکورەوە بوون، لە *پوروشخاندا*‘ ‘*Purušhanda* ی ئاسیای بچووکەوە، دەستی پێ کردووە، پاشان هاتوونەتە ناو باکوری مێسۆپۆتامیا و سوبارتـــوەوە، ‘*شـــوبـــات-ئێنلیـــل*‘ ‘*Šubat- Enlil* و گوتیوم و عیلام و وولاتی بابلیان گرتووە و هەتا کەنداو لە هەرە باشوری مێسۆپۆتامیا نەوەستاونەتەوە، ئەمەش وەک تۆڵە لە نەرام-سین.[153] وادیارە ئەو

---

[151] Cooper, *The Curse of Agade*, lines 155-161.
[152] Gadd, *Op. Cit.*, p. 454.
[153] Westenholz, *Op. Cit.*, p. 311 ff.

سەبارەت بە بەشداریی لوللوبییەکان لەم باس و خواسەدا، بڕوانە:

Veenhof, K. R., “Naramsin van Akkad slaat ‘de Grote Opstand’ neer,” *Zij Schreven Geschiedenis*, p. 17.

هێزو توانا زۆر گەورەیەی لەم دەقەدا بە لوللوبی‌یەکان بەخشراوە، هەوڵێکی نووسەرەکەی بووە بۆ دەربڕین و دەرخستنی گەورەیی خەتا و گوناهکاری‌یەکەی نەرام–سین.

سەبارەت بە سەردەمی فەرمانڕەوایی گوتی لە باشوری مێسۆپۆتامیا کەم زانراوە. بەڵگەنامەو نووسینەکانی بنەماڵەکەی *گودێ–ئا Gudea*ی فەرمانڕەوایانی 'لەگەش' ی لێ دەربچێت، تەنها چەند نووسینێکی تەرخانکاری (= dedicatory)[١٥٤] ماون کە یەکێکیان هی *لاسی/ئەراب Lā-si/'arāb*'ە.[١٥٥] بەڵام سێ بێ پادشا *ئێریریدو– پیزیر* 'Erridu-pizir' هەن کە نووسینێ تا ڕادەیەک درێژیان لەسەرە و زانیاری گرنگ و بەسوود دەبەخشن. یەکێکیان باس لە کردەوەیەکی سەربازیی سەرکەوتوو لە دژی فەرمانڕەوای *'مادگا Madga*' ی یاخی دەکات کە بەداخەوە ناوی فەرمانڕەواکەی نەماوە.[١٥٦] نووسینێ دووەمیش باس لە کاری دوژمنکارانەو یاخیگەریی *'کانیشبا Kanišba*' ناوێکی پادشای سیموررووم دەکات کە 'لوللوبوم' یش هاوکاریی کردووە و هەر لەسەردەمی فەرمانڕەوایی *'ئێنریدا–پیزیر Enrida-Pizir*' ی باوکی‌یەوە تا سەردەمی خۆی بەردەوام بووە. سێ یەمیشیان بەسەرهاتی چالاکی‌یە سەربازی‌یەکانی خۆی دەگێڕێتەوە کە لە باکور لە دژی یاخی‌یەکانی کە لە نووسینێ دووەمدا باسی کردوون،

---

[154]واتە ئەو دەقانەی تیایاندا پەرستگایەک، بینایەک، یان هەر کەل و پەلێک پێشکەشی خواوەندێک دەکرێت و بۆ خزمەتی تەرخان دەکرێت. تیایدا ناوی تەرخان کەر و بۆ تەرخان کراو و شتەکەش دەنووسرێت.

[155]بۆ نووسینەکەی لاسی/ئەراب، بڕوانە:

Frayne, *RIME* 2, E2. 2. 14.

[156]پێ دەچێت ئەمە هەمان 'ماتکا' بێت کە لە بەڵگەنامەکانی ئوری سێ یەمدا ناوی وەک ئاوەدانی‌یەکی سەر تەوەری *'مێتوران Meturān*' – *ئەڕراپخا Arrapḫa*' هاتووە. دەبێت ئەمیش هەمان گوندی "ماتیکە' ی ئێستا بێت کە ٢,٥ میل لە باشور و باشوری ڕۆژئاوای 'تاوق'دوەیە؟

ئەنجامی داون.[157] شاری ئاشور لەم سەردەمەدا وادیارە پشت گوێ خراوە، نیشانەی ئەمە ئەو هەموو خۆڵەیە کە لەسەر کەلاوەکانی پەرستگای ئیشتار کەڵەکە بووە.[158]

پایتەختی گوتی‌یەکان کە فەرمانڕەوایی مێسۆپۆتامیایان لێ یەوە کردووە، زۆر دەشێت لە شوێنێکی چیاکانی زاگرۆس بووبێت، لە دەرەوەی دەشتایی‌یەکانی مێسۆپۆتامیا. نووسینەکەی *ئوتوخێنگال* '*Utuḫegal*' کە بۆ پاراستنی یادی سەرکەوتنەکەی بەسەر *تیریگان* '*Tirigan*' ی دوا پادشای گوتی و کۆتایی هێنان بە فەرمانڕەوایی گوتی لە مێسۆپۆتامیادا نووسراوە، ئاماژەیەکی لەم جۆرەی تیادایە، دەڵێت: "گوتیوم، دووپشکی چیا(کان). خراپەکار بەرامبەر بە خواوەندان، کە پادشایەتی سومەری بردە وولاتێکی بێگانە/بۆ چیاکان."[159]

خوری‌یەکان، هەرچەندە لە سەردەمانێکی کۆنترەوە لەم سەرزەمینانەدا بوون، بەڵام لەم سەردەمەدا وەک هێزێکی نوێ دەرکەوتن، بە دامەزراندنی ژمارەیەک دەوڵەتی پچووک لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی دیجلەوە تا سەرووی خابور دەستیان پێکرد. یەکێک لەم دەوڵەتانە لە سایەی نووسینێکی کورتی یەکێک لە پادشاکانی‌یەوە کە ناوی *ئەتال-شێن*

---

[157] Kutscher, R., *The Brockman Tablets at the University of Haifa-Royal Inscriptions*, pp.49-70.
[158] Gadd, *Op. Cit.*, p. 457-8.
[159] هەردوو وەرگێڕانەکە، واتە "وولاتێکی بێگانە/دوژمن" یان "چیاکان" شیاون و دەکرێت هەرکامێکیان ڕاست بێت، چونکە ووشەی سومەری kur هەردوو واتاکە دەبەخشێت. تورۆ-دانژا Thureau-Dangin بە "بۆ چیاکان" وەری گێڕاوە، بڕوانە:
Thureau-Dangin, F., “La Fin de la Domination Gutienne,” *RA* IX, No. 3 (1912), p. 111;
ڕۆمەر Römer یش بە "بۆ وولاتی دوژمن" وەری گێڕاوە، تەماشای خوێندنەوە و وەرگێڕانە نوێ یەکەی ئەم دەقەی بکە:
Römer, W. H., “Zur Siegesinschrift des Königs Utuḫegal von Ur (± 2116-2110 v. Chr.),” *Orientalia NS* 54 (1985), p. 282.

‘*Atal-šēn*’ بووەو پادشای *ئورکیش* ‘*Urkeš*’ و *ناوار* ‘*Nawar*’ بووە، ناسراوە.[١٦٠]

## سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئور:

هەرچەندە سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئور (٢١١٢- ٢٠٠٤ پ.ز.) بە سەردەمێکی دەوڵەمەند بە بەڵگەنامە و نووسین ناسراوە، بەڵام ئەمە مێژوونووسی ئەم سەردەمە ناگرێتەوە. کە باس لە نووسینی شاهانە دەکرێت، ئەو نووسینانە دەگرێتەوە کە کارە سەربازی و چالاکی‌یەکانی بیناکردن و ئاوەدان کردنەوەی پادشا و فەرمانڕەوایان دەگێڕنەوە، بەڵام لە سەردەمی ئەم بنەماڵەیەدا، لە بەشی هەرە زۆریاندا تەنها باس لە کاری بینا کردن و ئاوەدان کردنەوەن، چونکە یان نووسینی تەرخان کاری‌ن یان نووسینی بنکارن. زۆربەی زانیاری‌یە مێژوویی‌یەکانی ئەم سەردەمە لە دیپاچە- مێژووەکانەوە و چەند نامەیەک و چەند نزایەکی شاهانەوە وەرگیراون.

یەکێک لەم نزایانە ئاماژە بۆ *ئور-نەممو* ‘*Ur-Nammu*’ (٢١١٢- ٢٠٩٥ پ.ز.)، یەکەم پادشای بنەماڵەی نوێ، دەکات و دەڵێت: "هێشتا دەبوایە وولات لە داگیرکەرە گوتی‌یەکان پاک بکاتەوە."[١٦١] بەم شێوەیە، ئور-نەممو هێشتا زیاتر لە ناو وولاتی خۆی دا سەرقاڵ بوو لەوەی سەری بپەرژێتە سەر لەشکر کێشی لە وولاتانی دەرەوەی سومەر و ئەکەد، بە تایبەتی لە باکور و باکوری ڕۆژهەلات. بەڵام ئەم بارە زۆر درێژەی نەکێشا،

---

[160] Thureau-Dangin, F., “Tablette de Samarra,” *RA* IX (1912), No.1, p. 1-2;
هەروەها تەماشای نوێ ترین لێکۆڵینەوە و دووبارە خوێندنەوەی ئەم دەقە بکە لە:

Wilhelm, G., “Gedanken zur Frühgeschichte der Hurriter und zum hurritisch-urartäischen Sprachvergleich,” XENIA 21 *Hurriter und hurritisch, Konstanzer althistorische Symposien,* Band II, Konstanz (1988), p. 43ff.

[161] Gadd, C. J., “Babylonia, *c.* 2120- 1800 B. C.” *CAH* I, part 2, p. 597.

چونکە جێنشینەکانی دەستیان دایە شەڕو ململانێ یەکی درێژ خایەن و سەخت لەگەڵ گەلانی زاگرۆس و ڕۆژهەڵاتی دیجلە. 'شولگی *Šulgi*' (٢٠٩٤- ٢٠٤٧ پ.ز.) لە ٢٤هەمین ساڵی فەرمانڕەوایی دا یەکەمین شەڕی لە زنجیرە شەڕەکانی لەم بەرەیەدا هەڵگیرساند. فرەین لەڕێی لێکۆڵینەوەی ناوە جوگرافیەکان و کاتی هاتنیانەوە، کە لە باس و هەواڵی ئەم شەڕانەدا لە دەقەکان دا هاتوون، گەیشتووەتە ئەنجامی ئەوەی کە شولگی لە چەند شەڕێکی نەخشە بۆ داڕێژراو و بە پلان دا، توانیویەتی هەموو ناوچەکانی لە دیالەوە تا دەشتی ڕانیە داگیر بکات. یەکەم جار بە شاڵاوێک بۆ سەر 'کارخار *Karḫar*' (٢٤ هەمین ساڵی فەرمانڕەوایی)، کە دەکەوتە سەر ڕوباری ئەڵوەند و لە نزیک سەرپوڵی زەهاو و قەسری شیرین،[١٦٢] دەستی پێکرد. پاشان سیمورروم[١٦٣] (هەردوو ٢٥ هەمین و ٢٦هەمین ساڵی فەرمانڕەواییەکەی شولگی) و 'خارشی *Ḫarši*' (٢٧هەمین ساڵ). پاش چوار ساڵ خامۆشی، شولگی دەستی بە جەنگی دووەمی کرد، یەکەم جار دژ بە کارخار (٣١هەمین ساڵ)، ئەمجا سیمورروم (٣٢ هەمین ساڵ). پاش ئەمە حەوت ساڵی تر جەنگ ڕاوەستا، کە دەستی پێکردەوە هێرشێکی گەورە و یەکلایی کەرەوەی کردە سەر 'شاشروم *Šašrum*' (٤٢ هەمین ساڵ) و بەدوای دا سەرکەوتنی بەسەر 'ئوربیلوم' و 'سیمورروم' و 'لوللوبوم' و 'کارخار' (٤٥ هەمین ساڵ)، پاشان 'کیماش *Kimaš*' و 'خو ورتوم *Ḫuwurtum*'(یان: خومورتوم *Ḫumurtum*) (٤٦ هەمین ساڵ) و لە دوای هەموویان 'خارشی' و 'کیماش' و دیسانەوە 'خو ورتوم' (٤٨ هەمین ساڵ).[١٦٤] بەم شێوەیە، کاتێک کە 'ئەمار-سین *Amar-Sîn*' (٢٠٤٦- ٢٠٣٨ پ.ز.) هاتە جێی شولگی لەسەر تەختی پادشایەتی ئور،

---

[162]Frayne, *SCCNH* 10, 1999, p. 148.

[163] فرەین باوەڕی وایە لە سەر ڕوباری سیروان بووبێت، بڕوانە:

Frayne, *Op. Cit.*, p. 151.

[164] بۆ کرۆنۆلۆجیای ئەم شەڕانە، بڕوانە:

Frayne, *Op. Cit.*, pp.146-147.

بەشەکانی باشوری ئەم بەرەیە، کە ناوچەکانی دیالە و حەمرینیان دەگرتەوە، لە ژێر دەستی توند و تۆڵی دەستەڵاتی ئور دا بوون بۆیە هیچ پێویستیەک نەبوو بۆ لەشکرکێشی تیایدا، لە جیاتی ئەمە، هەواڵی شەڕ لە 'ئوربیلوم' (٢ هەمین ساڵ) و 'شاشروم' (٦ هەمین و ٧ هەمین ساڵ) لەوسەری باکوری ڕۆژهەڵاتەوە بەرچاو دەکەوێت.[١٦٥] بۆ دابین کردنی هێمنی و ئاسایش لەم وولاتە داگیرکراوانەدا، ئەمار- سین میر/ شاردار (=فەرمانڕەوای شار) و فەرمانڕەوا (ی سەربازی) ی بۆ بەڕێوە بردن و حوکمڕانیی‌یان تیادا دامەزراند، وەک ئەوانەی *'مارخاشی'* *Marḫaši* و *'سیمانوم'* *Simanum* و 'ئوربیلوم' و 'کارخار' و 'سوبارتو' و هی تر.[١٦٦] یەکێک لەم فەرمانڕەوایانە ناوی *'زاریقوم'* *Zāriqum* بوو کە فەرمانڕەوای ئاشور بوو و دەقێکی تەرخانکارانەی جێ هێشتووە کە پێشکەشی "ژیانی خۆی و ژیانی ئەمار-سین ی سەروەری" ی کردووە.[١٦٧]

جێگای سەرنجە کە هەندێک لەم ناوە جوگرافی‌یانە دووبارە و چەند بارە ناویان وەک نیشانی سەربازیی لەشکرکێشی‌یەکانی جەنگەکانی سومەری‌یەکان هاتووە؛ پێ دەچێت دانیشتوانی ئەم سەرزەمینانە هەمان ئەو تاکتیکانەیان بەکارهێنابێت کە لە ڕێی نەوەکانی چەندین سەدە پاش خۆیانەوە لەسەردەمی ئاشوری نوێ دا دەیزانین. ئەویش تاکتیکی خۆ لادان لە شەڕی گەورەی ڕووبەڕوو، لە جیاتی ئەمە لێدانی دوژمن بە شێوەی جەنگی پارتیزانی و هەڵاتن بۆ چیاکان بە خۆیان و مەڕ و ماڵات و کەل و پەلی بەهاداریانەوە و جێ هێشتنی شار و وولاتێکی بەتاڵ بۆ دوژمن هەتا دەکشێتەوە دواوە بۆ وولاتی خۆی. ئەمجا گەڕانەوەی دانیشتوان بۆ ئاوەدانی‌یەکانی خۆیان چاک کردنەوەی ئەوەی دوژمن تێکی دابێت. ئەنجامی ئەم تاکتیکە، ماندوو و شەکەت کردنی سوپای دوژمن بوو بەبێ

[165] Gadd, *Op. Cit.*, p. 607; Wilhelm, G., *The Hurrians*, (Translated from German by J. Barnes), Wiltshire, 1989, p. 10.
[166] Gadd, *Op. Cit.*, p. 607; 609.
[167] سەبارەت بە زاریقوم و گرفتە پەیوەندی دارەکانی، بڕوانە:
Hallo, W. W., “Zāriqum,” *JNES* 15 (1956), No. 4, pp. 220-25.

ئەوەی فرسەتی تالان کران و وولات داگیر کران و کوژراوی زۆر بە دوژمن بدەن.

لە ئەنجامی ئەم شەڕانەدا بەرچاوکەوتنی ناوی کەسیی خوری لە وولاتی سومەر زیادی کرد. لەم سەردەمە بەدواوە ئیتر ناوی زۆری لەم جۆرە لە نزیکەی هەموو جۆرە دەقێکدا، بە تایبەتی دەقی کارگێری، دەبینرێت. وا دیارە ئەم خوری‌یانە، کە بە پلەی یەکەم دیلی شەڕەکانی سومەری‌یەکان بوون لە ناوچە خوری‌یەکانی کوردستانی کۆن دا، بە زوویی خۆیان لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایەدا گونجاندووە کە خۆیان تیادا بینیوەتەوە. پاش کەمتر لە بەسەر چوونی پشتێک، ناوی چەندین پیشەساز و نووسەر لە وولاتی سومەر لە دەقەکان دا بەرچاو دەکەون کە ناوی خوری‌یان هەیە و هەندێکیشیان ناوی سومەری یان ئەکەدی‌یان لە منداڵەکانیان ناوە.

هەندێک لەو نامانەی *ئەرەد-مو Arad-mu*ی تەتەری شاهانە بۆ 'شولگی' پادشایی ناردووە، گرنگی‌یەکی تایبەتی‌یان هەیە. هەندێک زانیاریی کەم دەربارەی بارودۆخی سیاسی‌یانەی وولاتی سوبارتو لەرۆژگاری شولگی دا و هێزو دەستەڵاتی یەکێک لە فەرمانڕەوایانی وولاتەکە و سامانی و کۆشکەکەی و لەشکرەکەی و لەهەموویشی گرنگتر، هەڵوێستی بەرامبەر ئور، بەدەستەوە دەدەن. بە پێ ی نامەکان، ئەرەد-مو بۆ لای *ئەپیللاشا Apillaša*ی کۆمیسەری بالای سوبارتو نێردراوە تاوەکو وەک خۆی دەڵێت: "باجی سەرزەمینەکانی دەرەوەی قەڵەمڕەو ڕێک بخەم و باس و خواس لە باری هەرێمەکان بکەم و پرس و ڕا بە ئەپیللاشا بکەم و لەگەڵی ڕێک بکەوم."[١٦٨] بەڵام هەر لە هەمان نامەدا و لە پاش چەند دێڕێک بە دڵ شکاوی‌یەوە بۆ

[168] "4)gú-un ma-da ge-en-ge-né-dè 5)a-rá ma-da zu-zu-dè 6)ugu a-pí-il-la-ša gal-zu-unken-na-šè 7)ad-gi$_4$-gi$_4$-dè gù-téš-a sì-ke-dè 8)inim u$_4$-da-ka-ne-ne-a ḫé-em-tùm à-še mu-e-da-a-ág:"
Michalowski, *Op. Cit.*, P. 136; 142.

پادشای دەنووسێت کە بە شێوەیەکی گونجاو کە شایانی پلە و پایەی تەتەری شاهانە بێت، پێشوازی نەکراوە. ئەپیلاشا بەئەنقەست ئەوەی بەرامبەر کردووە، توانا و دەست ڕۆیشتوویی و دەوڵەمەندیی خۆی پیشانی ئەرەد-مو داوە، و لەهەمان کاتیشدا گوێ نەدانی بە پادشای ئور. ئەرەد-مو دەنووسێت: "کاتێک گەیشتمە دەروازەی کۆشکەکەی (=کۆشکی ئەپیلاشا)، هیچ کەس هەواڵی سەلامەتیی پادشای نەپرسی. ئەوەی دانیشتبوو لەبەرم هەڵنەستا، بەرامبەرم نەچەمییەوە."[١٦٩] دەوڵەمەندیی ئەپیلاشا بەرچاوە بووە، چونکە: "خۆی لە زیو و لاجیوەرد دابوو. لەسەر تەختێک دانیشتبوو کە لە بەرگی گران بەها (گیرابوو). پێ یەکانی خستبووە سەر پلەیەکی زێڕین، (لە حوزووری مندا) پێ ی لەسەر پلەکە دانەگرت!"[١٧٠] خواردنەکەش دەست بڵاوی و زیادەڕۆیی زۆری پێوە دیاربووە، چونکە: "شەش گای دابەستە و شەست سەر مەڕی دابەستە (لەسەر

---

ئەم نامەیە و چەند دانەیەکی تر پێشتر لە لایەن د. فاضل عبد الواحد علي دوە بلاوکراونەتەوە، بڕوانە:

Ali, F., *Sumerian Letters: Two Collections from the Old Babylonian Schools,* (A Dissertation presented to the Faculty of the Graduate School of the University of Pennsylvania), Pennsylvania, 1964;

هەروەها:

Ali, F., "Three Sumerian Letters," *Sumer* XXVI, Part 1& 2 (1970), PP. 145-178.

تێبینی ئەوەش بکەین کە ئەرەد-مو لەسەردەمی 'شو-سین' دا فەرمانڕەوای لەگەش بووە بەناو و بە نیشانی "ئەرەد-نەننا Arad-Nanna، فەرمانڕەوای خەمـــ(ـــا)زی و کارخار." بڕوانە:

Gadd, *Op. Cit.,* p. 605.

هاللۆ Hallo و وۆکەر Walker یش لەم دوو نووسینەیاندا پاڵشتیی ئەم ڕایەی گاد دەکەن:

Hallo, "Simurrum and the Hurrian Frontier, *Revue Hittite et Asianique (RHA),* 36 (1978), p. 78;

Walker, *The Tigris Frontier,* p. 88.

[169] "9)ká é-gal-la-šè gin-a-mu-dè 10)silim-ma lugal-gá-ke₄ èn li-bí-in-tar 11)tuš na-ma-ta-an-zi ki-a nu-ub-za ba-an-da-mud-da:"

Michalowski, *Op. Cit.,* p. 136; 142 (lines 9-11).

[170] "15)guškin na4za-gín-na mí-zi-dè-eš im-me 16)gišgu-za bará šutur-e ri-a i-íb-tuš 17)gišgìri-gub guškin-ga-ka gìri-ni i-íb-gar 18)gìri-ni na-ma-ta-an-zé-er:"

*Ibid,* (lines 15-18).

خوانەکان) بۆ (تەنها) یەک ژەمی نیوەڕۆ دانرابوون."[١٧١] سەرباری هەموو ئەمانەش نیشاندانی هێز لەیاد نەچووە: "جەنگاوەرانی هەڵبژاردە، پێنج هەزاری جەربەزە، لە لای چەپی و لای ڕاستییەوە ڕاوەستابوون."[١٧٢] لەهەمان کاتیشدا ئەپیللاشا بەرامبەر میوانەکەشی دەست و دڵی باش بووە، لە خواردنیش و لە جێ و ڕێش دا، "یەکێک دوو گای دابەستە و بیست مەڕی دابەستەی هێنایە سەر خوانەکەم،" و "یەکێک تەختێک بە مەنجوخێکی زێڕی سوور (بەسەرییەوە)ی هێناو پێ ی ووتم لەسەری دابنیشم."[١٧٣] لەڕاستیشدا ئەم هەڵس و کەوتانە کاری خۆیان کردووە ومەبەستەکەی خانەخوێ یان گەیاندووە، چونکە ئەرەد-مو لە دواییدا دەنووسێت: "تۆقیبووم، دەترسام!"[١٧٤]

هەر ئەم ئەپیللاشایە هەنگاوێکی تریشی لە ڕەفتاری بەرهەڵستکارانە و دوژمنانەی بەرامبەر دەستەڵاتی پادشایەتی ئور ناوە. هەروەک لەنامەیەکی تردا (YBC 5011) دەردەکەوێت کە ئور-دون *Ur-dun*' ناوێک بۆ پادشای نووسیوە، ئەمیش شولگی بە زیو (=پارەو پول) ەوە بۆ چیاکانی سوبارتوی ناردووە بۆ کڕینی ڕۆنی داری ئورز. ئور-دون بۆ پادشای نووسیوە: کاتێک چوومە ناو شاخ و بەندەنەکانەوە و ڕۆنی ئورزم کڕی، ئەپیللاشای کۆمیسەری باڵا، (پیاوەکانی) ناردە سەرم و (بەفەرمانی ئەو) کەل و

[171] "20)6 $gu_4$ niga 60 udu niga níg zú-gub-šè in-gar":
*Ibid,* (line 20).
[172] "19)aga-uš sag-gá-na 5 li-mu-um-ta-àm zi-da gùb-bu-na íb-ta-an-gub-bu-uš:"
*Ibid,* (line 19).
[173] "26)1(2) $gu_4$ niga 20 niga giš banšur-gá lú ma-an-di 24)$^{giš}$gu-za-gàr-ba guškin ḫuš-a gar-ra lú ma-an-di tuš-a ma-an-$dug_4$:"
*Op. Cit.,* p. 137; 143 (lines 24; 26).
[174] "28)ní ba-da-te su ba-da-zi:"
*Ibid,* (line 28).

پەلەکانیان لێم سەند."[١٧٥] لەمەش خراپتر، کە ویستویەتی سکاڵا بکا، تەواو پشت گوێ خراوە: "کە لەبەر دەروازەی کۆشکەکەی دا ڕاوەستام، هیچ کەس لە سکاڵاکەمی نەپرسییەوە."[١٧٦]

سێ ساڵ پاش هاتنە سەر تەختی، 'شو-سین *Šu-sîn*' (٢٠٣٧-٢٠٢٩پ.ز.) ی پادشای ئور، لەشکرکێشییەکی کردە سەر 'سیمانوم *Simanum*.' هەندێک لە نووسینە شاهانەکانی ئەم پادشایە کە باس لە تاڵانییەکانی وولاتی گەلی سو دەکەن، لەوانەیە پەیوەندییەکی بەم لەشکرکێشییەوە هەبێت.[١٧٧] دیلەکانی ئەم سەرزەمینانە بۆ وولاتی سومەر کۆچێندران و لە ئۆردوگایەکدا کە لە نزیک شاری نیپپور بۆیان هەڵدرابوو، نیشتەجێ کرانەوە و لە پرۆژەکانی بنیاد ناندا کاریان پێ دەکرا.[١٧٨] ئەم کردارە دەکرێت بە نموونەی یەکەم و هەرەکۆنی زانراوی کردارە بەربڵاوو وبەرفراوانەکانی بە کۆمەڵ کۆچاندن و نیشتەجێکردنەوەی سەردەمی ئاشوری نوێ لەقەڵەم بدرێت، کە لە مەودای زیاتر و بە ژمارەی گەورەتر لە هەمان ناوچە و ناوچەی تریشدا ئەنجامیان دەدا.

لە ڕۆژگارەکانی شو-سینەوە ئیتر باری ئیمپراتۆری ئور بەرەو لاری ڕۆیشت، لە

---

[175] "6)u$_4$ kur-šè x ku$_4$-ri-na-mu 7)šim $^{giš}$erin-na bí-sa$_{10}$-sa$_{10}$-mu 8)$^{I}$A-pí-la-ša gal-zu-unken-na ma-an-gi-ma 9)šám-mu mu-da-an-kár-re-eš:"
*Op. Cit.*, p. 217; 218 (lines6-9).
[176] "10)ká é-gal-la-ni ù-mu-gub 11)lú-na-me inim-mu èn nu-bi-tar:"
*Ibid*, (lines 10-11).
[177] دەقی نووسینەکە دەڵێت :شو-سین، پادشای بەهێز، پادشای ئور، پادشای هەرچوار لای جیهان، پەیکەرێکی بۆخۆی لەو زێڕە دروست کرد کە لە وولاتی گەلی سو بە تاڵان هێنای. بروانە:
Edzard, D. O., "Neue Inschriften zur Geschichte von Ur III unter Šūsuen," *AfO* 19 (1959-1960), Text 1, Col. III, l. 20-29.
[178] Gadd, *Op. Cit.*, p. 608; Edzard, D. O. (*apud*), *The Near East, The Early Civilizations*, (ed. J. Bottéro, E. Cassin and J. Vercoutter), London, 1967, p. 144.

شاڵاوو پەلامارەوە کەوتە بەرگری و خۆ پاراستن، بە تایبەتی لە بەرامبەر هاتنە ناوەوەی ئاموری‌یەکان و شاڵاوەکانیان بۆ سەر سنوورەکانی دەوڵەت، سەرباری لەبەریەک هەڵوەشان و لە شیرازە دورچوونی ناوخۆیی.[179] هەرچەندە ئیبـــی-ســـین Ibbi-sîn‘ (٢٠٢٨-٢٠٠٤ پ.ز.) لەشکرکێشی‌یەکی کردە سەر سیموررروم (ساڵی ٣؟ هەمین فەرمانڕەوایی‌یەکەی)، بەڵام بارودۆخەکە بە گشتی بەرەو لاوازی و داتەپینی زیاتری ئیمپراتۆری دەچوو، هەرێمە ژێردەستەکان یەک لە دوای یەک دەستیان کرد بە بانگی سەربەخۆیی هەڵدان. تەنها ئاموری‌یەکانیش نەبوون کە فشاریان خستبووە سەر ئور، بەڵکو خوری‌یەکانیش کە لەم کاتەدا چالاک بوون، لە برەو سەندن و قەڵەمڕەو فراوان کردنیاندا بەردەوام بوون، بە تایبەتی لەناوچەکانی سیروان و سەرووی ڕۆژهەڵاتی دیجلە و باکوری مێسۆپۆتامیا بەرەو ناوچەی خابور. ئەم فراوانی و پەل کێشانە بە ڕوونی لە ووردبوونەوە لە ناوە کەسی‌یەکان دەردەکەوێت کە لەو ناوچانەدا بەرچاو دەکەون.[180] ئیمپراتۆری ئور گورزی کوشندەی لە ڕۆژهەڵات و باکوری ڕۆژهەڵاتەوە خوارد، لە هاوپەیمانانی عیلامی و سوبی. لە دەقە ئەدەبی‌یەکانی پاشتردا، شینی شارە وێران کراوەکانی سومەر، گوتی‌یەکانیش لەگەڵ هاوپەیمانەکان و داگیرکەرەکاندا ناو دەبەن.[181] هەندێک لەو بڕوایەدان کە ئیبـــی-سین لە پێشدا لەگەڵ عیلامی‌یەکان و سوبی‌یەکاندا هاوپەیمان و هاوکار بووە بۆ بەر گرتن بە تەماعکاری‌یەکانی ئیشبی-ئێرڕا Išbi-Erra‘ ی فەرمانڕەوای شاری ئیسن Isin‘ ی ژێر دەستی ئور خۆی، بەڵام هەردوو لا لە پاشدا ڕایان گۆڕیوە و دژ بە پادشای ئور وەستاونەتەوە. هۆی ئەم بۆچوونە دیپاچە-مێژوویەکی ئیشبی-ئێرڕایە کە باوەڕ وایە- بەڵام بەبێ بوونی بەڵگەی تەواو- هی کەمێک پێش ڕمانی

---

[179] بۆ لێکۆڵینەوەیەکی وورد سەبارەت بەم گۆڕانانە، بڕوانە:
Edzard, *Die »Zweite Zwischenzeit« Babyloniens (ZZB)*, p. 30-45.

[180] Wilhelm, *Op. Cit.*, p. 10; Gadd, *Op. Cit.*, p. 603.

[181] Kramer, S. N., *Ancient Near Eastern Texts (ANET),* Princeton, 1969, pp. 613; 614; 615; 616.

ئیمپراتۆری ئور بێت،[١٨٢] تیایدا هاتووه که ئیشبی-ئێرڕا: "له کابرای سوبارتو و عیلامی دا،"[١٨٣]-واته شەڕی لەگەڵ سوبارتویی‌یەکان و عیلامی‌یەکاندا کرد- و هەروەها نووسینی سەر شێوه جگەرێکی له قوڕ دروست کراو که له شاری ماری دۆزراوەتەوه که به ڕاشکاوی تیایدا هاتووه: "سوباری‌یەکان ناردیانه لای ئیشبی-ئێرڕا و (ئەمجا) بەلایەکەی تردا بایان دایەوه، (بۆیه ناوەڕۆکی نووسینی سەر) ئەم جگەره بەم شێوەیه هات."[١٨٤] ئیشبی-ئێرڕا ئەوەندەی هێز هەبووه بەسەر سوبارتو دا سەر بکەوێت و زینوم Zinum[١٨٥]ی فەرمانڕەوای به دیل بگرێت و خەمازیش تالان بکات، هەروەک

---

[182] Gadd, *Op. Cit.,* p. 616.

بەڵام گێلب لای وایه هی سەردەمێکی دواتر بێت، له پاش ڕمانی ئیمپراتۆری و گرتنی ئور:

Gelb, *HS*, p. 39,

ئەو کاتەی ئیشبی-ئێرڕا دەبوایه هێزو دەستەڵاتی خۆی بچەسپێنێت به دەرکردنی سوپا بێگانەکانی که له کاتی شاڵاوەکەیانەوه له وڵاتی سومەر جێگیر کرابوون.

[183] لەم سەرچاوەیەوه وەرگیراوه:

Gelb, *HS,* p. 39.

[184] Rutten, M., "Trente-deux modèles de foies en argile inscrits provenant de Tell-Hariri (Mari)," *RA* XXXV (1938), No. 1, p. 43-44.

له ڕۆژهەڵاتی نزیکی دێرین دا، به تایبەتی له میسۆپۆتامیادا، بۆ ڕمڵ لێدان و فاڵ گرتنەوه ئاژەڵێک دەکرایه قوربانی و سەردەبڕدرا و جگەرەکەی، هەندێک جاریش زراوەکەی یان دڵەکەی یان سی‌یەکەی، بەڵام بەزۆری جگەرەکەی لەلایەن ئاخوندێکی تایبەتەوه دەخوێندرایەوه. گوایه لەسەر ئەو ئەندامه هەموو نیشانەکان دەردەکەوتن که دوارۆژیان پیشان دەدا. بەشەکانی ئەم ئەندامانەش ناویان هەبوو و هەر نیشانەیەکیش واتای تایبەتیی خۆی هەبوو، بۆیه بۆ ئاسان کاری و فێربوون مۆدێلی ئەم ئەندامانەیان له قوڕ دروست دەکرد و هەموو ئەو ناو و نیشانەو وردەکاری‌یانەیان لەسەر دەنووسی، تەنانەت له ئەنەدۆڵ جگەرێکی له برۆنز دروست کراو دۆزراوەتەوه. ئەم مۆدێله قوڕەش که لێرەدا باس کراوه یەکێکه لەمانه.

[185] ئەم ناوه پێشتر به *Zi-gu-um-e* و *Zi-gu-la-e* دەخوێندرایەوه، بۆ باس و خواسی ئەم ناوه بڕوانه:

Gelb, *HS,* p. 19; 38,

نامەکەی ’پوزور-شولگی *Puzur-Šulgi*‘ ی فەرمانڕەوای ’کەزاللو *Kazallu*‘ بۆ ئیبــــی-سینی سەروەری ئاماژەی بۆ دەکات.[١٨٦] ئەم ئاماژەیەی ئەم نامەیە بۆ خەمازی یەکێکە لە دواترین ئاماژەیەکی تا ئێستا زانراوی سەرچاوە نووسراوەکان بۆ ئەم شارو لەهەمان کات دا ناوچە و دەوڵەتە کوردستانی‌یە دێرینە.

[186] Michalowski, *Op. Cit.*, p. 255.

# بەشی سێ یەم

ا) نووسینێکی نوێ ی پادشا ئیدیـــ(ـــن)-سین، پادشای سیمورروم

ب) سیمورروم و ئیدیـــ(ـــن)-سین ی پادشای

## ١) نووسینێکی نوێ ی پادشا ئیدیـ(ـــن)-سین، پادشای سیموررووم

### نووسینەکە:

ئەم نووسینە شاهانە نوێ یەی لێرەدا ڕونووسی خەتەکەی (Transcription=) و خوێندنەوەکەی (Transliteration=) و وەرگێڕانەکەی (Translation=) پێشکەش دەکەین، لە هاوینی ١٩٩٣ەوە لە ئەنتیکەخانەی سلێمانیدا بە ژمارەی ١٦-س م پارێزراوە.[1] ڕونووسی نووسینەکە کاری نووسەری ئەم باسەیە کە هەر لە هەمان ساڵدا

---

[1] سەرهوردی دۆزینەوە و پاراستن و بە ئەنتیکەخانە گەیشتنی ئەم بەردەو بارو دۆخەکەی پیایدا تێپەڕی دراماتیکی بوون. جێگای خۆیەتی لێرەدا، با بە کورتیش بێت، باسی بکەین، هیچ نەبێت وەک سوپاس و پێزانینێک بۆ پاڵەوانی سەرهوردەکە کە قایل نەبوو، سەرباری هەژاری و دەست کورتیی خۆی، بەردەکە بە قاچاغچی‌یان و بازرگانانی ئەنتیکەی بفرۆشێت، ئەو کەسەش شەهیدی بەڕێز 'غەریب هەڵەدنی' بوو. ئەم بەسەرهاتەم لەکاتی خۆیدا لە دەمی شەهید خۆیەوە بیستووە و من لێرەدا وەک خۆی، بەڵام بە کورتی، دەیگێڕمەوە. یەکێک لە جوتیارەکانی گوندی 'قەرەچەتان' کە لە دامێنی باشوری پیرە مەگرونە، لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی ڕابووردوودا لە زەوی‌یەکی بەردیّ دا کە نزیکەی چەند سەد مەترێکی کەم لە باشوری ڕۆژئاوای گوندەکەوەیە، خەریکی جووت دەبێت و لە کاتی کێڵانی دەورووپشتی دارتوویەکی گەورەی زەوی‌یەکەدا ئەم بەردە دێتە سەر. ئەم جوتیارە بەردەکە دەباتەوە و لەحەوشەی ماڵەکەیدا دەیکاتە خوێڕزگ، هەتاکو شەهید، کە ئەو کاتە پێشمەرگەیەکی ی. ن: ک. بوو، چاوی پێی دەکەوێت و دەرک بە گرنگی و بەهای مێژوویی دەکات. بۆیە لەگەڵ جوتیارەکە قسە دەکات و داوای لێ دەکات بە شێوەیەکی گونجاو بیپارێزێت. بەڵام گوندەکە، وەک چوارهەزار گوندەکەی تری

لەبەر بەردەکە خۆی ڕونووسی کردووەتەوەو، لە پاش دا لە ١٩٩٧دا خوێندنەوە و وەرگێڕانێکی سەرەتایی لە لایەن هەردوو خاتوو 'ڕافیدە عەبدوڵلا قەرەداغی' و نووسەرەوە بلاو کراوەتەوە.[٢]

بەردەکە ڕەنگێکی کەوەیی کالی هەیە و لە جوری لایمستۆن (=Limstone)ە و قەبارەی ٢٧× ٣٧× ٧٦ سم ە. شیکاری جیۆلۆجی‌یانەی بەردەکە لە لایەن بەڕێوەبەری

---

کوردستان، لە سالی ١٩٨٨ دا کەوتە بەر شالاوی *ئەنفال* و تارومار کرا و بەردەکەش وەک کەل و پەلی تری مالەکە، بوو بە ژێر وێرانە و دارو پەردووی دێ یەکەوە. بەڕێز هەلەدنی، کە لەپاش ئەم شالاوانەدا لە شاخ و کێوەکانی دەورەپشتی ناوچەکە بوو و هاتبووەوە بۆ چالاکی پێشمەرگانە، توانی بە هێنی و زۆر بە ئازایانە و بوێرانە بەردەکە لەژێر خاک دەربهێنێتەوە و لە شوێنێکی بێ ترس بۆ پاراستن بیشارێتەوە. ئەم کارە لە ڕاستیدا پالەوانانە بوو، چونکە سەرباری ئەوەی کە خۆی پێشمەرگە بوو و لەگەل ڕژێم دا لە شەڕ دا بوو، سزای بوون لە ناوچەکانی دێهاتە خاپوور کراوەکان و دەرەوەی شارەکانیش بێ لێپێچانەوە کوشتن بوو. خۆشبەختانە بەڕێز غەریب هەلەدنی توانی بەردەکەش و ژیانی خۆیشی تا پاش ڕاپەڕینی دوای جەنگی کەنداوی ١٩٩١ بپارێزێت، بەتایبەتی کە تەنها خۆی شوێنی حەشاردانی بەردەکەی دەزانی. لە ١٩٩٣ دا بەردەکەی دەرهێنایەوە و لەڕێی لێپرسراوی مەکتەبی ڕاگەیاندنی مەلبەندی سلێمانیی ی. ن. ک.، بەڕێز ئەحمەد حەمە سالح و بەڕێوەبەری تەلەفزیۆنی *PUK* لە سلێمانی بەڕێز عەباس عەبدولڕەززاق، بەبێ بەرامبەر پێشکەشی ئەنتیکەخانەی سلێمانیی کرد. گوێی نەدا بەو هەموو هەول و تەقەلایەی قاچاغچی و تالان کەرانی شوێنەوار کە لەگەلی دایان بۆ فرۆشتن و بردنی بۆ دەرەوەی وولات. تەنها مەردی و گوردیی ئەم پیاوە بوو کە ئەم پارچە بەنرخ و بەبەهایەی لە فەوتان ڕزگار کرد و بۆیەشە بەردەکە لەوکاتەوە ئیتر بە بەردەکەی شەهید غەریب هەلەدنی ناسرا و منیش لەم باسەدا هەر بەو ناودوە ناوی دەبەم. لە باسی کەسانی وەک غەریب هەلەدنیدایە کە هێمن دەلێت: زۆرن لە کوردەواریدا لەوانەی "بە شەرەفەوە ژیاون و بەشەرەفەوە دەمرن و مێژووش لە بیریان دەکات،" بەلام ئێمە غەریب هەلەدنی لە بیر ناکەین.

[2]قرەداغی، رافدە عبدالله و کۆزاد محمد احمد ، "صخرة غریب هەلەدنی: حقائق و معلومات وثائقية،" *هەزارمێرد* ١ (١٩٩٧)، ل. ١١٥-١٢٣.

دەستگای مالینی جیۆلۆجیی پاریزگای سلێمانی، بەڕێز 'موحەممەد ئەحمەد ڕەحیم' دوە، دەری خست کە لە لایمستۆنێکی ئەندامی (=Organic) پێک هاتووە کە بۆ دۆلۆمـــایت (Dolomite) گۆڕاوە، سەختیەکەی بە پێی پێوەری مۆس Mohs ٣,٥ پلەیە و تیکێکی کلسیی ئەستونیی تێدایە. بەردەکە لەو پێکهاتەیەیە کە لە جیۆلۆجیادا بە 'پێکهاتەی قەمچوغە' ناسراوە، کە پێکهاتەیەکی ناوچەیی‌یە بە ناوی دێی قەمچوغەوە ناو نراوە کە هەر لە زنجیرە چیای سورداشە لە نزیک پیرەمەگرون.[3] ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە نووسینەکە لە کاتی خۆیدا لەهەمان ئەم ناوچەیەدا نووسراوە و ماددەی خۆماڵیی ئەم شوێنەی بۆ بەکار هاتووە. دەشێت ئەوەش هەڵبهـــێنـــجێـــنـــین کە یەکێـــک لە نـــاوە جوگرافی‌یەکانی لە نووسینەکەدا هاتوون، لە گوندی قەرەچەتان یان نزیکی دا بووە، بە پێی ئەوەی نووسینەکەی تیادا دۆزراوەتەوە کە بۆ یادەوەری سەرکەوتنی بووە بەسەری دا.

بەڕێز هەڵەدنی هەواڵی گرنگ و سەرنج ڕاکێشی تری پێ بوو سەبارەت بە بوونی شوێنەواری تر بە قەد شاخە سەختەکەی پشت گوندەکەوە. بۆ ئەم مەبەستە، دایەرەی شوێنەواری سلێمانی لیژنەیەکی بۆ سەردانی شوێنەوارەکە و دەورووپشتی پێک هێنا کە نووسەریش تیایدا ئەندام بوو. لە پێشدا، ڕاستەوخۆ لە پشت گوندەکەوە، دوو ڕیز شورەی درێژی لە گاشە بەرد بنیات نراو هەن کە کاتی خۆی دەمی دۆڵە بەردینە تەسکەکەیان داخستووە بۆ پاراستنی دژە شاخاوی‌یەکەی ناو دۆڵەکە کە تا ناوقەدی شاخەکە کشـــاوە و ئێستا شوێنەوارەکانی ماون. لـــە پشت شورەکانەوە نەخشێـــکـــی هەڵکەندراوی قەد شاخ هەیە کە بە داخـــەوە زۆر خراپ بە بەفرو باران داشۆراوە و سڕاوەتەوە. ئەم نەخشەش بۆ یەکەم جار لەلایەن بەڕێز هەڵەدنی‌یەوە بینراوە و دۆزراوەتەوە.

---

[3] بڕوانە: *هەمان سەرچاوەی پێشوو*، ل. ١١٦، پەراوێزی ٢.

نەخشەی ژمارە ٥: شوێنی دۆزینەوەی نووسینەکانی سەرپول و هەڵەدنی و بێتواتە.

بابەتەکەی بریتی‌یە لە شێوەی پیاوێک کە کڵاوێکی شێوە نەناسراوی لە سەردایە و لە دواوەی دوو تاڵی درێژ و باریکی پێوەیە بۆ خوارەوە شۆڕ بوونەتەوە. بەرگێکی کورتی تا سەر ئەژنۆی لە بەردایە و شتێکی بەدەستەوەیە کە بە تەورزین دەچێت. سڕانەوەی زۆر لە ووردەکاری‌یەکانی، زۆر نارەحەتی کردووە بتوانرێت مێژوویەکی ووردی بۆ دیاری

بکرێت. هەرچەندە بە ڕواڵەتی گشتی نەخشەکـــەدا زیاتر لەوە دەچێت هی سەردەمێکی درەنگتر لە سەردەمی ئیدیـــ(ــن)-سین بێت، لەوانەیە هی سەردەمی ئێرانی‌یەکان (میدی‌یەکان؟) بێت، ئەگەر هی لوللوبی‌یەکانی سەردەمی ئاشورناسیرپالی دووەم نەبێت.

وێنەی ژمارە ١٢: پلیکانەکانی لە شاخی پیرەمەگرون هەڵکەندراون، لەپشتی ئەو شوێنەوە کە نووسینەکەی هەڵەدنی تیادا دۆزراوەتەوە.

ئاشورناسیرپال لە ساڵنامەکانی دا باسی شاڵاو بردنە سەر و داگیرکردنی شار و ئاوەدانی‌یەکانی دامێن و قەدپاڵی کێوی نیموش (=پیرەمەگروون) دەکات کە گەورەشاریان *'بوناسی Bunasi'* بووە و فەرمانڕەواکەی *'موساسینا Musasina'* ناوێک بووە.[٤] زیاتر بۆ سەرەوە بە دۆڵەکەدا و لە نێوانی زەردو ماهی چیاکەدا، زۆر

[4] Grayson, *RIMA 2,* A.0.101.1 (No. 1), ii 33b-38, p. 204.

شوێنەواری گرنگی تر دەبینران، ژمارەیەک پلیکانە و ڕاڕەو و ڕێچکەی لە بەردی شاخەکە داتاشراو (بڕوانە وێنەی ژ. ١٢) و زۆر شوێنەواری قوڵلەو حەسار و شورا و لە سەرووی ئەمانەشەوە تاقێکی پچووکی لە قەد شاخ هەڵکەندراو (نزیکەی ٣٠سم × ٣٠سم) کە بێ خواوەندێکی لەسەر تەخت دانیشتووی سەر لێ کراوەی تێدایە. هەموو ئەمانە دەشێت ئاماژە بن بۆ بوونی یەکێک لەو شارانەی ئاشورناسیرپال باسی کردوون و لەوانەشە پێش ئەو پایتەختی یەکێک لەو فەرمانڕەوایانە بووبێت کە ئیددیـــ(ـــن)-سین بەزاندوونی و بەبۆنەیەوە ئەم میلی سەرکەوتنەی کە بەردەکەی غەریب هەڵەدنیە، لەم شوێنەدا، لەدەم دەرگای شارەکەی دا دانابێت.

بگەڕێینەوە بۆ لای بەردەکە، نووسینەکەی دابەش کراوەتە سەر دوو ستوون کە ١٠٠ دێڕی ماون. وا پێ دەچێت دێڕی تر لە بەشی خوارەوە هەبووبن، چونکە کلێشەی نەفرەت و تووک کە لە زۆربەی نووسینەکانی لەم جۆرەدا هەبوون، دیار نیە. هەرچەندە، لە لایەکی ترەوە دەستەواژەی «$^{d}$*Ni-iš-ba* LUGAL *8 ku-li-ši*» کە لە کۆتایی نووسینەکەدا هەیە، دەکرێت دەستەواژەی داخستنی دەقەکە بێت، هەروەک چۆن لە سەرەتاش دا دەستەواژەی دەست پێ کردن و کردنەوەیە. خەتی نووسینەکە لە خەتی نووسینەکانی تری ئیددیـــ(ـــن)-سین کە لە بێتواتە دۆزراونەتەوە (چوار پارچەیان لە ئەنتیکەخانەی عێراقین لە بەغدا و یەکێکیان لە ئەنتیکەخانەی ئورشەلیم-قودس)، جیاواز نیە. بەگشتی ڕوخسار و ڕواڵەتی خەتی سەردەمی ئەکەدیی کۆن Old Akkadianی پێوە دیارە، بۆ نموونە وەک بەکارهێنانی نیشانەی LUM بۆ دەربڕینی دەنگی *núm*، TI بۆ *dì* و GA بۆ *kà*. هەردوو شافەر Shaffer و ڤاسەرمان Wasserman کە نووسینەکەی ئیددیـــ(ـــن)-سین ی ئورشەلیم (ID 4) یان بڵاوکردووەتەوە،[5] تێبینیان

[5]سوپاسی تایبەتیم بۆ بەڕێز د. ناثان. ڤاسەرمان N. Wasserman ی زانکۆی عیبری لە ئورشەلیم-قودس کە دەقی باسەکەی خۆی و شافەری بۆ ناردم و ڕێگای دام پێش بڵاوبوونەوەی بۆ ئەم باسەم

کردووه که بەها دەنگی‌یەکانی نیشانەکانی نووسینەکەی ئورشەلیم، کە بۆ نووسینەکەی ئێمەش (=هەڵەدنی) دروستە، لە هەمان نیشانەکانی نووسینەکانی *ئێشنوننا Ešnunna* ی سەرەتای سەردەمی بابلیی کۆن EOB یشدا هەن.[٦] بەکارهێنانی ئامرازی پەیوەندی (= Preposition) ی وەک *ina* لەجیاتی *in* و *ana* لە جیاتی *an* بەڵگەن بۆ دەمێکی دواتر لە سەردەمی ئەکەدیی کۆن. نووسینەکەی ئورشەلیم بۆ تێگەیشتن لە ووشەی ***tenīštum*** ی دێڕی ١٣ ی نووسینەکەی هەڵەدنی یاریدەدەر بوو، چونکە ئەم ووشەیە لەوێشدا هاتووە و بۆ واتای "خەڵک" بەکار هاتووە، هەرچەندە ووشەیەکە لە نووسینەکانی سەردەمی ئەکەدیی کۆن دا نەهاتووە.[٧] نووسینەکەی هەڵەدنی، بە پێچەوانەی هەموو ئەوانی تری ئیددیـــ(ـــن)-سین ەوە، لە دەقەکەدا لە کەسی سێیەمەوە ناگۆڕێت بۆ کەسی یەکەم. جێگای سەرنجیشە کە لە هەندێک دێڕدا، وەک دێڕەکانی ٥، ٤١، ٤٦، ٨٠ و لەوانەیە ٦ و ٧یش، ووشەکە، بە پێچەوانەی نەریتی نووسینی مێخیی ئەو کاتەوە، تا کۆتایی دێڕەکە درێژ نەبووەتەوە.

وا لێرەدا خوێندنەوە و وەرگێڕانی دەقەکە دەخەینە پێش چاو:

---

بەکاری بهێنم. ڕونووسێکی ڕەشنووسەکەی بۆ ناردم کە لە ژمارەی *ZA* 93 (2003) دا چاوەڕوانی بلاوبوونەوە بوو. هەروەها دەبێت سوپاسی خاتوو پرۆفێسۆر ئورسولا زایدل Ursula Seidl یش بکەم کە لەهەمان باس دا بەشدار بووە و لەلایەنی هونەریی نەخش و نیگارەکان و ئایکۆنۆگرافیی نەخشەکەی ئورشەلیمی کۆڵیوەتەوە و ئەویش ڕەزامەندی خۆی لەسەر ناردنی ڕەشنووسی باسەکەی بۆم، دەربڕیبوو.

[6] Shaffer, A. and N. Wasserman, "Iddi(n)-Sîn, king of Simurrum: A New Rock-Relief Inscription and a Reverential Seal," *ZA* 93 (2003), p. 36.

[7] Shaffer and Wasserman, p. 13-14.

شافەر و ڤاسەرمان دەڵێن: "تا ئێستا تەنها لە دەقێکی بۆغازکۆی دا هاتووە وەک فۆرمێکی جیاوازی فۆرمی باوی *tenêštu*، "خەڵک" (بڕوانە: *AHw. 1347*s.v.)".

ستونی I:

1) [*x-x*] $^{d}$*Ni-*[*iš-ba*]
2) [PA?] LUGAL 8 *k*[*u?*]-[*li?-ši?*]
3) *kí-nu-*[*um*]
4) ⸢$^{d}$⸣ *I-dì-*$^{d}$EN.Z⸢U⸣
5) [LUG]AL *da-núm*
6) [LUG]AL *Si-mu-ri-im*$^{ki}$
7) NUN $^{d}$INANNA [x?]
8) *i-dì-šum-ma*
9) $^{d}$*Ni-iš-ba*
10) [*be*]*-el-šu*
11) [*kak?*]*-kà-am*
12) [*da*]*n?-na-am*
13) [*t*]*e-e-n*⸢*e*⸣*-eš*$_{15}$
14) [*ma*]*-tá-tim*
15) [*ma*]*-at Ša-gi*$^{ki}$
16) [*ú-ḫa*]*-li-iq*
17) [... ... ...]-GA-TI
18) [... ... ...]*-šu-nu*
19) [... ... ...]*-IZ-*[*x*]*-GA*
20) [*ma-at*] *Te-ni/lí-mu?*$^{ki}$
21) [*ú-ḫa-l*]*i-iq*
22) [... ... ...]*-ta/ša-am*
23) [... ... ...]-[*š*]*u?-nu*
24) [*i-ne*]*-er*
25) [... ... ...]*-ar*$^{ki}$
26) [*ú-ḫa*]-[*l*]*i-iq*
27) [... ... ...]*-uš-nu*
28) [... ... ...]*-šu-nu*
29) [*i-ne*]*-er*
30) [... ... ...]*-na*$^{ki}$
31) [*ú-ḫa*]*-li-iq*
32) [... ...]*-lum-a-tal*

33) [... ... ]$^{[GIŠ]}$GU.ZA
34) [*ma-at*] *Si-mu-ri-im*$^{ki}$
35) [*i*]-*ne-er*
36) [*ma-a*]⌜*t*⌝ ⌜?⌝-*bí/ne-šum*$^{ki}$
37) [*ma*]-⌜*a*⌝*t Š*⌝*a-ri-da-ḫu-um*$^{ki}$
38) [*iṣ*]-*ba-at*
39) [...] ⌜*Ḫul?-gi/zi*⌝-*za-tal*
40) [...]-*GA/AM?-ri*-⌜*ni*⌝?-*we*
41) [*be?*]-*li-šu-nu*
42) [...]-⌜*múš?/suḫ-iš*⌝-*ti*
43) [*ma?-at?* ...]-*ti-na-ab-ba-ša-we*$^{ki}$
44) [*ú-ḫa*]-*li-iq*
45) [... ... ...]-*li-li*
46) [... ... ...]-*šu-nu*
47) [*i*]-*ne-er*
48) [*m*]*a-at Ḫal-ma-an*$^{ki}$
49) *ma-at Be-el*$^{ki}$
50) [*iṣ*]-*ba-at*
51) [*An?*]-*nu-ba-ni-ni*
52) [LUGAL *Lu-lu-bi*]-⌜*im*$^{ki}$⌝

شکاوی؟

**ستوونی II:**

(نزیکەی پێنج دێڕ شکاون)

58) *Ti-da-luḫ-ḫa-am*$^{ki}$
59) *ú-ḫa-li-iq*
60) *ma-at Ši-ik-ša-am-bi*$^{ki}$
61) *ú-ḫa-li-iq*
62) *ma-at I-te-ra-áš*-⌜*we*$^{ki}$⌝
63) *I-tu*$^{ki}$

64) *Ša-um-mi*$^{ki}$
65) *ù ⸢Ḫu⸣-⸢b⸣i/⸢n⸣e-za-gu*$^{ki}$
66) *a-na še-e[p]*
67) $^{d}$*Ni-iš-ba*
68) *ú-kà-ni-ís-sú-nu-ti*
69) *ma-at Ut-tu-we*$^{ki}$
70) *i-na qá-ti*
71) *kak-mi-im*$^{ki}$
72) *⸢ut(?)⸣-ti-ir*
73) *ma-at Kak-mi-im*$^{⸢ki⸣}$
74) *ú-ḫa-li-[iq]*
75) $^{m}$*Ma-d/ki-a-[x]*
76) $^{m}$*Ša-wa/i/pi-a-[x]*
77) $^{m}$*Ma-gi-ba-⸢bi/am/ta⸣*
78) $^{m}$*A-ḫa-⸢tum⸣*
79) $^{m}$*A-wi-la-núm*
80) *ra-bí-a-nu*
81) *A-mu-ri-im*
82) *i-ne-er-šu-nu-ti*
83) *ù A-mu-ra-am*
84) *i-na kúl-le-⸢e?⸣-šu*
85) *iṭ-ru-*<<*u*$_4$>>*-us-sú*
86) $^{d}$*Ni-iš-ba*
87) *be-el-šu*
88) *a-wa-as-sú*
89) *⸢iš⸣-me-ma*
90) *ma-tá-tim*
91) *ú-⸢ḫa⸣-li-iq*
92) *A-mu-ra-am*
93) *⸢ù⸣ Si-maš-kà-am*$^{ki}$
94) *i-ne-er*
95) $^{d}$*I-dì-*$^{d}$EN.ZU
96) *qar-dum*
97) *i-lu-šu-nu-ti*
98) *a-na še-ep*

99) $^{d}$*Ni-iš-ba*
100) *be-li-*⸢*šu*⸣
101) *ú-kà-ni-ís-sú-nu-t*[*i*]
102) *ma-tá-tum*
103) *ša i-te-bu-*⸢*šu*⸣*-na-ti*
104) ⸢É⸣ $^{d}$*Ni-iš-ba*
105) [LUGAL] *8* ⸢*ku?*⸣-[*li?-ši?*]

(شکاوی؟)

شێوەی ژمارە ٧: ڕونووسی نووسینەکەی سەر بەردەکەی هەڵەدنی.

وەرگێڕان:

ستوونی I:

١) [× ×] خوداوەند نیـ[ـشبا]، ٢) [داردەستـ؟] (ـی) ٣) نەگۆڕی ٢) پادشایەتیی هەشت هە[رێمانـ؟]ـی ٤) (بە) ئیددیـ(ـن)-سیـ⌝ـن⌜، (ی) ٥) [پادشـ]ـای بەهێز، ٦) [پادشـ]ـای سیموررروم، ٧) میری شاوشکا /ئیشتار ٨) دا. ٩) نیشبا ١٠) [سەر]وەریێی، ١١) (بە) چەکی ١٢) [بە]هێزی ١٣) [گە]لانی ١٤) [وو]لاتانی: ١٥) [وو]لاتی شاگی ی ١٦) [ویران]کرد، ١٧) [........]، ١٨) [........]کانیان، ١٩) [........]، ٢٠) [وولاتی] تێنـ/لیمو (ی) ٢١) [ویران کر]د، ٢٢) [..........]، ٢٣) [......] [کانـ]ـیانی ٢٤) [سەر بڕ]ی، ٢٥) [وولاتی /شاری .....]ـار ٢٦) [ویران کـ]ـرد، ٢٧-٢٨) [.......] (و) [........] کانیانی ٢٩) [سەربڕ]ی، ٣٠) [وولاتی /شاری.....]ـنا ٣١) [ویران] کرد ٣٢) [......]ـلوماتال، ٣٣) [........]ی /سەر (؟) تەختی ٣٤) [وولاتی] سیموررروم ٣٥) [سەر]ی بڕی، ٣٦) [وولا]تی ...⌝-بـ/نێشوم، ٣٧) [وو]⌝لاتی شـ⌜ـاریداخوم ی ٣٨) [گر]ت، ٣٩) [...] ⌝خولـ(؟)-گیـ/زیـ⌜ـزاتال ٤٠) [....] گا/ئام-ری-نی(؟)-وێ، ٤١) [سە]ردار/خواوەندەکانیان (؟) ٤٢) [...] ⌝موش؟/سوخ-یش⌜-تی ٤٣) [وولاتـ(؟)ـی ...]ـتینابباشاوێ ی ٤٤) [ویران کـ]ـرد، ٤٥) [..........]ـلیلی، [.......]ـیان ٤٧) [سەر]ی بڕی ٤٨) [و]ولاتی خالمان، ٤٩) وولاتی بێل ی ٥٠) [گـ]ـرت. ٥١) [ئانـ]ـوبانینی، ٥٢) [پادشای لوللوبـ]⌝ـوم.⌜

شکاوی (؟)

ستوونی II:

(نزیکەی پێنج دێڕ شکاون)

٥٨) تیدالوخخوم ی ٥٩) وێران کرد، ٦٠) وڵاتی شیکشامبی ی ٦١) وێران کرد، ٦٢) وڵاتی ئیتێراشـ⌝ـسوێ،⌜ ٦٣) (شار (؟)ـــی) ئیتو، ٦٤) (شار(؟)ـــی) شاومی، ٦٥) و (شار(؟)ـــی) ⌝خو⌜-بـــ/نیزاگو ٦٨) خستنیە ٦٦) ژێر پێ[ی] ٦٧) خواوەند نیشباوە. ٦٩) وڵاتی ئوتووێ ی ٧٠) لەدەست ٧١) (وڵاتی) کاکموم ٧٢) سەندەوە (و) ٧٣-٧٤) (ئەمجا) وڵاتی کاکمومی خاپور کرد. ٧٥) ماد/کـــ/قیا-[×]، ٧٦) شاوا/ویـــ/پیا-[×]، ٧٧) ماگیبابی/ــــام/تا، ٧٨) ئەخاتوم، ٧٩) (و) ئەویلانوم؛ ٨٠-٨١) فەرمانڕەوا/ شێخە ئاموری‌یەکان، ٨٢) سەری بڕین ٨٣-٨٥) و ئاموری‌یەکانی لە هەرێمەکەی (واتا هەرێمی قەڵەمڕەوی ئیددیـــ(ـــن)-سین) گێڕایەوە دواوە. ٨٦) خواوەند نیشبا، ٨٧) سەروەری (ئیددیـــ(ـــن)-سین) ٨٨-٨٩) ووشە(کانـــ)ــی (= نزاکانی) ئەوی بیست (و) ٩٠-٩١) وڵاتەکانی (بۆ) تارو مار کرد (و) ٩٢-٩٤) ئاموری‌یەکان و سیماشکی‌یەکانی (بۆ) سەربڕی. ٩٥) (لەبەرامبەردا)، ئیددیـــ(ـــن)-سین ی ٩٦) پاڵەوان ٩٧-١٠١) خواوەندەکانیان خستە ژێر پێی خواوەند نیشبای سەروەر⌝ی.⌜ ١٠٢) وڵاتەکانی ١٠٣) کە یاخی بوبوون؛ ١٠٤) ⌝پەرستگا⌜ی نیشبا، ١٠٥) [پادشای] هەشت هە[رێمان؟] [یان بنیات نا(؟)/ ڕازاندەوە (؟)/ قوربانی‌یان پێشکەش کرد(؟)].

شکاوی‌یەکی ڕادە نەزانراو.

## ڕاڤە و لەسەر ووتن:

١) نارەحەتە بە دڵنیایی‌یەوە ئەو ووشەیە بزانین کە پێش ناوی خواوەند نیشبا کەوتووە. دەکرێت ئامرازی پەیوەندی (=Preposition) *a-na* بێت کە واتای "بۆ" دەگەیێنێت و دەشکرێت ڕستەکە ڕستەی بانگ (=Vocative) بێت، هەرچەندە ئەمەیان دوورترە. ئایا دێرێکی تر لەپێش ئەم دێری یەکەوە هەبووە یان نا، ناتوانرێت بە هیچ دڵنیایی‌یەکەوە وەڵام بدرێتەوە، ئەوەندە نەبێت دەتوانین بڵێین زۆر دوورە هەبووبێت. گرفتەکە لەوەدایە کە ئەو نیشانە مێخی‌یانەی پێش ناوی خواوەند نیشبا هەبوون و شکاون، گرنگی‌یەکی زۆریان بۆ تێگەیشتنی دەقەکە هەیە. نیشبا پێشتریش لە ڕێی نووسینەکانی تری ئەم پادشایەوە ناسرابوو؛ لە نووسینەکانی بێتواتە (ID 1, 2, 3)،[٨] سەرپول (ID 5) و ئورشەلیم (ID 4).[٩] هەروەک لە دێڕەکانی ٨٧ بە *be-el-šu* و ١٠٠ بە *be-li-šu* لەم دەقەدا وەسف دراوە، دەردەکەوێت کە خواوەندێکی نێرینە بووە. پێناچێت بکرێت لەگەڵ خواوەند *Nissaba* دا، کە خواوەندی مێسۆپۆتامیایی دانەوێڵە بووە و مێینە بووە، بەیەک بزانرێن. چونکە، جگە لەوەی لە توخمدا جیان، خوری‌یەکان کە لە سەردەمی

---

[8] هەروەها بڕوانە:

Cavigneaux, A. and M. Kerberink, "Nišba," *RlA* 9 (1998-2001), p. 584-5.

[9] ئەم ژمارانەی بۆ دەقەکانی ئەم پادشایە دانراون (ID 1, 2, 3, 4, 5 ..etc.) لە لایەن شافەر و ڤاسەرمانەوە لە باسە ئاماژەبۆکراوەکەیاندا دانراون لە پەراوێزی ژ. ٢. بۆ ئەوەی خوێنەران و توێژەران سەریان لێ تێک نەچێت و دەقەکان تێکەڵ نەکەن، وام بە باشتر زانی لەم باسەدا دەقەکان بەو ناوانەوە باس بکەم کە باشتر پێی ناسراون، نووسینەکانی بێتواتە دەکاتە ID 1, 2, 3، ئورشەلیم دەکاتە ID 4، سەرپول دەکاتە ID 5 و هەڵەدنیش دەبێتە ID 6.

ئەکەدی‌یەوە بەشی هەرە زۆری ڕەمەی سیموررروم بوون، بۆ دانەوێڵە خواوەند کوموروێ *Kumurwe*ʻیان هەبوو. کوموروێ فۆرمێکی تری ʻکوماربی *Kumarbi*ʻ یە کە هەندێک جار لە لیستی ناوی خواوەندانی خوری-هیتی دا لەجیاتی ناوەکەی، ʼدانەوێڵەʻ بەزمانی هیتی دەنووسرا.[١٠] ئەمە ئەوە دەگەێنێت کە نیشبا خواوەندێکی تر بووە، خواوەندی (مێینەی) دانەوێڵەی مێسۆپۆتامیایی نەبووە. تا ئێستا کۆنترین هاتنی زانراوی ئەم ناوە، لە ناوی کەسێی پادشای سیموررروم دا بە شێوەی ʼکا-نیشبا KA-*Ni-iš-ba*ʻ هاتووە، ئەویش لە نووسینە شاهانەکەی ئێرپریدو-پیزیری پادشای گوتیوم دا.[١١] لەهەمان ئەم نووسینەی پادشای گوتیومدا وەک ناوی چیاش هاتووە[١٢] و لەوانەشە هەر ئەو بێت کە وەک بەشی تیۆفۆریی ناوێکی کەسیش لە نامەیەکی شاری ماری دا بە شێوەی: *Ḫa-ab-du-ni-iš-pa* هاتووە.[١٣] سەیر ئەوەیە ناوی نیشبا لەم نامەیەدا بەبێ نیشانەی خواوەندێتی، کە هەمیشە لە پێش ناوی خواوەندانەوە دەنووسرا، نووسراوە. هۆی ئەمە لەوانەیە ئەوەبێت کە مەبەستیان لە نیشبای چیا بووبێت، نەک نیشبای خواوەند. ئەم ناوی چیایەش بە شێوەی نیشبا، ناوی چیای ʼنیشپی *Nišpi*ʻ یان ʼنیسپی *Nispi*ʻ مان یاد دێنێتەوە کە ئاشورناسیرپالی دووەم لە ساڵنامەکانیدا لە باسی لەشکرکێشی‌یەکەی بۆ سەر زاموا تۆماری کردووە.[١٤] شایانی باسیشە کە ناوی خواوەند نیشبا لە لیستی ناوی خواوەندانی ناسراو بە AN=$^{d}$*Anum* دا نەهاتووە.[١٥]

---

[10]بڕوانە:

Wilhelm, *The Hurrians,* p. 52.

[11]بڕوانە:

Kutscher, *Op. Cit.,* col. Iii BT 3, 9′; col. Viii BT 2, 8′.

[12] *Op. Cit.,* col. ix BT 2, 3′; col. X BT 3 5.

[13] Shaffer and Wasserman, p. 11-12.

تێبینی بکە کە ئەمان ناوی نیشبا لە دەقەکەی ئورشەلیمدا بە شێوەی *Ni-iš-pá* دەخوێندنەوە.

[14] Grayson, *RIMA 2,* A.0.101.1 (No. 1), ii 48-49a, p. 205; ii 72b-76a, p. 207.

[15] Kreberink, M., "Die Götterlisten aus Fara," *ZA* 76 (1986), p. 161-204.

(لیستەکە لە لاپەڕەکانی ١٦٨-١٩١ دایە).

٢) **[PA?] LUGAL 8 *k[u-li-ši]***: ووشەی *kuliši* لەڕاستیدا پڕ گرفتە، بە تایبەتی بەهۆی شکاوی و داخوراوی بەردەکەشەوە لەشوێنی نووسینەکەیدا. بەڵام هەرچۆنێک بێت، هاتنی لەنووسینەکەی ئورشەلیمیشدا بەشێوەی *ù* LUGAL 9 *ku-li-ší* لە ستوونی i، دێڕی 14′ و *ku-li-šu-um* لە ستوونی v، دێڕی 1 دا، تێگەیشتنی بۆمان ئاسانتر کرد. وەرگێڕان و لێکۆڵەرەوانی نووسینەکەی ئورشەلیم بە "هەرێم" یان "ناوچە" لێکیان داوەتەوە (*kulišum**)، واتە یەکەیەکی سیاسی یان جوگرافی، کە وا پێ دەچێت بنەچەیەکی نا سامیی هەبێت.[١٦] ئەم لێکدانەوەیە بەلای ئێمەشەوە پەسەندە، چونکە بەباشی لەگەڵ شوێنەکەیدا لە ڕستەکەدا دەگونجێت، هەم لە نووسینەکەی ئورشەلیم و هەم لە نووسینەکەی هەڵەدنیشدا کە لە دێڕەکانی ١و١٠٥ و لەوانەشە ٨٤ یشدا هاتووە. لە هەردوو جێگای یەکەم و دووەمدا وادیارە وەک نیشان و ناوبانگ (= Title and Epithet) ی نیشبا، نەک پادشا، بەکار هاتبێت، بەو پێ یەی کە گەورە خواوەندی شانشین پادشای ڕاستەقینەیە و هەموو هەرێم و ناوچەکان هی ئەون. بەڕێز کریسپاین، مامۆستای سومێرۆلۆجیی زانکۆی لایدن لەگەڵ ئەم ڕایەدا نیە کە خواوەندێک وەک پادشای ڕاستەقینەی وولات ناو ببرێت، چونکە تائێستا لە دەقی تردا وا نەهاتووە. ئەم ڕایە بەڵگەیەکی بەراووردکارانەی ئەقڵ گرە، بەڵام هاتنی هەمان دەستەواژە لە لەکۆتایی نووسینەکەدا لە دێڕی ١٠٤-١٠٥ بەبێ ناوبردنی پادشا، هەرچەندە نووسینەکە داخوراوە، بەڵام ئەوەندە ڕوونە کە تەنها نیشبا مەبەستە و ناوی کەسی تری تێدا نیە، وامان لێ دەکات بڵێین ئەم نیشان و ناوبانگە هی نیشبایە نەک پادشا. ئەگەر وای دابنێین ووشەیەکی وەک PA (بە ئەکەدی *ḫaṭṭu* ە، واتا: داردەستی فەرمانڕەوایی) لەپێش

---

هەروەها بڕوانە:

Shaffer and Wasserman, p. 12.

[16] Shaffer and Wasserman, p. 13.

ووشەی LUGAL (بە ئەکەدی *šarru* ە، واتا: پادشا) هەیە، ئەوا ڕستەکە ئەو کاتە ناکرێت دەستەواژەیەکی نیشان و ناوبانگ بێت، بەڵکو دەبێتە ڕستەیەکی هەواڵ بەخش، شتێک سەبارەت بەوە دەڵێت کە خواوەند داویەتی و ئەمەش گرفتێک لەگەڵ ووشەی *kīnum* دروست دەکات کە نابێت لەباری نۆمینەتیڤ (=رفع) دا بێت. ئەم گرفتەی دوایی‌یان دەکرێت بە کەم و کورتی لە زانینی زمانی ئەکەدیی نووسەری دەقەکە لێک بدرێتەوە کە زمانی زگماکی خوری بووەو کاریگەریی ئەم زمانە زگماکەشی لە شوێنی تری دەقەکەدا تێبینی دەکرێت (بڕوانە تێبینیمان لەسەر دێڕەکانی ٩٥-١٠١ و ١٠٢-١٠٥). لەگەڵ ئەمەشدا، ئەگەر ئەو وەرگێڕانەی سەرەوە ڕاست نەبێت، ئەوا وەرگێڕانێکی تر کە لەگەڵ ئەو نیشانە مێخی‌یانەی کە لەم شوێنەدا ماونەتەوە بگونجێت ئەمەیە : "خواوەند نیشبا پادشای هەشت هەرێمـــ(ـــی وولاتە). (خواوەندی) نەگۆڕ. ئیددیـــ(ـــن)-سین، پادشای بەهێز، پادشای سیموررروم، میری شاوشکا/ ئیشتار. نیشبای سەروەری چەکێکی بەهێزی دایە." ئەمەیان ئاسانتر دێتە پێش چاو، هەرچەندە لە شێوەدا لە گەڵ داڕشتنی دەقەکەی ئورشەلیمدا یەک نایەتەوە. هەرچۆنێک بێت، گرفتی ئەم ڕستەیە تا ئەو ڕۆژەی بەڵگەی نوێ و نووسینی تری هاو شێوە دەردەکەوێت، بەکراوەیی دەمێنێتەوە و ناتوانرێت دوا قسەی تێدا بکرێت.

بگەڕێینەوە بۆ ووشەی *kulišum*، لە دێڕی ٨٤ یشدا هاتووە و وا دیارە شتێکی وەک "نیشتیمان" یان "قەڵەمڕەو" دەگەیێنێت. ئەوەی زیاتر جێگای سەرنجە، ئەو ژمارەیەی کە لەم نووسینەدا لەگەڵ ئەم ووشەیەدا هاتووە، ژمارە هەشتە، کەچی لە نووسینەکەی ئورشەلیمدا نۆیە. وا پێدەچێت ئەمە ئاماژە بێت بۆ زیادکردنی هەرێمێکی تری شانشین بە داگیرکردنی وولاتێکی تر لە قۆناغێکی دواتردا، کە قۆناغی نووسینی دەقەکەی ئورشەلیمە. ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، واتای وایە کە نووسینەکەی هەڵەدنی لە نووسینەکەی ئورشەلیم کۆنترە. ئەم نیشانە، بەتایبەتی لە نووسینەکەی ئورشەلیمدا، نیشانی

شاهانەی ئەخەمینیمان یاد دێنێتەوە کە داریوشی یەکەم (٥٢١-٤٨٦ پ.ز.) لە نووسینەکانیدا بەکاری دەهێنا بەشێوەی: "خشایاثیا دەهیونام" “*Xšāyaθiya dahyūnam*” "= پادشای وولاتان،" و پاش چەند دێڕێک ژمارەی وولاتەکان دەهات کە فەرمانڕەوایی دەکردن.[١٧]

٤) *Iddi(n)-Sîn*: ئەم خوێندنەوەیە و وەرگێڕانەکەی بە ’(خواوەند) سین داویەتی‘یە، بە واتای ئەوەی ئەم کەسە بەخششی خواوەند سینە، لە خوێندنەوەو وەرگێڕانەکانی تر شیاوترە. هەرچەندە نابێت خوێندنەوەی بە شێوەی *Itti-Sîn*، کە واتای ’لەگەڵ/ هاوالی (خواوەند) سین‘ دەگەیێنێت، بەتەواوی بە دوور بزانین، چونکە نووسینی جووت کۆنسۆنانت- کە لێرەدا *tt* یە- بۆ نووسەر مەرج نەبووە پابەندی بێت، نمونە لەسەر ئەمە ووشەی *i-ti-šum-ma* ی دێڕی (٨)ە، کە دەبووایە *it-ti-šum-ma* بووایە.

٥) **LUGAL** ***da-núm***: ئەم نیشانە شاهانەیە لە هەردوو نووسینەکەی بێتواتە (دێڕی ٢) و ئورشەلیم (i 12′; iv 22-23) یشدا هاتووە و پێشتریش ’ئەمار-سین‘ ی پادشای بنەماڵەی سێ یەمی ئور بەکاری هێناوە.[١٨]

٦) **LUGAL** ***Si-mu-ri-im**$^{ki}$*: ئەم ناوە جوگرافیەیە لەم نووسینەدا، هەروەک لە نووسینەکەی بێتواتەشدا هاتووە، بە یەک (r) نووسراوە. لە نووسینە سومەرییەکانی بنەماڵەی سێ یەمی ئوریشدا هەر وایە، بە پێچەوانەی زۆربەی نووسینە ئەکەدییەکانەوە. لە نووسینەکانی ئیدیـ(ـن)-سین دا تەنها لەوەکەی ئورشەلیمدا بە دوو (r) نووسراوە: *Si-mu-ur-ri-im*$^{ki}$ (دێڕەکانی: i 13′; iv 2?; iv 20).[١٩]

---

[17] Schmitt, R., The Bisitun Inscriptions of Darius the Great/ Old Persian Text- *Corpus Inscriptionum Iranicarum,* London, 1991, p. 49.
[18] Shaffer and Wasserman, p. 38.
[19] *Op. Cit.,* p. 25.

٧) **NUN INANNA:** ئەم دێرە پڕ گرفتە؛ یەکەم نیشانەیەک کە مابێتەوە، لە لۆگۆگرامی سومەری NUN دەچێت کە بە ئەکەدی دەبێتە *rubā'u*، هەرچەندە ئەمەش لە گومان بەدەر نیە. لەرووی مێژوویی‌یەوە، بەکارهێنانی ئەم نیشانە وەک نیشان و ناوبانگێکی شاهانە لە سەردەمی فەرمانڕەواکانی ئێشنوننناوە،[٢٠] و 'سامسوئیلونا' ( YOS 9 35: 147) و حەممورابی ی بنەماڵەی یەکەمی بابل لە باشور و لە لایەن 'شەمشی-ئەدەد' ی یەکەم (MARI 3 75 No. 4:9) لە وولاتی ئاشور، لە ئارادا بووە.[٢١] لە کاتێکدا پێشتریش لە ئەرشیفەکانی بازرگانە ئاشوری‌یەکانی 'کانیش' دا لە ناوەڕاستی ئەنەدۆڵ وەک ئاماژە بۆ پادشایانی ئاشور بەکار دەهات[٢٢] و لە هەمان کاتیشدا نیشان و نازناوی فەرمانڕوایانی دەوڵەتە-شارەکانی ئەنەدۆڵی ئەو سەردەمە بوو.[٢٣] ئەگەر ئەم خوێندنەوەیەی ئێمە لەم دەقەدا بە NUN ڕاست بێت، ئەوا ئەمە دەبێتە کۆنترین بەکارهێنانی زانراوی ئەم نیشانە. دەبێت ئاماژە بۆ ئەوەش بکەم کە لە پاش نیشانەی INANNA وە شوێنەواری چەند خەتێکی کاڵ بووەوە لە مەودایەکدا هەن کە جێگای

---

[20] بۆ ئەمە بروانە:

*CAD,* Vol. R, p. 397.

[21] سەبارەت بەم نیشانە و کات و شوێنەکانی هاتنی، بروانە:

Seux, M.-J., *Épithètes Royales Akkadiennes et Sumériennes,* Paris, 1967, pp.251-6.

بەڵام یەکەم پادشایەک کە لەم سەرچاوەیەدا وەک یەکەم هەڵگری ئەم نیشانە ئاماژەی بۆ کرابێت 'توکولتی- نینورتا'ی یەکەم (١٢٤٤-١٢٠٨ پ.ز.)ی ئاشورە. سەبارەت بە ئاماژە بۆ شەمشی-ئەدەد، بروانە:

*The Chicago Assyrian Dictionary (CAD),* Vol. R, p. 397.

[22] Larsen, M. T., *The Old Assyrian City-State and its Colonies,* Copenhagen, 1976, p. 369.

[23] بۆ ئەمە بروانە:

Veenhof, K. R., "Kanesh: An Assyrian Colony in Anatolia," *Civilizations of the Ancient Near East,* (ed.: Jack Sasson), Vol. II, New York, 1995, p. 866.

نیشانەیەکی تێدا دەبینەوە، بەڵام لەکاتی ڕونووسی نووسینەکەدا هیچ نیشانەیەکی مێخی تەواو نەدەبینرا و زیاتر وا پێ دەچێت کە هیچ نیشانەیەکی تر نەبێت. خوێندنەوەی لۆگۆگرامی سومەری INANNA بە شاوشکا، کە هاوتای خوریی ئیشتاری ئەکەدی و ئینانای سومەری بووە، شتێکی دوور نیە، بەتایبەتی کە سیمورروم خاک و خەڵکەکەی خوری بوون.

(١١-١٢ *[kak?]-kà-am [da]n?-na-am*: ئەم ڕستەیەش هەندێک گرفتی تێدا هەیە، چونکە دەتوانین بڵێین تاکە نیشانەیەک کە لەگەڵ پاشماوەکانی یەکەمین (؟) نیشانەی دێڕی ١١ و لە هەمان کاتیشدا لەگەڵ واتای دەستەواژەکەدا بگونجێت، نیشانەی KAKە کە واتای چەک دەبەخشێت. لێرەدا پرسیارە ئەوەیە ئایا ئەم ووشەیە لەم سەردەمەدا بە بڕگەیی دەنووسرا وەک لێرەدا هەیە، یان بە لۆگۆگرام دەنووسرا هەروەک نەریت بوو؟ خوێندنەوەی کۆتایی و گومان بڕ لێکۆڵنەوەی زیاتری دەوێت.

بەکارهێنانی "چەکی بەهێز" لە نیشان و ناوبانگە شاهانەکان دا، هەرچەندە زۆر نیە، بەڵام بەتەواویش نوێ نیە. بۆ نمونە لە نووسینێکی 'ڕیم-سین' ی پادشای 'لارسا' دا هاتووە و دەڵێت: "بە [چەکە][بە]هێزەکانی خواوەند نینورتا."[٢٤]

---

[24] "28) [giš. Tukul- ka]la-ga-$^{d}$nin-urta," Frayne, *RIME,* vol. 4 – Old Babylonian Period (2003- 1595 BC), Toronto, 1990, Rīm-Sîn I E4. 2. 14. 9, l. 28.

بۆ نمونەی زیاتر بڕوانە:

Tallqvist, K., *akkadische Götterepitheta,* Helsinki, 1938, p.110,

لێرەدا وەک نیشان و ناوبانگی خواوەندانیش دێت. هەروەها بڕوانە:

*CAD* "K" p. 54.

کە لە نووسینێکی شەلمانێسسەری سێ یەمدا هاتووە.

١٣) *te-e-ne-eš*: ئەم ووشەیەش نامۆ و سەرنج ڕاکێشە، ئەوەندەی من ئاگادار بم لە نووسینەکەی ئورشەلیمدا نەبێت، ئیتر لە دەقی تری ئەم سەردەمەدا نەهاتووە. لەبەر ئەوەی لە نووسینەکەی ئورشەلیمدا لەسەرەتای دێڕدا نەنووسراوە، بووە هۆی هەندێک دوودڵیی هەردوو لێکۆڵەرەوەکەی کە ئایا نیشانەی تری لەپێشەوە هەبووە یان نا. بەڵام لە نووسینەکەی هەڵەدنیدا، هەرچەندە یەکەم نیشانەی ووشەکە داخوراوو سواوە، بەڵام لە پێشییەوە جێگا بۆ هیچ نیشانەیەکی تر نیە، ئەمەش پاڵپشتیە بۆ ڕاستیی خوێندنەوەکەی شافەر و ڤاسەرمان کە *tenīšu* ە.[٢٥] بە پێی ووتەی ئەوان، ئەم ووشەیە "تا ئێستا تەنها یەک جاری تر لە دەقێکی بۆغازکۆی دا بەم شێوەیە هاتووە کە شێوەیەکی جیاوازی ووشەی باوی *tenēštu* بە واتای 'خەڵک' یان 'گەل'ە (بڕوانە: *AHw* 1347b).[٢٦]

١٥) *māt Ša-gi*: ئەم ناوە لە هیچ سەرچاوەیەکی نووسراوی تری بەردەست دا نەهاتووە، ئەوەندە نەبێت کە ناوی شاری *Tu-ša-gi* لە دەقێکی شمشارە (SH 825) دا هاتووە کە لەم ناوەوە نزیکە، بەڵام هەمان ناو نیە. تەنانەت ئەگەر وایشی دابنێین کە نیشانەی پێش *Ša-gi* بەشێک لە ووشەی *māt* نیە و هی ئەم ناوەیە، هێشتا هیچ یارمەتییەکی دۆزینەوەی هاوشێوەیەکی نادات.

٢٢) *[... ...]-ta/ša-am*: نیشانەی پێش ئەم نیشانەی *am* ە لەسەر بەردەکە بەئاستەم دیارە و دەشێت *ša* ش بێت.

٢٤) *i-ne-er*: ئەم فرمانە لە چاوگی *nê/âru(m)/ ne'ārum* ەوە هاتووە کە واتای "کوشتن،" "لێدانــ(ــی دوژمن)" دەبەخشێت، سەرەڕای واتای بنەی کە "سەربڕین"ە.

---

[25] Shaffer and Wasserman, p. 13-14.
[26] *Ibid.*

هەروەها تێبینییان کردووە کە ئەم ووشەیە لە دەقە ئەکەدییە کۆنەکانیشدا نەهاتووە.

ئەم فرمانە لە دەقەکانی سەردەمی ئەکەدیی کۆنەوە بەم واتایە بەکارهاتووە، بۆ نموونە لە ڕونووسی سەردەمی بابلیی کۆنی دەقی 'ڕاپەڕینە گەورەکەی دژی نەرام-سین' دا هاتووە:
(G 17) *i-ni-ir-ma*[27] یان *i-ne-er-ma*.[28]

٢٥) *[.......]-ar*$^{ki}$: نارەحەتە بزانین ئەم ناوە جوگرافییەی کە تەنها دوا نیشانەی ماوەتەوە، چییە. بەڵام دەشێت هەر یەکێک لەو ناوە جوگرافییانە بێت کە لەو ناوچەیە و خوارووی ئەو ناوچەیەوە هەبوون و بە *-ar* کۆتایی دێت. لەو ناوانەش کە دەیانزانین ئەمانەن: 'زیمودار *Zimudar*'، 'نـامـار *Namar*'، 'خاشـ(ـیـ)ـمار *Ḫaš(i)mar*'[29]، 'کارخار *Karḫar*' کە فرەین بە نزیکی ی 'خالمان *Ḫalman*'

[27] Grayson and Sollberger, *RA* 70, p. 111.

[28] Charpin, D., "La Version Mariote de l'«Insurrection Général contre Narâm-Sîn,» *Mémoires de N.A.B.U*, 4, Florilegium Marianum III: Recueil d' etude à la memoire de Marie-Thères Barrelet, Paris, 1997, p. 10;

هەروەها لە دەقێکی ڕەمڵ لێدانی بابلیی کۆندا کە هەواڵی سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئور دەگێڕێتەوە:
*a-mu-ut* $^{d}$*Šul-gi ša A-pa-Da-ra-aḫ i-ni-ru* "فاڵی شولگی، کە ئەپـا-دەراخـی سەربـڕی،" (YOS 10 26 IV 10)، بۆ ئەم دەقە بڕوانە:

Biggs, R., "Šulgi in Simurrum," *Crossing Boundaries and Linking Horizons:* Studies in honour of M. Astour, Edited by: G. O. Young, M. W. Chavalas and R. E. Averbeck, Maryland, 1997, p. 169-170;

هەروەها لە دەقی YBT X 26 IV 10 دا، بڕوانە:

Goetze, A., "Historical Allusions in Old Babylonian omen Texts," *JCS* 1 (1947), p. 260.

بیگز ئەوەشی گوتووە کە لۆگۆگرامی سومەری ی SAG.GIŠ.RA بۆ دەربڕینی ئەم فرمانە بەکار هاتووە:

Biggs, *Op. Cit.,* p. 176, note 40.

[29] هەرچەندە ئەم شێوەیەی ئەم ناوە لە شێوە کۆنەکەی کە 'خاشیمور(و) *Ḫašimur(u)*' ە، جیاوازە، بەڵام بەڕای نووسەر ناتوانرێت بە تەواوەتی بڕیار بدرێت ناوەکە لە سەر زمانی دانیشتوانی ڕەسەنی ناوچەکە خۆی، کە لەم سەردەمەدا سیموڕری بوون، چۆن گۆ کراوە و نووسراوە. واتە دوور نیە ناوی 'خاشیمور(و) *Ḫašimur(u)*' لەم سەردەمەدا بەزمانی دانیشتوانەکەی 'خاشیمار *Ḫašimar*' نەبوو بێت

دەزانێت[٣٠] و لەم دەقەش دا پاش چەند دێڕێک ئەویش ناوی هاتووە. تەنانەت دەتوانین ناوی وولاتی 'واریوم *Warium*' یش، کە ناوی ناوچەی دیالە بووە، پاش لێکردنەوەی میماندنەکەی، پێشنیاز بکەین.[٣١]

٣٠) **[ma?-at?] [.......]-na[ki]**: زۆر کەم سەبارەت بەم ناوە جوگرافیە دەتوانرێت بوترێت، بەڵام دەشێت گومان بۆ '*خورانا* *Ḫuranna*' بچێت کە ناوەکەی بە داخوراوی لە دوو شوێنی دەقەکانی نوزی دا هاتووە.[٣٢] ناوی خورانا لە لایەن فرەینەوە بە هەمان '⌜خور⌝-ـــا-*نوم* ⌜Ḫur⌝-a-núm' ی نووسینێکی نەرام-سین و هەمان '*خور-نام* *Ḫur-nam*' ی نووسینەکەی 'ئێرپیدو-پیزیر' زانراوە، بەڵام بەبێ ئەوەی شوێنەکەی توانرابێت دیاری بکرێت.[٣٣]

٣٢) ***[....]-lum-A-RI***: لەبەرئەوەی دانیشتوانی ناوچەکانی کوردستان، بە تایبەتی ڕۆژهەڵاتی دیجلە، لەم سەردەمەدا بەزۆری خوری بوون، وا لەڕاستی نزیکترە کە ئەو ناوانەی بە A-RI- کۆتاییان دێت، بە *atal*-... بخوێندرێتەوە کە بە زمانی خوری واتای "بەهێز" یان "بە توانا" دەبەخشێت.

---

و دوا ڤاوەڵی ناوەکە کە (a)یە لە سەر زمانی ئەکەدیەکان بەپێی ڕێسای هاوئاهەنگیی ڤاوەڵ (vowel harmony=) کە لە زمانی ئەکەدی دا هەیە، بۆ (u) گۆڕابێت لەژێر کاریگەریی um ی میماندن (mimation=)دا کە هاوتای (تنوین)ی زمانی عەرەبیە. پاڵپشتی ئەم ڕایە نووسینی ناوەکەیە بە شێوە ڕەسەنەکەی خۆی کە '*خاشیمار* *Ḫašimar*' ە لە سەرچاوەکانی سەردەمی ئاشوریی نوێ دا، ئەو کاتەی دیاردەی میماندن لە لایەن ئاشوریەکان خۆیانەوە ئیتر پشت گوێ خرا.

[30] Frayne, *SCCNH* 10, p. 149.

[31] سەبارەت بە وولاتی واریوم و دیاریکردنی شوێنەکەی و ناو هاتنی لە سەرچاوە کۆنەکاندا، بڕوانە:

Bottéro, J., D. O. Edzard, A. Falkenstein and J. Vercoutter, *The Near East: The Early Civilizations*, London, 1967, p. 164.

[32] Frayne, *SCCNH* 10, p. 184.

[33] Frayne, *Ibid.*

٣٣) GU.ZA[GIŠ][.........]**: له شکاوی‌یه‌که‌دا جێگای دوو نیشانه ده‌بێته‌وه. له‌کاتێکدا دووه‌میان به نیشانه‌ی پێناسی GIŠ دابنێین که ده‌خرایه پێش ناوی هه‌موو جۆره چه‌کێک و که‌ل و په‌ل و ئامرازێکی له دار و ته‌خته دروست کراوه‌وه، له‌وانه‌ش کورسیی ته‌ختی پادشایه‌تی که لێره‌دا هاتووه، نارِه‌حه‌ته بزانین یه‌که‌میان چی بووه. هه‌رچه‌نده گومانێکی که‌م هه‌یه که له پاش ووشه‌ی GU.ZA شه‌وه نیشانه‌یه‌ک هه‌بوو بێت، به‌ڵام ئه‌گه‌ر واش بێت، ئه‌وه زۆر له واتای رِسته‌که ناگۆرِێت، چونکه ئه‌گه‌ر هه‌بووبێت، ئه‌وا هه‌ر ده‌بێت ته‌واوکه‌رێکی فۆنه‌تیکی (Phonetic Compliment=)[٣٤] بووبێت. جێگای داخه که به‌هۆی شکاویی به‌رده‌که‌وه له‌ئاستی فرمانه‌که‌دا، نازانین چی رِووداوێک که '[......]-لوماتال *lumatal*-[... ...]' په‌یوه‌ندی‌یه‌کی پێوه هه‌بووه به‌سه‌ر پادشایه‌تی سیمورروم هاتـــووه‌وه، یان کردووه، چونکـــه دیاریش نیه "تـــه‌خت" لێـــره‌دا بکـــه‌ر (Subject)ه یان به‌رکار (Object). به‌ڵام هێشتا هه‌ر مه‌حاڵ نیه نیشانه‌کانی هه‌موو رِسته‌که پاشماوه‌ی نیشانه‌کانی ناوێکی که‌سی یان جوگرافی بن، چونکه ئه‌گه‌ر سه‌یرێکی هه‌موو ده‌قه‌که بکه‌ینه‌وه، ده‌بینین که ناوی که‌سی و ناوی جوگرافی به‌دوای یه‌ک دا هاتوون و رِیز کراون. ئه‌گه‌ر یه‌کێک له‌مانه بێت ئه‌وا ده‌بێت نیشانه‌ی [GIŠ] به جۆرێکی تر بخوێنینه‌وه.

---

[34] ئه‌مانه ئه‌و نیشانانه‌ن که له‌پاش لۆگۆگرامێکه‌وه دێن و ده‌نگی ووشه‌که به زمانی ئه‌که‌دی ته‌واو ده‌که‌ن، ئه‌ویش بۆ ده‌ربرِینی باری ووشه‌که ئایا نۆمینه‌تیفه یان ئه‌کیوزه‌تیف یان جێنه‌تیف، هه‌روه‌ها هه‌ندێک جاریش بۆ ده‌رخستنی ئه‌وه‌ی کام ووشه‌ی ئه‌که‌دی له لۆگۆگرامه‌که مه‌به‌سته، چونکه زۆر جار هه‌ر لۆگۆگرامێک زیاتر له واتایه‌کی له زمانه‌که‌ی تردا هه‌یه. نمونه له‌سه‌ر ته‌واوکه‌ری فۆنه‌تیکی:

*Šarrum ana* É*-im illak*

لێره‌دا *im-* ته‌واوکه‌ری فۆنه‌تیکی‌یه، چونکه É لۆگۆگرامێکی سومه‌ری‌یه و به ئه‌که‌دی *bītum* ه و له‌م رِسته‌یه‌دا ده‌بێت جێنه‌تیف بێت بۆیه ده‌بێته *bītim*.

٣٧) *ma-at Ša-ri-da-ḫu-um*[ki]: ئەم ناوە جوگرافییە لە دەقەکانی سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئوردا هاتووە، بەڵام بە شێوەی کەمێک جیاوازی وەک:
*Šu-ru-ut-ḫu-um*[ki]; *Ša-ri-it-ḫu-um*[ki]; *Ša-ri-it-ḫi*[ki];
و لەوانەشە *Ša-ri-íp-ḫu-um-ma*[ki] ش هەر شێوەیەکی جیاوازی ئەم ناوە بێت.[٣٥] شوێنی ئەم ناوە جەگرافییە زانراو نیە، بەڵام هەندێک بە دەربەندی دوکانی دەزانن، لە سەر زێی پچووک و لەو شوێنەدا کە زێ نێوانی هەیبەت سوڵتان و سەرسیرد دەبڕێت. هۆی ئەم باوەڕە هاتنی ناوی دەربەندی '*Šurutuḫa* شوروتوخا' یە لە نووسینێکی شاهانەی عیلامی دا کە باسی جموجۆڵی سەربازی لە بەری ڕۆژهەڵاتی دیجلە دەکات و لەپاڵ ناوی ئەم دەربەندە، ناوی '*Matka* ماتکا'، '*Arrapḫa* ئەڕڕاپخا'، 'نـــوزی *Nuzi*'، '*Ḫašmar* خاشمار' و '*Zaban* زابان' و هی تریش دەبات.[٣٦] تەنانەت هەندێک پێیان وایە ناوەکە لە بنەڕەت دا عیلامی بێت،[٣٧] بەڵام شیکردنەوە زمانەوانی یەکەی ناوەکە لەلایەن هەردوو ئاستۆر Astour ومایەر Mayer ەوە زیاتر لە ڕاســـت دەچــێت. بـــە ڕای ئەوان ناوەکـــە خوری‌یە و ناوی جـــۆرە درەختێـــکـــە (GIŠ*šu-rat-ḫu*) کە دارمازوو یان دار گوێزە.[٣٨] شایانی ئاماژە بۆ کردنە کە پێکەوە ناوهێنانی ئەم شوێنە لەگەڵ شوشەڕڕا دا لە مێژووە-دیباچەیەکی ساڵی چوارەمی ئەمار-سین دا[٣٩] وادەکات باوەڕ بە نزیکیی لە شوشەڕڕاوە کە گردی شمشارەیە، بەهێز تر بێت، واتە لە دەشتی ڕانیە و ناوچەی دوکان بوو بێت.[٤٠]

---

[35] Cf. Astour, "Semites and Hurrians in Northern Transtigris, p. 35, note 249.
[36] *Op. Cit.*, p. 36.
[37] Frayne, *Op. Cit.*, p. 174.
[38] Astour, *Op. Cit.*, p. 36 and notes 253-256.

ئاستۆر خۆی دارگوێز بە شیاو تر دەزانێت:

*Ibid*, p. 36-7.

[39] بۆ ئەم مێژووە-دیباچەیە، بڕوانە:

Walker, *The Tigris Frontier from Sargon to Hammurābi*, p. 107.

[40] سەبارەت بە یەک هاتنەوەی شمشارە و شوشەڕڕا، بڕوانە:

٣٩) *'Ḫul?'-gi-za-tal/ri* [.......]: ئەوەندەی من ئاگادار بم ناوی کەسیی (؟) لەم جۆرە لەدەقی بڵاوکراوەی تری تا ئێستادا نەهاتووە. ئەوەندە هەیە ناوی کەسیی کوززاری/زی *'Ku-uz-za-ri/zi* مان یاد دەهێنێتەوە کە لە نوزی هەبووە،[٤١] بەڵام نیشانەی GI یان ZI یارمەتی دەست نیشان کردنی ناوەکە نادات.

٤٠) **[.....]-GA/AM?-*ri-ni?-we***: ئەگەر بتوانین پشت بە ڕاستیی پڕکرنەوەی شکاوییەکەی دێری پاشتر ببەستین کە *[be]-li-šu-nu*ە، ئەوا ئەم ناوە و ناوەکەی پاشی دەکرێت ناوی سەرکردە و تەنانەت ناوی خواوەندیش بن. هەردوو ڕەگەزی *-ne-* و *-we-* دەکرێت بە هەردوو پاشگری خوریی *-ni* (ئامرازی ناسین[٤٢]) و *-we* (جێنەتیڤ[٤٣]) بن.

٤٣) **[*ma?-at?...*]*-ti-na-ab-ba-ša-we*$^{ki}$**: ناوێکی جوگرافی خوریی ئاشکرای ترە کە تائێستا نەناسراوە و بە پاشگری جێنەتیڤی *-we* کۆتایی دێت.

٤٨) **[*m*]*a-at Ḫal-ma-an*$^{ki}$**: خالمان ئەو وڵاتە گرنگەیە کە لە ڕێی زۆر سەرچاوەی نووسراوەوە ناسراوە.[٤٤] ناوی ئەم وڵاتە سەدە لەدوای سەدە هەر ماوە و

---

Læssøe, *The Shemshara Tablets,* p. 70; Hallo, "Simurrum and the Hurrian Frontier," *RHA,* XXXVI, p. 77, note 67.

[41] بۆ ئەم ناوەی لە یەکێک لە دەقەکانی نوزی دا هاتووە، بڕوانە:

Gelb, *HS,* p. 19.

[42] سەبارەت بەم ئامرازە، بڕوانە:

Wegner, p. 47.

[43] *Op. Cit.,* p. 57 and note 66.

[44] بۆ نمونە بڕوانە:

Borger, R., "Vier Grenzsteinurkunden Merodachbaladans I von Babylonien," *AfO* 23 (1970), p1ff,

بەردەوام بووە تا بووەتە 'حەلوان' ی ئێستا. بەهۆی شوێنە ستراتیجی‌یەکەیەوە لەسەر شارێی خوراسان، زۆر جار ناوی لەنووسینەکانی مێژوونووسەکانی سەدەکانی ناوەڕاستیشدا هاتووە. لەو سەرچاوانەدا وەک شاری سەرەکیی دەم دەروازەی نێوان مێسۆپۆتامیا و بانی ئێران باس کراوە.[٤٥] هەر لەو سەرچاوانەشدا باسی "عقبة حلوان"[٤٦] دەکرێت کە واتای "کلۆمی حەلوان" دەبەخشێت و ئاماژەیە بۆ دەربەندەکەی نزیکی کە ڕێگاکەی پیادا دەڕوات. ئەمەش وولاتی 'خوخنوری *Huḫnuri*' مان یاد دەهێنێتەوە کە 'ئیبـــی-سین' لە نووسینێکی دا بە "کلۆمی وولاتی ئەنشان" وەسفی داوە.[٤٧]

هەمان ناوی خالمان لەو ڕووبارەش نراوە کە ئێستا بە 'ئەڵوەند' ناسراوە و بە شاری خانەقین دا تێدەپەڕێت. دیارە کە ناوی ئەڵوەند هەر لە خالمانەوە پەرەی سەندووە بە شێوەی خالمان > هالمان > ئالمان > ئالوان > ئەڵوەن.

ناوبردنی خالمان وەک یەکێک لە نیشانە سەربازی‌یەکانی ئیددیـــ(ـــن)-سین و بە ووتەی خۆی، گرتنی، ئاماژەیەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ پەل کێشانی شانشینەکەی لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتیی دا بۆ شوێنێکی وا دوور لە باشوورەوە. بە بوونی دوو خالی باشور (خالمان =ئەڵوەند) و باکور(کولونوم =بێتواتە) بە دەستەوە و لێکدانەوەی لەسەر نەخشە، دەتوانین بگەینە ئەنجامی درێژیی شانشینەکەی لەم سەردەمەدا، کە دەوروبەری ٢٤٠ کم ی هەوایی بووە. جگە لەمەش، توانای دەست بەسەردا گرتنی دەربەندێکی

---

لەگەڵ ئاماژە بیبلیۆگرافی‌یەکانیدا.

[45] الحموی، یاقوت، *معجم البلدان*، بیروت، ١٩٨٤، ص. ٢٩٠-٣. حەمەوی لە سەدەی ١٣ ی زایینی دا ژیاوە.

[46] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل. ٢٩١.

[47] بۆ ئەم نووسینەی ئیبـــی-سین، بڕوانە:

Walker, p. 42.

ستراتیجی وا لەسەردەمی ئەو هەموو هێزەی دەوروپشتی دا کە لەو کاتەدا لە ململانێ دا بوون بۆ دەستەڵات و دەست بەسەردا گرتنی شوێنە ستراتیجی‌یەکان، نیشانەیەکە بۆ دەستەڵات و دەست ڕۆیشتویی سیموررومی ئەم کاتە.

٤٩) *ma-at Be-el^ki*: ناوێکی جوگرافیی تری تا ئێستا نەناسراوە. بەڵام پێ دەچێت هەر لە دەوروپشتی خالمان بووبێت.

٥١-٥٢) *[An?]-nu-ba-ni-ni [LUGAL Lu-lu-bi]-⌜im^ki⌝*: ناو هێنای 'ئانوبانینی *Annubanini*' ی پادشای لوللوبوم بۆ زانینی کرۆنۆلۆجیای هەردوو پادشا زۆر بەبەهایە. بەتایبەتی لەوەدا کە ئانوبانینی پاش ئیددیـ(ـــن)-سین نەهاتووە، هەروەک هەندێک بۆی دەچن.[48] بەڵکو ئیددیـ(ـــن)-سین، ئەگەر لەپاش ئانوبانینی نەهاتبێت، ئەوا هاودەمی بووە. جێگای داخە کەنووسینی تری ئانوبانینیمان نیە تاکو زیاتر لەم بارەیەوە بزانین، بەڵام دەتوانین بەدڵنیایی‌یەوە بڵێین دەرئەنجامەکانی وۆکەر Walker سەبارەت بە کرۆنۆلۆجیای هەردوو پادشا ئیتر ڕاست نین. ئەو لەو باوەڕەدایە کە دەمی نووسینەکەی ئانوبانینی لە سەرپولی زەهاو نزیکەی سەد ساڵێک لە دەمی نووسینەکەی ئیددیـ(ـــن)-سین /زابازونا کە هەر لە سەرپولە،[49] دواترە.[50] دیسان جێگای داخە کە نووسینەکەی هەڵەدنیش پاش ئەم دێرە گرنگانە زۆر شکاوە و ناتوانین ئەو فرمانە

---

[48]بۆ نمونە بڕوانە:

Walker, *The Tigris Frontier,* p. 186; 189.

[49]ئەم نووسینەیان بە نووسینی ئانوبانینی ٢ ناسراوە، چونکە پێشتر بە هی ئانوبانینی دەزانرا. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەیەوە و لە بارەی نووسەرەکەیەوە، بڕوانە:

Walker, *Op. Cit.,* p. 170; 179ff.

سەبارەت بە نەخشەکەی، لایەنە هونەری‌یەکەی و ڕونووسێکی نووسینەکەی، بڕوانە:

Hrouda, B., *Iranische Felsreliefs, (Sarpol-i-Zohāb),* Iranische Denkmäler-Lieferung 7: Enthaltend Reihe II, Berlin, 1976, plates 1-4; 6.

[50] Walker, *Ibid.*

هەڵبهێنین کە وابەستەی ئەم ڕستانە بووە و کردارەکە ڕوون دەکاتەوە. واتە، نازانین چی لەلایەن سیموررومەوە بەسەر ئانوبانینی هێنراوە، یان ئانوبانینی چی بەسەر سیمورروم هێناوە. لەهەمان کاتیشدا، دوور نیە ئیددیـــ(ـــن)-سین لەم شوێنەدا باس و خواسی ڕووداوی کۆنتری نەگێڕابێتەوە کە ئانوبانینی و شانشینەکەی بە شێوەیەک دەستی تێدا هەبووبێت. لەم بارەیاندا دەبێت ئانوبانینی لەدەمێکی زووتر لە ئیددیـــ(ـــن)-سین ژیابێت.

لەهەموو بارێکدا، ئەم دێڕانە بەڵگەی بوونی ململانێ یەکن کە لەنێوان هەردوو شانشینی سیمورروم و لوللوبوم دا هەبووە. لەوانەیە ململانێ یەکە لەسەر خاڵمان و ناوچەی سەرپول بووبێت بۆ دەست گرتن بەسەر شارێ ستراتیجیی‌یەکەی و دەربەندەکەیدا، کە هەروەک دەبینین بەوە کۆتایی هات کە کەوتە دەست سیمورروم. نەخشە هەڵکەندراوەکانی هەردوو پادشا لە سەرپول (Anubanini Iی ئانوبانینی و Anubanini II ی ئیددیـــ(ـــن)-سین یان زابازونا ی کوڕی) بەڵگەی بوونی ئەم ململانێ یەن.

٥٨) *Ti-da-luḫ-ḫa-am*[ki]: ئەم ناوە جوگرافی‌یە کە لێرەدا بە بەرکار (= کەواتەAccusativeە = نصب) هاتووە لەبەر ئەوەی بەرکاری کردارێکی سەربازی بووە، پێ دەچێت شار بووبێت نەک وڵات، چونکە ووشەی *māt* کە واتای وڵات دەبەخشێت و لەم دەقەدا لەپێش ناوی وڵاتەکانی ترەوە دانراوە، لێرەدا نیە. ئەوەندەی من ئاگادار بم، ناوی ئەم وڵاتە لە هیچ دەقێکی تری پێشوودا نەهاتووە و نوێ یە. بەڵام لەبەرئەوەی ڕاستەوخۆ پێش شیکشابوم *Šikšabbum* هاتووە، زۆر پێ دەچێت لەهەمان ناوچەی ئەمەیاندا بووبێت. شایانی باسە کە مەیدانی شەڕ و چالاکی لەم شوێنەی دەقەکەدا لە هەرە باشورەوە دێتە باکور، ئەممەش دوو ڕاقە هەڵدەگرێت: ١) یان ئەوەتا

دەقەکە ڕووداوەکان کرۆنۆلۆجی‌یانە (= بەدوایەکدا هاتنی کات) نەک جوگرافی‌یانە، دەگێڕێتەوە، یان ٢) ئەوەتا دەقەکە درێژتر بووە لەمەی لەبەردەستماندایە و ناوی جوگرافیی تر لەو بەشەدا هەبووە کە فەوتاوە و ئەوانەش ناوی ئەو شوێنانە بوون کە لە نێوان خالمان (سەرپول) و شیکشاببوم دا بوون. زیاتر لەوەش دەچێت ئەگەری دووەمیان لە ڕاستی‌یەوە نزیکتر بێت، چونکە کلێشەی نەفرەت و تووک کە لە کۆتایی نزیکەی هەموو دەقێکی لەم جۆرەدا هەبووەو دەبووایە لە کۆتایی ستوونی دووەمدا بووایە، ئەویش دیار نیە. لەکاتی سەردانە مەیدانی‌یەکەی لیژنەی ئەنتیکەخانەی سلێمانی‌دا بۆ شوێنی دۆزینەوەی بەردەکە، هیچ کنە و هەڵکەندنێک ئەنجام نەدرا بۆ گەڕان بەدوای پارچەی تردا، ئەگەر هەبووێت.

٦٠) ***ma-at Ši-ik-ša-am-bi**ki*: ناوی ئەم شوێنە لە دەقەکانی بنەماڵەی سێ یەمی ئوردا بە شێوەی '*شیگشابی* ***Šigšabi***' هاتووە[٥١] و زۆر جاریش لە دەقەکانی شمشارەدا بەچەند شێوەیەکی جیاواز نووسراوە.[٥٢] جێگای سەرنجە کە شیکشاببوم لەو سەرچاوانەدا

---

[51]سەبارەت بە شێوەی نووسینی ئەم ناوە بەم شێوەیە، بڕوانە:

Edzard and Farber, *RGTC* 2, p. 181;

هەروەها تەماشای ئەم سەرچاوەیەش بکە:

Læssøe, J., "Šikšabbum: An Elusive City," *Orientalia NS* 54 (1985), p. 182.

[52]بۆ بینینی شێوە جیاوازەکانی نووسینی ناوەکە بڕوانە:

Groneberg, B., "Die Orts-und Gewässernamen der altbabylonische Zeit," *RGTC* 3, Wiesbaden, 1980, p. 221;

لەمەش نوێتر بەم دوایی‌یانە ئەم سەرچاوەیە دەرچووە کە زانیاریی زۆر بەسوودی تێدایە و لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی بە پێزیش لە پێشەکی‌یەکەیدا هەیە:

Eidem, J. and J. Læssøe, *The Shemshara Archives I -The Letters,* Copenhagen, 2001.

زۆر زانیاری بەسوودیش لەم بارەیەوە لەم سەرچاوەیەدا هەیە:

Astour, Semites and Hurrians, p. 34f.

وەک شارێک ئاماژەی بۆ کراوە کە پایتەختی وولاتی *ئەخازوم* ‘Aḫazum بووە،[٥٣] کەچی لەدەقەکەی هەڵەدنی دا بە ڕوونی وەک وولات ناوی هاتووە. دەشێت وولاتەکە لە قۆناغێکی دواتردا ناوی ئەخازوم ی بەسەردا بڕا بێت، یان لەوانەشە شاری شیکشاببوم لە سەردەمی ئیددیـ(ـــن)-سین هێندە گرنگ بوو بێت کە هەموو وولاتەکە بە ناوی‌یەوە ناسرابێت و ناوی ئەخازوم ی داپۆشیبێت.[٥٤] شیکشاببوم شارێکی بەهێزو و ستراتیجی بووە و هەروەک لە دەقەکانی ئەرشیفەکەی شمشارەوە دەردەکەوێت، لە سەردەمی ئاشوریی کۆن و بابلیی کۆندا ڕۆڵێکی گەورەو گرنگی لە سیاسەتی ناوچەکەدا گێڕاوە.

ئاستۆر ئەم ناوە بە خوری دەزانێت و بە پێی شیکردنەوەی ئەو لە ***S/Šikš-ambi*** یەوە هاتووە بە واتای "ستوونێک لە داری *ئەمبی*."[٥٥] بەڵام لە هەموو حاڵێکدا ئەم شیکارە لێکۆڵینەوەی زیاتر و ووردتری دەوێت.

هەندێک لە توێژەران شوێنی شاری شیکشامبی لە سەر زێ ی خواروو لە خوار شمشارەوە دادەنێن؛ واتە لە باشوری ڕۆژئاوای ڕانیەوە، لەوانەیە لە نزیک تەقتەق.[٥٦] بەڵام

---

[53] Eidem and Læssøe, *Op. Cit.*, p. 22.

[54] بەدووری نازانم وولاتی ‘ئەگاز Agaz’ کە لە دەقە ئەرشیفی‌یەکانی سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئوردا هاتووە و شوێنەکەی دیار نیە، هەمان ئەم ‘ئەخازوم’ەی دەقەکانی سەرەتای سەردەمی بابلیی کۆن بوو بێت.

[55] Astour, *Op. Cit.*, p. 34-35.

[56] Eidem and Læssøe, p. 22-23;

هەروەها بڕوانە:

Læssøe, *The Shemshāra Tablets- A Preliminary Report*, p. 153.

بەڵام لاسۆ لە نووسینێکی پێشووی دا گردی گەورەی قەڵادزێ ی بە شوێنەواری کۆنی شیکشامبی پێشنیاز کردبوو:

Læssøe, *Orientalia*, p. 182; Læssøe and Th. Jacobsen, “Šikšabbum Again,” *JCS* 42/2 (1990), p. 132.

فرەین ڕایەکی تری هەیە، هەوڵی داوە لەگەڵ شاری شەقلاوەی ئێستادا یەکی بهێنێتەوە. لەم پێشنیازەی دا پشتی بە شیکاری زمانەوانی بەستووە و وای داناوە ناوەکە کە لە سەردەمی بابلیی کۆن دا شیکشابوم *Šikšabbum* بووە لە سەردەمی ئاشوریی ناوەڕاست دا بووەتە *شیکلابوم *Šiklabbum* و لەویشەوە بۆ *شەقلاوە*، هەرچەندە ئەو شێوە ئاشورییە ناوەڕاستە تەنها گریمانە و بە نووسراوی بەدەست نەگەیشتووە. فرەین وای دادەنێت کە دەنگی *-št-* ی سەردەمی بابلیی کۆن لە سەردەمی ئاشوریی ناوەڕاست دا بووەتە *-lt-* و لە سەردەمی ئاشوریی نوێشدا بووەتە *-ss-* بەبەراوورد لەگەڵ پەرەسەندنی ناوی جوگرافیی '*کەشتاپپوم* *Kaštappum*' ی بابلیی کۆن بۆ '*کەلتاپپوم* *Kaltappum*' لە ئاشوری ناوەڕاست دا و بۆ '*کەسساپا* *Kassapa*' لە ئاشوریی نوێ دا کە ئێستا پێی دەوترێت 'تەل کەششاف.'[57] ڕاستە کە شەقلاوەی ئێستا، هەروەک شیکشابوم ی دێرین جێگایەکی ستراتیجیی هەیە بەوەی کەوتووەتە سەر تەوەری ڕێگای هاملتۆن و بە کەژو چیای سەخت پارێزراوە، بەڵام ئەم پێشنیازەی فرەین زیاتر ڕەمڵ لێدانە. پێشنیازەکەی لاسۆ و ئایدم کە پشتی بە بەڵگەی نووسراو بەستووە[58] لە ڕاستی نزیکتر دێتە بەرچاو، بەتایبەتی ئەگەر ڕاست بێت شیکشابوم پایتەختی ئەخازوم بووبێت.

٦٢) ***ma-at I-te-ra-áš-we**^ki*: ناوێکی جوگرافیی ترە کە پێشتر نەهاتووە، بە پاشگری جێنێتیڤی *-we* دا دیارە کە ناوێکی خورییە.

---

[57] سەبارەت بەم دیاری کردنەی کەسساپا ی دێرین لەگەڵ تەل کەششافی ئێستادا تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە:

Frayne, *SCCNH* 10, p. 180.

[58] Eidem and Læssøe, p. 22.

٦٣) ***I-tu***[ki]**:** بەوەدا کە ئامرازی ناساندنی *māt* لە پێشی‌یەوە نەهاتووە، دیارە ئەم ناوە جوگرافی‌یە شار بووە. دەکرێت بە ووریایی‌یەوە پێشنیاز بکەین لەگەڵ شارێکی وولاتی *ئوتووم* '*Utûm*' دا بەیەکیان دابنێین کە دووجار لە سەرەتای سەردەمی بابلیی کۆن دا ناوی بە هەردوو شێوەی '*Ú-ta*' (*ARM* IV 20) و '*U-ta-*[*im*[ki]]' ( لە دەقی (*SH* 861) هاتووە. لە دەقی یەکەمیاندا *ئیشمێ-داگان* '*Išmē-Dagan*' مژدەی گرتنی ئەم شارە بە '*یەسمەخ-ئەددو*' '*Iasmaḫ-Addu*' ی برای دەدات. لە دووەمیشیاندا هێزەکانی ئەم شارە کە وا پێ دەچێت بۆ پاڵپشتی نێردرابێتنە ناو شاری شوشەڕاوە، هەواڵی چۆڵ چۆڵ کردنی شارەکەو دزە کردنیان نووسراوە.[٥٩]

٦٤-٦٥) ***Ša-um-mi***[ki] ***ù 'Ḫu'-bí/ne-za-gu***[ki]**:** ناوی دوو شارن کە هیچ شتێکیان لەبارەوە نازانرێت، ئەوەندە نەبێت کە پێ دەچێت لە دەشتی ڕانیە بووبێتن، لەوانەیە لە شوێنێکی نێوان شیکشاببوم و ئوتووم دا (دێڕی ٦٩).

٦٨) ***ú-kà-ni-ís-sú-nu-ti*:** ئەم فۆرمـــە لە هـــەردوو نووسینـــەکـــەی سەرپـــول (Anubanini II) (ستوونی II، دێڕی ١٩)[٦٠] و ئورشەلیم (ستوونی IV، دێڕی ٢٦) یش دا هاتووە. ئەمەش فۆرمێکی جیاکەرەوەی زمانی ئەکەدیی سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئور و نووسینەکانی سەردەمی بابلیی کۆن لە باکور بووە.[٦١]

٦٩) ***ma-at U-tu-we***[ki]**:** یەکێک لە وولاتە گرنگەکانی کوردستانی دێرین بووە لە ڕۆژهەڵاتی دیجلەوە کە لە سەرچاوەکانی سەرەتای سەردەمی بابلیی کۆن دا بە شێوەی

---

[59]Walker, p. 207-8.

[60]بۆ دەقی ئەم نووسینە بڕوانە:

Edzard, *AfO* 24, p. 76.
[61]Shaffer and Wasserman, p.36.

ئوتووم *Utûm*' هاتووه. ئەم وولاته چەند شارێکی له خۆ گرتبوو که شوشەڕڕا یەکێکیان بوو.[٦٢] ئەوه ڕوونه که ئەم شێوەیەی لەم نووسینەدا هاتووه، واته *Utuwe* شێوه خوری‌یه ڕەسەنەکەی شێوەی بەئەکەدی کراوی *Utûm* ه. لەوانەیه بەسوود بێت لەم شوێنەدا ئاماژەیەک بۆ ناوی ناوچەی بێتواته بکەین. ئەم ناوه هاوچەرخه پێ دەچێت له دوو ووشه پێک هاتبێت؛ یەکەمیان ووشەیەکی سامی (لەم بارەدا: ئارامی) *Bē/īt* به واتای وولات یان ناوچه، هەروەک له ناوی جوگرافی تری ناوچەکەشدا دەبینرێت ، بۆ نمونه 'بێتوێن،' '*باگەرمێ*' که له '*بێت گەرمای*' ەوه هاتووه به واتای 'وولاتی گەرم' — 'گەرمیان'[٦٣]، و '*بازەبدا*،' که له '*بێت زەبدا*' وه هاتووه، '*باعەذرێ*' و هی تر. بەشی دووەمی ناوەکەش بریتی‌یه له '*واتێ/ـــه* *Wate/a*،' لەوانەیه ئەمەیان هەر ناوه کۆنەکه بێت و بۆ ئەم شێوەیەی ئێستای پەرەی سەندبێت:

Utûm: *Utu*> *Ute*> *Wute*> *Wate*.

٧٠-٧٢) ***i-na qa-ti Kak-mi-im*** $^{ki}$ ***'ut?'-ti-ir*:** وەرگێڕانی ئەم ڕستەیه دەبێت بەم شێوەیه بێت: "(وولاتی *ئوتـــوێ* *Utuwe* ی) لەدەست (وولاتی) کاکموم سەندەوه/وەرگرتەوه."[٦٤]

وولاتی کاکموم[٦٥] ناوێکی جوگرافیی زۆر ناسراو بووه، هەر لەسەردەمی سەرهەڵدانی بنەماڵەکانەوه له ئەرشیفەکانی 'ئێبلا'دا ناوی هاتووه. لەم ئەرشیفانەدا به شێوەی

---

[62] Læssøe, J., "The Quest for the Country of *Utum," *JAOS* 88 (1968), p. 122.

[63]ئاماژەیه بۆ ناوچەکانی دەوروپشتی کەرکوک و باشوری.

[64]سەبارەت به واتاکانی *ina qāti...* بڕوانه:

*CAD*, Vol. Q, p. 192, clause: 2′: a′.

[65]بۆ خوێندنەوەی ناوی ئەم وولاته به شێوەی *kak-mi-im* نەک *Ni-mi-im* له سایەی پرۆفێسۆر فێینهۆفەوەیه. له یەکەم خوێندنەوەی ئەم ناوەدا که له هەزارمێرد دا بڵاوکراوەتەوه به 'نیموم' خوێندومانەتەوه.

'کاکمیوم Kakmium' نووسراوە و باس لە بوونی پەیوەندیی بازرگانی لە نێوانی ئەم و ئێبلادا دەکەن. لە هەندێک لەو بەڵگەنامانەدا، باس لە سەردارێکی ناو نەبراوی کاکموم کراوە کە داوای بەدەست گەیاندنی کاروانێکی ڕیس وجل وبەرگ دەکات و بە پێ ی بەڵگەنامەیەکی تر دەبوایە بارەکان بگەنە شارێکی تری سەر بە قەڵەمڕەوی کاکموم.[٦٦] ئەمە نیشانەیە بۆ ئەوەی کە کاکموم لە سەردەمانێکی زۆر زووەوە شانشینێکی یان میرنشینێکی بەهێزو و دەست ڕۆیشتوو بووە و شاری تر و لەوانەشە هەرێمی تری دەرەوەی ناوچەکەی خۆیی لەژێر دەست دا بووە. کاکموم لە سەردەمانی دواتریشدا هەر گرنگ بووە؛ لە ڕاپەرینە گەورەکەی دژ نەرام-سین ی ئەکەد دا بەشدار بووە.[٦٧] لەسەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئوریشدا، هەرچەندە زۆر کەم ناوی هاتووە، بەڵام هەر دەبێت لەشکرکێشیی کرابێتە سەر؛ چونکە دەقێکی ئەرشیفی لە شوێنەواری 'درێهم' (پوزریش-داگان Puzriš-Dagan ی کۆن) ەوە باس لە پێدانی مەڕ دەکات بە سێ کەسی خەڵکی کاکموم.[٦٨] لەمەش زیاتر، پێدەچێت شوێنی کاکموم کە دەبێت لە چاو شارو ناوچەکانی تردا لە سومەرەوە دوورتر بووبێت، بەڕای ۆوکەر هۆیەکی تربووبێت بۆ کەم ناو هاتنی لە بەڵگەنامەکانی سومەری ئەو سەردەمەدا.[٦٩] بەڵام ناوهاتنی شاشروم، ئوربیلوم و وولاتانی دووری تر لە بەڵگەنامە سومەرییەکانی هەمان سەردەمدا، کە دیارە لە هەمان مەودای دووری دا بوون، پاڵپشتیی ئەم ڕایەی وۆکەر ناکات، بەڵکو پێدەچێت کاکموم، هەروەک سەردەمانی تر، هێندە بەهێز بووبێت کە بتوانێت خۆی بپارێزێت و بەرپەرچی شاڵاوە سومەرییەکان بداتەوە. وادیارە ئەم جەربەزەیی وسەرسەختیەی

[66] بۆ بینینی ئەو بەڵگەنامانەی پەیوەندییان بەم بابەتەوە هەیە، بڕوانە:
Walker, *Op. Cit.*, p. 13-14.
وۆکەر "EN *Kak-mi-um*" ی بە "پادشای کاکمیوم" وەرگێڕاوە، بەڵام لۆگۆگرامی EN ی سومەری واتای 'سەردار'، 'سەروەر' یان 'فەرمانڕەوا' دەبەخشێت.
[67] Grayson and Sollberger, *RA* 70, p. 115 (l. 3′).
[68] Walker, *Op. Cit.*, p. 193.
[69] *Ibid.*

کاکموم کە دەمانێکی زۆری دواتریش هەر بەکار بووە، هۆی ئەوە بووبێت ١٤٠٠ ساڵێک پاشتر سارگۆنی ئاشوری (٧٢١-٧٠٩ پ.ز.) بە کاکمییەکان بڵێت "دوژمنە شۆفارەکانی وولاتی کاکمی."[٧٠] بۆ پاڵپشتیی ئەمەش، نووسینەکەی ئورشەلیم کە تیایدا ئیددیـ(ــن)-سین بە ڕاشکاوی دەڵێت "وولاتی کاکموم، کە لە ڕۆژ(انی) هەرە دێرینییەوە باجی [بە] هیچ کەس [نە]داوە"[٧١] بەڵگەیەکی تری ئەم ووتەیەیە. بەڵگەکانی بەردەست دەری دەخەن کە کاکموم لە سەردەمی پاش ڕمانی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی سێیەمی ئوردا یەکێک لە زلهێزەکانی کوردستانی کۆن بووە. ئەو چەندەها جار ناو بردنەی کاکموم لە زیاد لە بۆنەیەک دا لە نووسینەکانی ئیددیـ(ــن)-سین دا بەڵگەی گرنگیی ستراتیجی و پەلکێشانێتی لەم کاتەدا. دیارە ئیددیـ(ــن)-سین یش شکۆ و دەستکەوتەکانی شانشینەکەی خۆی لەسەر حسابی کاکموم بنیات ناوە بەوەی هەرجارەو یەک لە دوای یەک هەرێم و شارەکانی ژێردەستی لە دەست دەرهێناوەو خستوونییەتە سەر وولاتەکەی خۆی، لە پێشدا ئوتوم (نووسینەکەی هەڵەدنی) و پاشان کولوننوم (نووسینەکەی ئورشەلیم).[٧٢] سەرباری ئەمەش، کاکموم هەر بە هێزێکی سەرەکی و لایەنێکی کاریگەری ناوچەکە لە بەشی دوایی سەردەمی بابلیی کۆن دا مایەوە. لەنامەیەکیی شمشارەدا (SH 809)[٧٣] بەیەکێک لەو لایەنانە ناوبراوە کە *یاشوب-ئەدەد* ʿ*Jašūb-Adad*ʿ ی ئەخازوم لە زنجیرەی هاوپەیمانێتییە شلۆق و بگۆڕەکانی دا دوایان کەوتووە. لەنامەیەکی تردا (SH 904) هاتووە کە *موشکاوێ* ʿ*Muškawe*ʿ ی فەرمانڕەوای کاکموم پەلاماری ماڵاتی شاری *کیگیبشی* ʿ*Kigibši*ʿ ی داوە و تاڵانی

---

70 "kur*Ka-ak-mi-i* lúKÚR *lem-ni:*" Mayer, W., "Sargons Feldzug gegen Urartu-714 v. Chr., Text und Übersetzung," *MDOG* 115 (1983), p. 72, line 56.

71 Shaffer and Wasserman, (Col. iv 9-13), p. 8; 10.

تێبینی بکە کە لەم باسە ئاماژە بۆ کراوەدا ناوی کاکموم بە هەڵە بە نیموم خوێندراوەتەوە، ئەویش لەبەرئەوەی نیشانەی مێخیی KAK لەزۆر نووسیندا بە هەمان نیشانەی NI نووسراوە.

72 Col. iii 4′-iv 8.

73 Eidem and Læssøe, No. 1, p. 70.

کردوون.[٧٤] لەنامەیەکی تردا (SH 802, 808+815) هەواڵی ئامادەکردنی هێرشێک بۆ سەر کاکموم خۆی تۆمار کراوە.[٧٥] هەندێک ئاماژەی تر بۆ کاکموم لە هەندێک نامەی تری سەردەمی بابلیی کۆنی دەرەوەی کوردستانی کۆن دا کراون؛ لەوانە باسی زیندانی کردنی دوو کەسی بابلی لە کۆشکەکەی کاکموم (AbB 2, 46, 9)، و باسی تەتەریکی کاکمێی لە نامەیەکی شاری ماری دا (ARM 6, 79, 17).[٧٦] هەر لێرەشدا، لەشکرکێشی‌یەکەی حەمورابی مان لە یاد نەچێت کە لە ٣٧ هەمین ساڵی فەرمانڕەوایی دا بۆ سەر کاکموم ئەنجامی دا.[٧٧]

فرەین پێشنیازی کۆیە ی کردووە بۆ شوێنی دێرینی کاکموم. لەمەدا پشتی بە لەیەک چوونی مۆرفۆلۆجی‌یانەی هەردوو ناوەکە بەستووە.[٧٨] لەکاتێکدا کە ئەم بەڵگەیە بەس نیە، پێشنیازەکەی لاسۆ و ئایدێم کە بە پشت بەستن بە بەڵگەی نووسراوی ئەو سەردەمە پێشکەشیان کردووە، زیاتر لە ڕاستەوە دیارە. ئەمان باوەڕیان وایە لە شوێنێکی ناو دۆڵەکانی نێوان سلێمانی و چەمچەماڵ دا بوو بێت،[٧٩] هێندەش لە باکورەوە، لە نێوان ئێکەللاتوم Ekallātum و هەولێردا نەبووە، هەروەک ئاستۆر بۆی چووە.[٨٠]

---

[74] *Op. Cit.*, No. 44, p. 114-115.

ناوی کەسیی موشکاوێ *Muškawe* ناوێکی خوریی ڕوون و ئاشکرایە، بڕوانە:

*Op. Cit.*, p. 24, note 33.

[75] *Op. Cit.*, No. 69, p. 142-143.

[76] Röllig, W., "Kakmum," *RlA* 5 (1976-1980), p. 289.

[77] *Ibid.*

بۆ لیستێکی تەواو و نوێ ی ئاماژە مێژوویی‌یەکانی بۆ کاکموم کراون، بڕوانە:

Eidem and Læssøe, p. 23.

[78] Frayne, *SCCNH* 10, p. 171.

[79] Eidem and Læssøe, p. 24.

[80] Astour, *Op. Cit.*, p. 8-11.

$^{m}$*Ma-d/k/qi-a-[x]*, $^{m}$*Ša-wa/i/pi-a-[x]*, $^{m}$*Ma-gi-ba-* (٨١-٧٥ *'bi/am/ta'*, $^{m}$*A-ḫa-'tum'*, $^{m}$*A-wi-la-núm ra-bí-a-nu A-mu-ri-im*:
بەداخەوە خوێندنەوەی ئەم ناوانە گیرو گرفتی تێدایە، بە تایبەتی کۆتایی هەردوو ناوی یەکەم و دووەم بەهۆی داخورانیانەوە. جێگـــای تەماعە نـــاوی دووەم بە 'شـــا پی-یا *Ša pî-ya*' بخوێنینەوە کە ناوێکی سامیی نمونەیی دەبێت و واتای "ئەوەی لە/هی دەمە" دەگەیێنێت. بەڵام ئەم پێشنیازە لەمەترسیی بە هەڵەدا چوون دوور نیە، چونکە ئەم ناوە کەسیی‌یە تایبەتە بە باشوری مێسۆپۆتامیا و مۆرکی جیهانی ئاموریی پێوە نیە، لە کاتێکدا کە دەبێت ناوەکە ئاموری بێت چونکە هەڵگرەکەی ئاموری‌یە. هەردوو ناوی کۆتایی تەواو سامین: لە *aḫum* و *awīlum*ەوە هاتوون. ووشەی *rabiānu(m)* کە گەڵێک واتای هەیە و لەسەر وەرگێرانی چەندین ڕا و بۆچوون هەیە، لێرەدا واتای یەکەم وسەرەکی‌مان وەرگرتووە و بە 'شێخـــ(ـــی عەشیرەت)' یان 'سەردار' وەرمان گێڕاوە.[٨١]

بۆ یەکەمین جار لەم نووسینەدا شەڕی نێوان سیموررروم و ئاموری‌یەکان دەبیستین. وادیارە ئەم شەڕە کاتێک هەڵگیرساوە کە ئاموری‌یەکان پاش ڕمانی بنەماڵەی سێ یەمی ئور، هەروەک چۆن هوروژمیان هێنایە زۆر ناوچەی مێسۆپۆتامیاوە و تیایدا نیشتەجێ بوون، هەوڵیان دا بێنە ناو خاکی سیموررومیشەوەو داگیری بکەن. سەرنج ڕاکێشە کە سیموررروم، هەروەک بەڕوونی لەنامەیەکی سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئورەوە دەردەکەوێت، لە پێشدا هاوپەیمانی ئاموری‌یەکان بوو و بەلایەنی کەمەوە یەک جار لە شاڵاوێکی ئاموری‌یەکاندا بۆ سەر مەرزەکانی ئیمپراتۆری ئور بۆ کۆمەکیان چووە.[٨٢]

---

[81] بۆ ووردەکاری زیاتر و واتاکانی تری ئەم ووشەیە، بڕوانە:

Stol, M., *Studies in Old Babylonian History*, Leiden, 1976, pp. 73-89.

[82] بۆ ناوەڕۆکی ئەم نامەیە و دەقە سومەری‌یەکەی، بڕوانە:

Michałowski, *The Royal Correspondence of* ……, p. 225; (229), line 15.

ئاموری‌یەکان پاش گیرانی ئوری پایتەخت و گۆڕانی هاوسەنگیی هێز لە ناوچەکەدا بوونەتە دوژمنی سیموررروم، لە پێشدا توانایان بۆ دژایەتی ئور تەرخان کردبوو کە دوژمنی دێرینی سیموررومیش بوو بۆیە لەمەدا ئامانجیان یەک بوو، بەڵام لەپاش ڕووخانی ئور دیارە سیموررروم خۆی بوتە نیشانی هەندێک لە کۆچ بەران و داگیرکەرانی ئاموری و ئەمەش هۆی هەڵگیرسانی ئەم شەڕە بووە.

٨٣-٨٥) *ù A-mu-ra-am i-na kúl-le-'e?'-šu iṭ-ru-«$u_4$»-us-sú*: فرمانی ئەم ڕستەیە بەلای منەوە زۆر ڕوون نیە. *ṭarādu* یەکەم کاندیدایە، بەڵام نیشانەی UD هەندێک دوودڵی دروست دەکات. ئەگەر بە -*ut*- بیخوێنینەوە، ئەوا گرفتمان لەگەڵ -*us-sú* کە لە **ud/t-šu* ەوە هاتووە، بۆ پەیدا دەبێت. ئەگەر بە $u_4$ یش بیخوێنینەوە، ئەوا گرفت لەگەڵ فرمانەکە خۆی دروست دەبێت، چونکە ڤاوەڵی درێژ لەگەڵ ئەم فرمانەدا ناگونجێت. لەم بارەدا دەشێت بیر لە هەڵەی نووسین بکەینەوە و وای دابنێین کە نیشانەی UD بەهەڵە دانرابێت، هەڵەی لەم جۆرەش لە نووسینە کۆنەکاندا دەگمەن نیە.

سەبارەت بە ووشەی *kullêšu*، پێدەچێت هەمان ئەو ووشەیە بێت کە لە نیشانی نیشبا لە دێڕی ٢ و ١٠٥ یشدا هاتووە. بۆ تێگەیشتنی ئەم ووشەیە، نووسینەکەی ئورشەلیم زۆر یارمەتیدەرە. لێرەدا لەبەردەم گرفتێکی تری ڕێزمان داین؛ وەک جێنێتیڤ دەبووایە *kulē/īši* بووایە، لەمەش زیاتر، هۆیەکی دیار بۆ بەکارهێنانی جووت *l* نیە. بەڵام هەرچۆنێک بێت، وادیارە کە مەبەستی نووسینەکە ئەوەیە کە ئیددیـ(ـن)-سین ئاموری‌یەکانی لەخاکی سیموررروم، یان بۆ دەرەوەی خاکی سیموررروم گێڕایەوە/ پاڵ پێوەنایەوە.

٩٢-٩٤) *A-mu-ra-am ù Si-maš-kà-am$^{ki}$ i-ne-er* : لێرەدا بۆ یەکەم جارە ناوی ووڵاتی سیماشکی لە نووسینەکانی ئەم پادشایەدا دێت. لە شێوە و بنیاتی هەموو

دەقەکەوە دەردەکەوێت کە پادشا لێرەدا پاش خستنەڕووی کارە سەربازی‌یەکانی، دوو گرنگترین و چارەنووس سازترینیان دووبارە دەکاتەوە و لەچاوی نیشبایان دەناسێت. کەواتە دیارترین دەستکەوتەکانی شکاندنی سیماشکی‌یەکان و دوورخستنەوەی مەترسی ئاموری‌یەکان بوو لەسەر وولاتەکەی. لەوانەیە سیماشکی‌یەکانیش لە دەمێکی پێشتردا هەوڵیان دابێت لە ڕۆژهەلاتەوە سیموررووم داگیر بکەن و ئەو نووسینەی شاهانەیەی سیموررووم کە بۆ ئەم سەرکەوتنە تەرخان کراوە، هێشتا نەدۆزرابێتەوە. بۆیە ئیددیـ(ـــن)-سین ڕەزامەندی و فەڕی خواوەندی وولاتەکەی بەدەست هێناوە، بەوەی کە شەڕەکەی شەڕێکی پیرۆز بووە بۆ بەرگری لە وولات و خاکی نیشتیمان.

شوێنی سیماشکی ڕای دژ بەیەکی لەسەرە، هەندێک لەو دۆلانەی دادەنێن کە لە باکوری خوزستان و/یان هەرێمی فارسەوەن.[٨٣] بەلام ڤاللا لە شوێنێکی زیاتر بەلای باشوری ڕۆژئاوادا دەبیات، لە بەشی باکوری هەرێمی کرمان.[٨٤] بەلام پێشنیازێک کەلەگەڵ زانیاری نووسینەکەی هەڵەدنی دا بگونجێت، ئەوەکەی زادۆک Zadok ە، ئەو سیماشکی بە وولاتێکی زۆر بەرفراوان دەزانێت کە هەر لە هەرێمی فارسەوە تا دەریای قەزوینی گرتبێتەوە.[٨٥]

***[d]I-dì-[d]EN. ZU qar-dum i-lu-šu-nu-ti a-na še-ep [d]Ni-iš-ba be-li-ʾšuʾ ú-kà-ni-ís-sú-nu-t[i]:*** (٩٥-١٠١)

سەرکەوتنی سەربازی دەبێت تاجی سەرکەوتنێکی ئایدیۆلۆجیشی لەسەر بنرێت، خواوەندانی نەتەوە شکاوەکان دەبێت کڕنووش بۆ خواوەندی نەتەوەی سەرکەوتوو

---

[83] Stolper, M. W., "On the Dynasty of Šimaški and the Early Sukkalmahs," *ZA* 72 (1982), p. 45-46.
[84] Vallat, Les nomes géographiques des sources souso-élamites, *RGTC* 11, 1993, p. 242-3.
[85] Zadok, R., "Elamite Onomastics," *Studi epigrafici e linguistici sul Vicino Oriente antico (SEL)* 8 (1991), p. 227.

بەرن. ئیددیـــ(ـــن)-سین لەم نووسینەدا خۆی بە "پاڵەوان" وەسف دەدات، بەڵام دواتر لە نووسینەکەی ئورشەلیم دا دەبێتە "پاڵەوانی نێو پادشا(یان)، پادشای بەهێز،"[٨٦] ئەویش تەنها پاش بەزاندنی هەرێمی نۆهەم و خستنیە سەر وولاتەکەی خۆی، ئەو هەرێمەش کاکموم بوو.

لە رووی رێزمانەوە، لەوە دەچێت رستەکە لەژێر کاریگەریی سینتاکسی زمانی خوری دا بێت کاتێک لە جیاتی *i-li-šu-nu-ti* دەڵێت *i-lu-šu-nu-ti* ، ئەمەش سەیر نیە ئەگەر باش تەماشای نمونەکانی تری لەم جۆرە بکەین کە لە دەقە ئەکەدییەکانی شاری نوزی دا هەن و شپایزەر تێبینی کردوون.[٨٧]

**١٠٢- *ma-tá-tum ša i-te-bu-ʾšuʾ-na-ti* ʾÉʾ *ᵈNi-iš-ba* [LUGAL] (١٠٥*8-ʾku?ʾ-[li?-ši?]*:**

شتێک کراوە یان روویداوە کە بە شێوەیەک پەیوەندیی بە پەرستگای خواوەند نیشباوە هەبووە و ئەوەندەی من ئاگادار بم لێرەدا بۆ یەکەم جار باس کراوە. بەداخەوە، ئەو فرمانەی کە دەکرێت ئەم رووداوە روون بکاتەوە، لەسەر بەردەکە شکاوە و ناتوانین بە دڵنیاییەوە هەڵی بهێنین. بەڵام لەبەرئەوەی ووشەی *ma-tá-tum* "وولاتان" لێرەدا نۆمینەتیف (=مرفوع) ە، دەکرێت فرمانێکی وەک *banû* "بنیات نان"، *edēšu* "نوێ کردنەوە"، *šuklulu* "تەواوکردن"، *madādu* "(باج) پێدان" یان تەنانەت *ḫalāqu* "وێران کردن" یش بووبێت.

---

[86] "*ᵈI-dì-ᵈEN. ZU qar-dim i-na LUGAL, LUGAL da-núm,*"
تەماشای نووسینەکەی ئورشەلیم بکە: col. i 10′-12′.

[87] بڕوانە:
Speiser, *Introduction to Hurrian*, p. 208.

لەم ڕستەیەش دا کاریگەریی ڕێزمانی خوری لە ووشەی *i-te-bu-šu-na-ti* دا دیارە کە دەبوایە *i-te-bu-ši-na-ti* بووایە، ئەم هەڵەیە دیارە لەوەوە هاتووە کە نووسەر خوری زمان بووە و لە زمانی خوریش دا ڕەگەز (= gender) جیا نی‌یە.

خشتەی ناوە جوگرافییەکانی نووسینەکانی ئیددیـــ(ـــن)-سین بە پێی بەدوایەکدا هاتنی ئەلف و بێی:[88]

| هەڵەدن (ID 6) | سەرپول (ID 5) | ئورشەلیم (ID 4) | بیتواتە (ID 1, 2, 3) |
|---|---|---|---|
| | | *A-i-la-ki*$^{ki}$ ii 11′ | |
| | *Ba-ti-ir*$^{ki}$ ii 22 | | |
| *Be-el*$^{ki}$ i 49 | | | |
| *Ḫal-ma-an*$^{ki}$ i 48 | | | |
| | | *Ḫa-ap-ri-za-ni*$^{ki}$ ii 9′ | |
| *Ḫu-bi/ne-za-gu*$^{ki}$ ii 65 | | | |
| *I-te-ra-áš-we*$^{ki}$ ii 62 | | | |
| *I-tu*$^{ki}$ ii 63 | | | |
| *Kak-mi-im*$^{ki}$ ii 73 | | *Kak-mi-um* ii 4, iv 1, iv 9 | |
| | | *Ku-ba-an-ni-we*$^{ki}$ ii 12′ | |
| | | *Ku-lu-na-am*$^{ki}$ iii 4′; v 5″; viii 8 | *Ku-lu-un-nu-um*$^{ki}$ A 6 |
| *Lu-lu-bi-im*$^{ki}$ i 52 | | | |
| | | NI-*li-ip*$^{ki}$ iii 3 | |
| *Si-maš-kà-am*$^{ki}$ ii 93 | | | |
| *Si-mu-ri-im*$^{ki}$ i 6; i 34 | | *Si-mu-ur-ri-im*$^{ki}$ i 13′; iv 2, 20 | *Si-mu-ri-im*$^{ki}$ A 3 |
| *Ša-gi*$^{ki}$ i 15 | | | |
| *Ša-ri-da-ḫu-um*$^{k}$ i 37 | | | |
| *Ša-um-mi*$^{ki}$ ii 64 | | | |
| *Ši-ik-ša-am-bi*$^{k}$ ii 60 | | *Ši-ik-ša-am-bu-um*$^{ki}$ iv 27 | |
| | | *Šu-lu-te*$^{ki}$ ii 10′ | |
| *Te*-NI-*im*$^{ki}$ i 20 | | | |
| *Ti-da-luḫ-ḫa-am*$^{ki}$ ii 58 | | *Ti-ri-uk-ki-na-áš-we*$^{ki}$ ii 13′ | |
| *Ut-tu-we*$^{ki}$ ii 69 | | | |
| *...bi/ne-šum*$^{ki}$ i 36 | | | |
| *....-ti-na-ab-ba-ša-we*$^{ki}$ i 43 | | | |

[88] لە نووسینەکانی بیتواتەدا تەنها ڕونووسی A بە ڕونووسی سەرەکی وەرگیراوە.

ناوەجوگرافی‌یەکانی نووسینەکانی ئیددیـ(ـــن)-سین بە بەدوای یەکدا هاتنی ناو نووسینەکان خۆیان:

| بیتواته (ID 1, 2, 3) | ئورشەلیم (ID 4) | سەرپول (ID 5) | هەڵەدنی (ID 6) |
| --- | --- | --- | --- |
| *Si-mu-ri-im*$^{ki}$ A 3<br>*Ku-lu-un-nu-um*$^{ki}$ A 6 | *Si-mu-ur-ri-im*$^{ki}$ i 13′<br>*Kak-mi-um* ii 4<br>*Ḫa-ap-ri-za-ni*$^{ki}$ ii 9′<br>*Šu-lu-te*$^{ki}$ ii 10′<br>*A-i-la-ki*$^{ki}$ ii 11′<br>*Ku-ba-an-ni-we*$^{ki}$ ii 12′<br>*Ti-ri-uk-ki-na-áš-we*$^{ki}$ ii 13′<br>NI-*li-ip*$^{ki}$ iii 3<br>*Ku-lu-na-am*$^{ki}$ iii 4′<br>*Kak-mi-um* iv 1<br>*Si-mu-ur-ri-im*$^{ki}$ iv 2<br>*Kak-mi-um* iv 9<br>*Si-mu-ur-ri-im*$^{ki}$ iv 20<br>*Ši-ik-ša-am-bu-um*$^{ki}$ iv 27<br>*Ku-lu-na-am*$^{ki}$ v 5″ | *Ba-ti-ir*$^{ki}$ ii 22 | *Si-mu-ri-im*$^{ki}$ i 6<br>*Ša-gi*$^{ki}$ i 15<br>*Te*-NI-*im*$^{ki}$ i 20<br>*Si-mu-ri-im*$^{ki}$ i 34<br>… *bi/ne-šum*$^{ki}$ i 36<br>*Ša-ri-da-ḫu-um*$^{ki}$ i 37<br>… .-*ti-na-ab-ba-ša-we*$^{ki}$ i 43<br>*Ḫal-ma-an*$^{ki}$ i 48<br>*Be-el*$^{ki}$ i 49<br>*Lu-lu-bi-im*$^{ki}$ i 52<br>*Ti-da-luḫ-ḫa-am*$^{ki}$ ii 58<br>*I-te-ra-áš-we*$^{ki}$ ii 62<br>*I-tu*$^{ki}$ ii 63<br>*Ḫu-bi/ne-za-gu*$^{ki}$ ii 65<br>*Ši-ik-ša-am-bi*$^{ki}$ ii 60<br>*Ša-um-mi*$^{ki}$ ii 64<br>*Ut-tu-we*$^{ki}$ ii 69<br>*Kak-mi-im*$^{ki}$ ii 73<br>*Si-maš-kà-am*$^{ki}$ ii 93 |

ناوی خواوەندانی ناو نووسینەکانی ئیدیـ(ـــن)-سین بە پێی بە دوای یەکدا هاتنی ئەلف و بێیی:[89]

| هەڵەدنی (ID 6) | سەرپول (ID 5) | نورشەلیم (ID 4) | بیتواتە (ID 1, 2, 3) |
|---|---|---|---|
| | AN ii 31 | AN i a′; vi 7 | AN A 36 |
| | | DU.Ú(?) vi 19 | |
| | $^{d}$EN.KI ii 34 | $^{d}$EN.KI i d′; vi 10 | $^{d}$EN.KI A 39 |
| | $^{d}$EN.LÍL ii 32 | $^{d}$EN.LÍL i b′; vi 8 | $^{d}$EN.LÍL A 37 |
| | $^{d}$EN.ZU ii 35 | $^{d}$EN.ZU i e′; vi 11 | $^{d}$EN.ZU A 40 |
| $^{d}$INANNA i 7 | $^{d}$INANNA ii 40 | $^{d}$INANNA i 1′; vi 13 | $^{d}$INNIN A 15; 23; 45 |
| | $^{d}$IŠKUR ii 36 | $^{d}$IŠKUR i f′; vi 12 | $^{d}$IŠKUR A 14; 41 |
| | $^{d}$*Nin-an-si$_4$-an-na* ii 42 | $^{d}$*Nin-an-si$_4$-an-na* i 2′; vi 14 | $^{d}$*Nin-an-si$_4$-an-na* A 47 |
| | $^{d}$NIN.ḪUR.SAG ii 33 | $^{d}$NIN.ḪUR.SAG i c′; vi 9 | $^{d}$NIN.ḪUR.SAG A38 |
| $^{d}$*Ni-iš-ba* i 1; 9; ii 67; ii 86; ii 99; ii 104 | $^{d}$*Ni-iš-ba* ii 44 | $^{d}$*Ni-iš-ba* i 4′; iv 24; vi 16 | $^{d}$*Ni-iš-ba* A 16; 49 |
| | $^{d}$UTU ii 38 | $^{d}$UTU i g′; vi 18 | $^{d}$UTU A 43 |

[89]لە نووسینەکانی بیتواتەدا تەنها ڕونووسی A بە ڕونووسی سەرەکی وەرگیراوە.

ناوی خواوەندانی ناو نووسینەکانی ئیددی(ـــن)-سین بە بەدوایەک هاتنی ناو نووسینەکان خۆیان:

| هەلەدنی (ID 6) | سەرپول (ID 5) | ئورشەلیم (ID 4) | بێتواتە (ID 1, 2, 3) |
|---|---|---|---|
| $^{d}$*Ni-iš-ba* i 1 | AN ii 31 | AN i a′ | $^{d}$IŠKUR A 14 |
| $^{d}$INANNA i 7 | $^{d}$EN.LÍL ii 32 | $^{d}$EN.LÍL i b′ | $^{d}$*Ni-iš-ba* A 16 |
| $^{d}$*Ni-iš-ba* i 9 | $^{d}$NIN.ḪUR.SAG ii 33 | $^{d}$NIN.ḪUR.SAG i c′ | $^{d}$INNIN A 15 |
| $^{d}$*Ni-iš-ba* ii 67 | $^{d}$EN.KI ii 34 | $^{d}$EN.KI i d′ | $^{d}$INNIN A 23 |
| $^{d}$*Ni-iš-ba* ii 86 | $^{d}$EN.ZU ii 35 | $^{d}$EN.ZU i e′ | AN A 36 |
| $^{d}$*Ni-iš-ba* ii 99 | $^{d}$IŠKUR ii 36 | $^{d}$IŠKUR i f′ | $^{d}$EN.LÍL A 37 |
| $^{d}$*Ni-iš-ba* ii 104 | $^{d}$UTU ii 38 | $^{d}$UTU i g′ | $^{d}$NIN.ḪUR.SAG A38 |
| | $^{d}$INANNA ii 40 | $^{d}$INANNA i 1′ | $^{d}$EN.KI A 39 |
| | $^{d}$*Nin-an-si$_4$-an-na* ii 42 | $^{d}$*Nin-an-si$_4$-an-na* i 2′ | $^{d}$EN.ZU A 40 |
| | $^{d}$*Ni-iš-ba* ii 44 | $^{d}$*Ni-iš-ba* i 4′ | $^{d}$IŠKUR A 41 |
| | | $^{d}$*Ni-iš-ba* iv 14 | $^{d}$UTU A 43 |
| | | AN vi 7 | $^{d}$INNIN A 45 |
| | | $^{d}$EN.LÍL vi 8 | $^{d}$*Nin-an-si$_4$-an-na* A 47 |
| | | $^{d}$NIN.ḪUR.SAG vi 9 | $^{d}$*Ni-iš-ba* A 49 |
| | | $^{d}$EN.KI vi 10 | |
| | | $^{d}$EN.ZU vi 11 | |
| | | $^{d}$IŠKUR vi 12 | |
| | | $^{d}$INANNA vi 13 | |
| | | $^{d}$*Nin-an-si$_4$-an-na* vi 14 | |
| | | $^{d}$*Ni-iš-ba* vi 16 | |
| | | $^{d}$UTU vi 18 | |
| | | DU. Ú (?) vi 19 | |

## ٢) سیموررووم و ئیدیــ(ــن)-سین ی پادشای

لە سەرچاوە نووسراوەکانەوە دەردەکەوێت کە سیموررووم هەم ناوی وولات بووە (*mātum* ی ئەکەدی) و هەم ناوی شاریش (*ālum* ی ئەکەدی).[1] لە هەندێک دەمی مێژووە درێژەکەی دا شانشینێکی سەربەخۆ بووە و پادشا، یان بە پێی بارودۆخی دەرەکی و ناوەکی میر/فەرمانڕەوا (بە گوێرەی وەرگێڕانی ووشەی *ensí* ی سومەری، *iššāku* ی ئەکەدی) ی خۆی هەبووە. ئەو سەرچاوە نووسراوانەی خۆیان لەباسی سیموررووم و مێژووی ئەو شەڕانەی بەرامبەری کراون، داوە، شوێنی ستراتیجی و گرنگیی سیاسی‌یانەی شانشینەکە پیشان دەدەن. دەوڵەمەندی سیموررووم و زۆر و زەبەندیی سەرچاوە سروشتی و مرۆیی‌یەکانی دەکرێت لەو هەستانەوە گورج و هاتنەوە سەرخۆ خێرایانەوە هەڵبهێنجرێت کە پاش هەر جەنگێک و لەشکرکێشی‌یەک بۆ سەر خاکەکەی تێبینی دەکرێت، بە تایبەتی لەشکرکێشی‌یە یەک لە دوای یەکەکانی پادشایانی بنەماڵەی سێ یەمی ئور. سیموررووم بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ لە مەیدانی سیاسیی کوردستانی کۆن دا بوو و زۆریش مایەوە؛ لە هەندێک بەڵگەنامەدا ناوی هاتووە کە ڕووداوی سەردەمی ٢

[1] Weidner, E., "Simurrum und Zaban," *AfO* 15 (1945-51), p. 75.

ی سەرهەڵدانی بنەماڵەکان (دەوروبەری ۲۷۰۰ پ.ز.) دەگێڕنەوە، لەسەردەمانی ئەکەدی و ئوری سێ یەم و بابلیی کۆنیشدا، هەروەک لەم بەشەدا دیبینین، جەنگی لە دژ بەرپا کراوە.

ناوی سیموررووم بەچەند شێوەو ڕێنووسی جیاواز نووسراوە. لە سەرچاوە هەرە کۆنەکاندا و تا سەردەمی بابلیی کۆن ناوەکە بە 'سیموررووم *Simurrum*' دەنووسرا، واتە بە (س) دەستی پێ دەکرد. بەڵام لەم سەردەمە بە دواوە ئیتر بە 'شیموررووم *Šimurrum*' دەنووسرا و (س) بووە (ش).[۲] هەروەها تێبینیش دەکرێت کە لە دەقە ئەکەدی زمانەکاندا (دەقەکانی سەردەمی ئەکەدیی کۆن و دەقەکانی گاسور) زۆربەی جار دوو (ر) دەنووسرا، کەچی لە دەقە سومەرییەکانی ئوری سێ یەمدا بەزۆری یەک (ر) ە. وا پێدەچێت ناوەکە لە زمانی زگماکی سیمورییەکاندا (ر)یەکی سووک بووبێت، واتە یەک دانە بووبێت، چونکە لە نووسینەکانی ئیددیـــ(ــن)-سین خۆیدا، هەرچەندە بەئەکەدی نووسراون، نووسینەکەی ئورشەلیم نەبێت لەوانی تر هەموویاندا بە یەک (ر) نووسراوە.[۳] ئەمانەش ئەو شێوانەی ڕێنووسی ناوی سیموررومن کە تا ئێستا بەدەست گەیشتوون:

**سەردەمی سەرهەڵدانی بنەماڵەکان:**[٤]

*Si-mu-ri*$^{ki}$
*Si-mu-r*[*u*$^{ki}$]

---

[2] بۆ ئەمە، بڕوانە:

Frayne, "On the location of Simurrum," *Crossing Boundaries and Linking Horizons*, 1997, Maryland, p. 244, note 1.

[3] تەماشای خشتەی ناوە جوگرافییەکانی ئەم بەشە بکە.

[4] Gurney, O. R. and S. N. Kramer, *Sumerian Literary Texts in the Ashmolean Museum,* Oxford, 1976, p. 38.

سەردەمی ئەکەدی:[٥]

SI-*mur-um*[ki]
SI-*mu-ur*$_4$*-ri-im*[ki]
SI-*mu-ru-um*[ki]
SI-*m*[*u*]*-ur*$_4$

سەردەمی گوتی:[٦]

*Si-mu-ur*$_4$*-rí-im*[ki]

سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئور:[٧]

*Si-mu-ru-um*[(ki)]
*Si-mu-ru*$_4$
*Si-mu-ru-um*[ki]
*Si-mu-ru*$_4$*-um*

سەردەمی بابلیی کۆن:[٨]

uru*Ši-mu-ru-um*[ki]
*Ši-mu-ur-ru-um*[ki]

---

[5]بۆ ئەم ناوانەی ئەم سەردەمە، بڕوانە:

Edzard, Farber and Solberger, Die Orts- und Gewässernamen der präsargonischen und sargonischen Zeit, *RGTC,* Band 1, p. 143-4.

[6]هەروەک لە نووسینە شاهانەکەی ئێرریدو-پیزیر دا هاتووە:

Col. v BT 2, 10; Col. viii BT 2 10′; 12′.

بڕوانە:

Kutscher, *The Brockman...*

[7]بڕوانە:

Edzard and Farber, Die Orts- und Gewässernamen der Zeit der 3. Dynastie von Ur, *RGTC,* Band 2, p. 167-8.

[8]تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە:

Groneberg, B., Die Orts-und Gewässernamen der altbabylonische Zeit, *RGTC,* Band 3, p. 221.

*Ši-mu-ru-um*[ki]
*Ši-mu-rum*[ki]
*Si-mu-ur-ru-um*
*Si-mu-ri-im*[ki9]

سەردەمی ئاشوریی کۆن:[١٠]

*Ší-mu-ri-im*

## مێژوویەکی سیموررروم:

ئەگەر بە کرۆنۆلۆجیا قسە بکەین، ئەوا کۆنترین ئاماژەیەک بۆ سیموررروم لەسەرهەوردی کردارێکی سەربازییانە لەدژی ئەم وولاتەدا هاتووە، کە پادشایەکی **سەردەمی ٢ ی سەرهەڵدانی بنەماڵەکان** (دەوروبەری ٢٧٠٠پ.ز.) ئەنجامی داوە. ئەم پادشایە ناوی *'نانە' 'Nanne* (*Na-an-né*) بووە و هەواڵەکەی لە پەندێکی سومەریدا هاتووە کە دەڵێت:

"(نانە) سیموررومی گرت، بەڵام نەیتوانی باجەکەی وەربگرێت."[١١]

پەندێکی تر، هەرچەندە ناتەواوە، بەڵام لەوانەشە تەواوکەری پەندەکەی پێشوو بێت، باس لە قەڵا یان شورای سیموررروم دەکات و دەڵێت:

---

[9] Frayne, D., Old Babylonian Period (2003-1595 BC), *The Royal Inscriptions of Mesopotamia, Early Periods (RIME),* Vol. 4, Toronto, 1990, pp. 708, l.3.

بۆ یەکەم جار لە لایەن د. عبد الهادی الفوادی یەوە لەم سەرچاوەیەدا بلاو کراوەتەوە:

Al-Fouadi, A. H., "Inscriptions and Reliefs from Bitwāta," *Sumer* 34 (1978), p. 125, l. 3.

[10] Dercksen, J. G., *The Old Assyrian Copper Trade in Anatolia,* Leiden, 1996, p. 77.

[11] Si-mu-ri[ki] i-dib gu-bi nu-mu-un-da-gíd (-?),

بڕوانە:

Gurney and Kramer, *Op. Cit.,* p. 38.

"سیموررومی گرت، بەڵام [شوراکەیی] نە[ڕماند]."[١٢]

پەندێکی گرنگی تر کە لەهەمان کۆمەڵەدا هاتووە، باخەکانی سیموررووم و گەمی و بەرچنە بەیەکەوە باس دەکات، لەوانەیە مەبەستی لە باریکە زەویەکی پڕ باخ و بێستانی سیموررووم بێت:

"لە نێو بەرچنە و گەمی دا، باخەکانی سیموررومـــ(ـــن)."[١٣]

هاللۆ ئەم نانەیە بەهەمان *ئا-ئەننێ-پادا* 'A-anne-pada' ی پادشای ئوری سەردەمی ٢ی سەرهەڵدانی بنەماڵەکان دەزانێت.[١٤] ئەمە دەشێت بەڵگەی ئەو ڕاستیە بێت کە سیموررووم لەسەردەمە هەرە دێرینەکانەوە نیشانی کردارە سەربازی و تەماعە سیاسیەکانی مێسۆپۆتامیا بووە.

لە **سەردەمی ئەکەدی** دا سارگۆن یەکێک لە دوایین[١٥] ساڵانی فەرمانڕەوایی خۆی بە "ئەو ساڵەی سارگۆن چوو بۆ سیموررووم" ناوناوە، ئەم دیپاچە-مێژووەش لە دەقێکی ئەرشیفی دا لە نیپپورەوە دەست کەوتووە.[١٦] هەرچەندە بە ڕاشکاوی نەووتراوە مەبەست

---

[12] Si-mu-ri ì-dib bàd-e nu-[u]n(?)-[gul],

بڕوانە:

Alster, B., *Proverbs of Ancient Sumer,* vol. 1, Maryland, 1997, p. 86, no. 3. 31.

[13] "gi-gur-ta $^{giš}$má-šè(?) a-šà Si-mu-ur$_4$-ru-um$^{ki}$," Alster, *Op. Cit.*, p. 104, no. 3. 143.

[14] Hallo, "Simurrum and the Hurrian Frontier," p. 73.

[15] بەرای هاللۆ ئەم دیپاچە- مێژوویی‌یە هی دوایین ساڵەکانی فەرمانڕەوایی درێژخایەنی 'نەرام- سین'ە،

بڕوانە:

Hallo, "Gutium," *RlA,* p. 56.

[16] Mu *Śar-um*-GI Śi-mur-um$^{ki}$-šè ⌈ì⌉-gin-⌈na-a⌉: Gelb, I. J. and B. Kienast, *FAOS,* Band 7, (Sargon 1) p. 49.

له "چوون" چییە، بەڵام واتا سەربازی‌یەکەی ئاشکرایە، بەتایبەتیش ئەگەر نەرام-سین یاد بهێنینەوە کە ئەویش لە پاشتردا هەمان فرمانی بۆ ئاماژە بۆ لەشکرکێشی‌یەکی بۆ سیمورروم بەکار هێناوە. لە دیباچە-مێژووەکانی ئەمی دوایی‌یانەوە دەردەکەوێت کە دوو جار لەشکری ناردووەتە سەر سیمورروم:

"ئەو ساڵەی نەرام-سین بە لەشکرکێشی چووە (سەر) سیمورروم."[١٧]

لە دیباچەکەی تردا — کە ڕونووسێکی کەمێک جیاوازی لە شوێنەواری خەفاجە لە ناوچەی دیالەش دۆزراوەتەوە-، نەرام-سین پادشای سیموررومیشی بەدیل گرتووە، کە ‘*Baba* *بابا*’ ناوێک بووە. ئەم ناوەش ناوەکانی ڕۆژهەڵاتی دیجلەمان یاد دێنێتەوە کە زیاتر لە گاسور هەبوون و لە بەشی یەکەمدا باسیان کرا، بەڵام شەڕەکە لەسەر خاکێکی بە خوری بوو کراوە، چونکە ناوی شوێنەکە کە ‘*Kirašeniwe* *کیراشێنیوێ*’ یە، ناوێکی خوریی لە گومان بەدەرە:

"ئەو ساڵەی نەرام-سین لە‘کیراشێنیوێ‘ بەسەر سیموررومدا سەرکەوتوو بوو و ‘*بابا*‘ ئێنسی ی سیمورروم (و) ‘*دوبـــول*‘ ‘*Dubul* ی ئێنسی ی *ئەرامێ* *Arame*‘ ی گرت و ‘*نابی ئولماش*‘ ‘*Nabiulmaš* ی لەشاری *تُوتو* *Tutu*‘ چاودێری کرد."[١٨]

---

[17] [*i*]*n* 1 MU $^{[d]}$*Na-ra-am-* $^{d}$⸢EN. ZU⸣ *a-na* KASKAL ⸢KI⸣ *Śi-mu-ur*$_4$*-rí-im*$^{ki}$ *i-li-ku*: Gelb and Kienast, *Op. Cit.*, (Naram-Sîn 5a) p. 51.

[18] *in* 1 MU $^{d}$*Na-ra-am-*$^{d}$E[N. ZU] *Śi-mu-ur*$_4$*-[im]*$^{ki}$ *in Ki-ra-šè-ni-we/pi iš*$_{11}$*-a-ru ù Ba-ba* ENSÍ *Śi-mu-ur*$_4$*-ri-im*$^{ki}$ *Dub?-ul?* ENSÍ *A-ra-me*$^{ki}$ *ik-mi-ù Na-bí-ùl-maš in Tu-tu*$^{ki}$ *ib-rí*,

بڕوانە:

Walker, *Op. Cit.*, p. 19-20.

سالڤینی Salvini ئەم شاری کیراشێنیوێ یە بە یەکێک لە شارەکانی سیمورروم دەزانێت، بڕوانە:

Salvini, Earliest evidence of …. , *Urkesh and the Hurrians*, p. 102.

به پێی فرەین بێت، ئەم دیپاچە- مێژووانە دیپاچەی یەک لەدوای یەک بوون کە یادەوەریی شاڵاوی نەرام-سین بۆ سەر سیمورروم و شکاندنیان تۆمار کردووە، کە بە هەمووی ماوەی دوو ساڵی خایاندووە.[١٩] ناوی ئەم 'بابا'یە لەسەر پارچە بەردێکی[٢٠] سەردەمی ئەکەدیش تۆمار کراوە کە هەر لە زووەوە لە ١٨٩٧ ز. دا لە لایەن ڤینکلەر Winkler ەوە بلاو کراوەتەوە: "... کاتێک (نەرام-سین؟) [.....] [با]با ی [ئێنـ]ـسی ی [سیمـ]ـور[روم].(شکاوی)."[٢١] پێدەچێت ئەم پارچەیە دەسکەوتی شەڕی سیمورروم بووبێت.[٢٢] بە پێی ڕونووسی A ی دەقی "ئەفسانەکەی نەرام-سین،"[٢٣] پادشایەکی سیمورروم، پوتتیم-ئەتال ناوێک، یەکێک بووە لەو پادشایانەی چوونەتە هاوپەیمانێتییەکەی لەدژی نەرام-سین بەستیان. بەڵام وادیارە پوتتیم-ئەتال هێندە بەختەوەر نەبووە، چونکە بە گوێرەی هەمان ئەم دەقە وێژەیییە، لەپاش ئەوەی پادشای ئەکەد هاوپەیمانانی شکاند، ئەمیش لەگەڵ چەندی تردا بە دیل گیرا و بۆ وولاتی ئەکەد برا. جێگای سەرنجە کە ناوی پوتتیم-ئەتال ناوێکی خوریيە، بە پێچەوانەی ناوی 'بابا'وە کە هەر پادشای سیمورروم بوو، بەڵام ناوەکەی ناوێکی خۆماڵییە. ئەگەر ئەم

---

[19] Frayne, D., *The Historical Correlations of the Sumerian Royal Hymns, (2400-1900 BC),* (A Ph.D. Dissertation presented to the Faculty of the Graduate School of Yale University), Yale, 1981, p. 42.

[20] هالڵۆ ئەم پارچە بەردە بە پارچەی دەفرێکی بەردین دەزانێت، بڕوانە:

Hallo, *RHA,* p. 73;

بەڵام بەلای فرەینەوە سەرە گورزێکی بەردینە:

Frayne, "On the Location of….," p. 246.

[21] [*i*]-*nu* [*Ba*]-*ba* [PA. T]E. SI [*Śi-m*]*u-ur*$_4$-[*ri-i*]*m*$^{ki}$ (lacuna)

بڕوانە ئەم سەرچاوەیە:

Frayne, *Op. Cit.,* p. 246.

[22] Frayne, *Op. Cit.,* p.246.

[23] بۆ دەقی ئەم ئەفسانەیە، بڕوانە:

Grayson and Sollberger, *RA* 70, p. 120-1,

لەم دواییانەشدا ئەم سەرچاوەیەش وەرگێڕانێکی نوێی دەقەکەی بلاو کردووەتەوە:

Veenhof, K. R., Naramsin van Akkad slaat 'de Grote Opstand' neer, *Zij Schreven Geschiedenis,* p. 17.

هاوپەیمانێتی بەستنە لەپاش دوو شاڵاوەکەی نەرام-سین دەوە بۆ سەر سیمورروم بووبێت، ئەوا دەشێت ئەوە بگەیێنێت کە خوری‌یەکان لەماوەی چەند ساڵێکی کەمی پێشتردا توانیویانە بێنە ناو خاکی سیمورروومەوەو بە شێوەیەکی وا خۆیان جێگیر بکەن کە تەنانەت دەسەڵاتیش بگرنە دەست و خوری‌یەک لەسەر تەختی وولاتەکە دابنێن. بەڵام هەتاوەکو بەڵگەی کرۆنۆلۆجی‌یانە لەسەر ئەم ڕووداوانە دەست نەکەون، ئەم ووتەیە هەر تیۆری‌یانە دەمێنێتەوە و ناتوانرێت بسەلمێندرێت.[٢٤]

نامەیەکی ئەکەدی لەگاسور (HSS X 5) دەوە ئاماژە بۆ هەندێک سیمورری دەکات کە پێدەچێت لە شارەکەدا ژیابن و بەهۆیەکەوە کە نایزانین، دانەوێڵەیان بۆ بڕاوەتەوە و پێیان دراوە:

> "*دادا* وا بە نینی دەڵێت، بڵێ: ئەو دانەوێڵەیەی بۆ بەشینەوەم جێ هێشتووە، با بەشینەوە و تۆوی لێ دابین بکات. بەڵام ئەگەر سیمورری‌یەکان دانەوێڵەی تەواویان وەرنەگرت، (ئەوا) با هەندێکی لێ بدات بەوان و من (خۆم) دەیخەمەوە جێگەی."[٢٥]

هەندێک دەقی تر لە شاری گیرسو (RTC 249) دەوە لە ناوچەی لەگەش لەگەڵ ناوی کەسانی خەڵکی خوخنوری و لوللوبوم دا کە بەشە دانەوێڵەیان بۆ بڕاەوتەوە، ناوی کەسانی خەڵکی سیمورروومیشیان تێدایە و یەکێک لەمانەش کانزاساز بووە.[٢٦]

---

[24] Walker, *Op. Cit.*, p. 222.

[25] 1-5) *en-ma Da-da, a-na Ni-ni, qí-bí-ma:* ŠE *šu a-na* ŠE. BA *a-si-tu* 6-10) *a-na* ŠE. NUMUN *li-sa-me-ed-ma li-dì-in ù śum-ma Śi-mu-ur$_4$-rí-ù* 11-15) *a-dì da-ni-iš* ŠE *la i-ma-ḫa-ru in qer-bí-su a-na* ŠE. BA *li-dì-in a-na-ku$_8$ a-kà-sa-ar*: Walker, p. 23.

[26] RTC 249, I, 8′: lú Si-mu-ru-um-me; I, 11′-12′: simug Si-mu-ru-um;
هەروەها تەماشای ئەمەش بکە:
RTC 253, 3. After Walker, *Op. Cit.*, p. 23 and note 20.

نووسینەکەی ئێرپڕیدو-پیزیر ی پادشای گوتیوم کە لەم ساڵانەی دوایی دا بلاوکرایەوە،[٢٧] هەندێک زانیاری لەبارەی سیمورروومی **سەردەمی گوتی** بەخشی. پادشایەکی سیموررووم کە ناوی 'کا-نیشبا *Ka-Nišba*' بووە، لە 'ئێنریدا-پیزیر' ی باوکی 'ئێرریدو-پیزیر' یاخی بووە و بۆی نەچووەتە سەر و لەشەڕدا شکاوە. گرنگ ئەوەیە، کا-نیشبا نەک هەر خەڵکی سیموررووم، بەڵکو هەروەکو نووسینەکە دەڵێت، خەڵکی لوللوبومیشی بۆ یاخیگەری هان داوە.[٢٨] ئەمە دەکرێت نیشانەی دەستەڵاتی سیموررووم، یان هیچ نەبێت کاریگەرییەکی گەورەی بووبێت لە وڵاتی لوللوبومی ئەوکاتدا.

لە **سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئور** دا ئاماژە بۆ سیموررووم زۆر زیاتر دەبن و لەڕووی کرۆنۆلۆجیشەوە هەندێک ووردتر دەبن. دیپاچە-مێژووەکان دەبنە سەرچاوەی سەرەکیی زانیاریمان و لەهەمان کاتیشدا بەڵگەی سەرەکیی دیاریکردنی مێژوو و ساڵی لەشکرکێشییەکانی سەر سیموورووم. هاللۆ خشتەیەکی بۆ ئەو دیپاچە-مێژووانە کردووە کە پەیوەندییان بە لەشکرکێشییەکانی سەر سیمورروومەوە هەیە، بۆ باسەکەمان بەسوودە لێرەدا وەکو خۆی دایبنێینەوە.

لە خشتەکەوە دەردەکەوێت کە جەنگی دژی خورییەکان لەناوەڕاستی سەردەمی فەرمانڕەوایی دوور و درێژی شولگی دا دەستی پێکردووە و دەکرێت دابەش بکرێتە سەر سێ قۆناغ. لەبەرئەوەش کە ئەم جەنگە بەزۆری ڕووی لە ناوچەکانی خوری نشینی باکور و باکوری ڕۆژهەڵات بوو، پێی دەووترێت جەنگی خوری.[٢٩]

---

[27] هیلپریێخت Hilprecht هەر لە ١٩١٠ دا هەواڵی دۆزینەوەی ئەم نووسینەی ڕاگەیاند، بەڵام ئیتر لەو کاتەوە وون بووبو، تاوەکو لە ١٩٨٩ دا کوتشەر دۆزییەوە و بلاوی کردەوە، بڕوانە:
Kutscher, *The Brockmon Tablets* …., pp. 49-70.

[28] Kutscher, iii BT 3 8′ff. p. 55ff.

[29] بڕوانە:

| | (ا) پەیوەندی دار بە بەرەی خوری‌یەوە | | (ب) هی تر |
|---|---|---|---|
| شولگی | ٢٤: کارخار ١<br>٢٥: سیموررروم ١<br>٢٦: سیموررروم ٢<br>٢٧: خارشی | "جەنگی خوری یەکەم" | |
| | | | ٢٨-٢٩: خاتوو ئاخوندی بالای ئەریدو<br>٣٠: کچی پادشا بە شو بۆ ئەنشان چوو |
| | ٣١: کارخار ٢<br>٣٢: سیموررروم ٣<br>٣٣: کارخار ٣ | "جەنگی خوری دووەم" | |
| | (٣٧-٣٨: شورای وولات بنیات نرا) | | ٣٤-٣٥: ئەنشان<br>٣٦: نانا ی کارزیدا بۆ پەرستگاکەی<br>٣٩-٤١: پوزریش-داگان "بنیات نرا" |
| | ٤٢: شاشروم ١<br>٤٤: سیموررروم (و لوللوبوم) «٩»<br>٤٥: ئوربیلوم ١ (لوللوبوم، سیموررروم و کارخار)<br>٤٦-٤٧: کیماش و خومورق<br>٤٨: خارشی (کیماش و خومورق) | "جەنگی خوری سێ یەم" | ٤٣: خاتوو ئاخوندی بالای نانا |
| ئەمار-سین | ٢: ئوربیلوم ٢<br>٦: شاشروم ٢ | | ١: ئەمار-سین بووە پادشا<br>٣-٥: چالاکی ئایینی‌یانەی جۆراوجۆر<br>٧: *bītum-rābium, labrum* و ...تاد.<br>٨-٩: چالاکی ئایینی‌یانەی جۆراوجۆر |

Hallo, *RHA*, p. 75-77;

لەم دوایی‌یانەش دا :

Frayne, *SCCNH* 10, p. 146.

| شو-سین | ٣: سیمانوم<br>(٤-٥: شورای ئاموری/مارتو بنیات نرا) | ١: شو-سین بووه پادشا<br>٢: کەشتیی ئێنکی<br>٦: میلی ئێنلیل و نینلیل<br>٧: زەبشالی<br>٨-٩: چالاکی ئایینیانەی جۆراوجۆر |
| --- | --- | --- |
| ئیبی-سین | سیموررروم | ١: ئیبی-سین بووه پادشا<br>٢: ئاخوندی بالای ئینانا له ئوروک |

دیپاچە-مێژووەکانی بنەماڵەی سێ یەمی ئور. لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراوە:
Hallo, “Simurrum and the Hurrian Frontier,” *RHA* 36 (1978), Appendix II, p. 82.

بەڵام ئاشکرایە کە ئەوەی لەم دیپاچە-مێژووانەدا هاتووە، تەواوی سەرهوردەکە نیە، چونکە لە دیپاچە-مێژووی شولگی ٤٤ (Š 44) دا هاتووە کە لوللوبوم و سیموررروم بۆنۆهەمین جار تارو مار کران، لەکاتێکدا تەنها سێ دیپاچەمان لەدەستدایە لەشکرکێشیی لەم جۆرەیان تۆمار کردبێت (بڕوانە خشتەکە). لەوانەیە ڕووداوی تر لەهەمان ساڵی ئەو لەشکرکێشییانەدا هەبووبن کە بەلای نووسەرەکانی دەوڵەتەوە لە هەواڵی لەشکرکێشییەک بۆسەر وولاتێکی بێگانەوە گرنگتر بووبێت بۆیە تۆمار نەکراون، یان تەنانەت نووسەرەکان نەیان ویستبێت دیپاچە-مێژووەکان هەموویان بەناوی هەمان ئەو "سیموررروم"ە پڕ بکەنەوە. ئەگەر دیپاچە-مێژووەکانی بەردەست بژمێرین، دەبینین لە کۆی ١٦-١٧ لەشکرکێشیی تۆمارکراو، شەشیان هەر بۆ سەر سیموررروم بووە، خۆ ئەگەر پێنج لەشکرکێشییە تۆمارنەکراوەکەشی بخەینە سەر، ئەوا دەبنە ١١ دانە.

وەک دەردەکەوێت، سێ یەم لەشکرکێشیی شولگی لە ٣٢هەمین ساڵی فەرمانڕەوایی دا (Š 32) کە دەکەوێتە جەنگی دووەمەوە، یەکلایی کەرەوە بووە. بۆیە لە هەموو سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئور و تەنانەت سەردەمانی زۆر دواتریش دا تیشکێکی

تایبەتی خراوەتە سەر. لەئەنجامی ئەم لەشکرکێشی‌یەدا *تەپیان-دەراخ* *Tappan-Daraḫ*[30]، کە پادشای سیمورروم بوو، خۆی و خێزانەکەی بەدیل گیران و بۆ وولاتی سومەر ڕاگواستران. هەندێک لە دەقە ئەرشیفی‌یەکانی درێهم (پوزریش-داگان ی دێرین) ناوی خۆی و هاوسەرەکەی و کوڕێک/کچێکی دەبەن (Š 33).[31] ئەمان لە ٣٢هەمین ساڵی فەرمانڕەوایی شولگی (Š 32) یەوە لە درێهم خۆراک و پۆشاکیان بۆ بڕابووەوە.[32] لە سەردەمێکی دواتردا لە نێو ناوەکانی دەقەکانی درێهم دا ناوی

---

[30] ئێتیمۆلۆجیی ئەم ناوە هێشتا بەتەواوەتی یەکلایی نەبووەتەوە؛ زادۆک Zadok باوەڕی وایە ناوەکە خوری نەبێت، بەشی یەکەمی بریتی لە ناوی ڕووباری طابـ(ـبـ)ـان Ṭab(b)an، بڕوانە:

Zadok, R., “Hurrians as well as Individuals Bearing Hurrian and Strange Names in Sumerian Sources,” *kinattūtu ša dārâti: Raphael Kutscher Memorial Volume,* Tel-Aviv, 1993, p. 224.

بەڵام ئەگەر تەماشای ئەو ناوە کەسی‌یانەی سەردەمی بابلیی کۆن بکەین کە ناوی ئەم ڕووبارە لە پێکهێنەرەکانیانە، دەبینین ناوی طابـ(ـبـ)ـان هەمیشە نیشانەی خواوەندێتیی لە پێشەوەیە، بۆ نموونە لەسەرئەم ناوانە، بڕوانە:

Nashef, Kh., “Der Ṭaban-Fluss,” *Baghdader Mitteilungen* 13 (1982), p. 121.

ئەستۆر Astour ئێتیمۆلۆجیایەکی سومەری-ئەکەدیی بۆ ناوەکە هەیە، بەڕای ئەو ناوەکە لە هەردوو ووشەی Tab-ba و $^{d}$Da-ra-aḫ پێک هاتووە، یەکەمیان لە *tappû* ی ئەکەدی‌یەوە هاتووە بە واتای "هاوەڵ" و "هاوڕێ" و دووەمیشیان ناوی خواوەندە. پێکەوە واتای "هاوەڵی خواوەند دەراخ" دەبەخشێت. بڕوانە:

Astour, *SCCNH* 2, p. 41.

دەبێت تێبینی ئەوەش بکەین کە ناوی ئەم خواوەندەش –ئەگەر ناوی خواوەند بێت، نەک شتێکی پیرۆز و خواوێندراو– لە شوێنی تردا نەهاتووەو نەبینراوە.

[31] بەلای فرەین و ۆوکەر و بیگزەوە کوڕی تەپیان-دەراخ بووە، بڕوانە:

Frayne, “On the Location …,” p. 250; Walker, p. 105; Biggs, R., “Šulgi in Simurrum,” *Crossing Boundaries and Linking Horizons,* p. 171;

بەڵام بەلای هالۆ و ۆوکەر دوە –لە شوێنێکی تردا–، کچی تەپیان-دەراخ بووە، بڕوانە:

Hallo, *RHA,* p. 75; Walker, p. 115.

بەداخەوە خۆم خودی دەقەکەم دەست نەکەوت تاوەکو بتوانم لێی بکۆڵمەوە.

[32] بۆ ئەم دەقە ئەرشیفی‌یانەی باسی تەپیان-دەراخ و خێزانەکەی دەکەن، بڕوانە:

پادشایەک/فەرمانڕەوایەکی تری سیمورروم دەبینیــن بە ناوی *کیریب-ئولــمێ* *Kirib-ulme*' وە کە وادیارە لەپاش بەدیل گرتنی تەپیان-دەراخ لەسەر تەختی سیمورروم خۆی گرتووەتەوە.[33] وادیارە ئەمیش هێندە بەختەوەر نەبووە و هەمان چارەنووسی تەپیان-دەراخ ی هاتووەتە پێش و بەدیل گیراوە. گرتنی سیمورروم بەدەستی شولگی و بەدیل گرتنی تەپیان-دەراخ لەکاتی خۆی دا دەنگێکی وای داوەتەوە کە لە سەردەمانی دواتریشدا بووەتە هەوێنی زۆر نووسینی تر. بۆ نمونە هەندێک دەقی فاڵی سەردەمی بابلیی کۆن و تەنانەت هەندێک دەقی ئەدەبیش. دەقەکانی فاڵ گرەوەیی گرتنی هەرچوار پارچەی جیهان[34] و یەخسیر کردنی تەپیان-دەراخ دەدەنە پاڵ شولگی.[35] دەقێکی تری فاڵ گرەوەیی سەردەمی ئاشوریی ناوەڕاست (سەردەمی فەرمانڕەوایی تیگلات-پیلێسەر ی یەکەم ١١١٥-١٠٧٧ پ.ز.)، هەرچەندە لە بارێکی خراپدایە و شکاوی زۆرە، بەڵام ئەوەندەی لێ تێدەگەین کە پادشایانی:

---

Hallo, *RHA*, p. 74-5; Walker, pp. 110; 115-116; Frayne, "On the Location…," p. 250.

تێبینی ئەوەش بکە فرەین لای وایە ئەم تەپیان-دەراخ ە کەسێکی تر بووە بە هەمان ناوەوە و جیابووە لە پادشای سیمورروم، بڕوانە:

Frayne, "On the Location…," p. 251.

ۆوکەریش لای وایە تەپیان-دەراخ ی پادشای سیمورروم پاش شەڕەکە هەر بەناو کراوەتەوە بە فەرمانڕەوای سیمورروم و لەپاڵیشیدا فەرمانڕەوایەک لەلایەن ئورەوە بۆ وولاتەکە دانراوە، بڕوانە:

Walker, p. 116.

هۆی ئەم پێشنیازەی فرەین ئەوەیە کە پادشا لەم دەقە سومەرییانەدا لە جیاتی "پادشا/فەرمانڕەوای سیمورروم" تەنها بە "کابرای سیمورروم" ناو براوە و ئاماژەی بۆ کراوە. بەڵام ئەمە بەلای ئێمەوە بەس نیە بۆ پێشنیازێکی لەو جۆرە، سومەرییەکان هەمووکات دیلەکانی خۆیان بە ناوونیشانی تەواویانەوە ناونەبردووە، سەرباری ئەمەش دواتر لە سەردەمی بابلیی کۆن دا چەندین نمونەمان هەیە لەسەر ناوبردنی فەرمانڕەوا و میرانی ناوچە و وولاتە بێگانەکان تەنها بە "کابرای....(ناوی وولات)."

[33] Biggs, "Šulgi in Simurrum," p. 173.

[34] Goetze, A., "Historical Allusions in Old Babylonian Omen Texts," *JCS* 1(1947), p. 259, no. 24.

[35] *Op. Cit.*, p. 259-60, nos. 25; 26 and 27.

"[.....تابـ]-با-گار[...Tab]-ba-gar وڕەبسیسی Rabsisi،
پادشایانی ...[....]، ئەو [....] و برا برای کوشت."[٣٦]

دەقی پێشبینییەکەی شولگیش، هەرچەندە بە ناو ناوی تەپیان-دەراخ نابات، بەڵام کە دەڵێت "شولگی، کە بووە سەرداری هەرچوار پارچەی جیهان، لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوا" دەقە فالگرەوەیی‌یەکانی سەردەمی بابلیی کۆن یاد دەهێننەوە و، هەندێک بە سەرهوردی شکانی پادشاکەی سیمورروومەوەی دەبەستنەوە.[٣٧] لەمەش زیاتر، هەواڵنامەیەک (= Chronicle)ی سەردەمی سلوکی (٣٣١- دەورووبەری١٤٠پ.ز.) یادەوەری ئەم شەڕەی پاراستووە:

"شولگی، پادشای ئور، کوڕی ئور-نەممو، [پا]دشایەتی هەموو وولاتانی کرد، [تابـ]ـبانگار و ڕەبسیسیی پادشایانی وولاتی سوبارتوی بەزاند."[٣٨]

---

[36] [...*tab*]-*ba-gar ù(!) rab-si-si* MAN. MEŠ *šá x* [...]/ [...] x *su-nu-ti-ma* ŠEŠ. ŠEŠ-*šú* GAZ:

بۆ ئەم دەقە، بڕوانە:

Frayne, *Op. Cit.*, p. 250.

[37] دەقی پێشبینییەکەی شولگی لەلایەن بۆرخەرBorger ەوە بە پێکەوەنانەوەی حەوت پارچە لەوحی قوڕی سەردەمی ئاشوری نوێ دروست کرایەوە، بڕوانە:

Borger, R. "Gott Marduk und Gott-König Šulgi als Propheten, Zwei prophetische Texte," *Bibliotheca Orientalis (BiOr)*, Jaargang XXVIII, No. 1 en 2, Januari-Maart (1971), pp. 3-24;

هەروەها بڕوانە:

Biggs, *Op. Cit.*, p. 170; 174.

[38][x $^{d}$*Š*]*ul-gi* LUGAL ŠEŠ. UNU$^{ki}$-A $^{m}$*Ur-*$^{d}$*Nammu* [*šar*]-*ru-tu* KUR. KUR *ka-la-ši-na i-pu-uš* [*Tab*]-*ban-ga-ár* (or: ...*b*]*an-garaš* according to Hallo, *RHA*, p. 76, note 52) *u* $^{m}$*Rab-si-si* LUGAL. MEŠ *šá* KUR. SU. BIR$_{4}^{ki}$ *i-be-el* : Hunger, H., *spätbabylonische Texte aus Uruk*, Teil 1, Ausgrabungen der Deutschen Forschungsgemeinschaft in Uruk-Warka 9, Berlin, 1976, p. 19-20.

هەردوو ناوی [Tab-b]a-gar یان [Tab-b]an-garaš و Rabsisi بە پێی پڕکردنەوەکەی هاللۆ بۆ شکاوی‌یەکانی ناوەکان، لە هەردوو ناوی کۆنی -Tappan Daraḫ ی سیموررروم و Rašiši دەچن. ڕاشیشی بەپێی دەقێکی شوێنەواری درێهم (TCS 140:5) فەرمانڕەوای کیماش Kimaš بووە، بەڵام لە هەواڵنامەکەدا بە فەرمانڕەوایانی وولاتی سوبیر KUR. SU. BIR$_4^{ki}$ ئاماژەیان بۆ کراوە.[٣٩] ئەم ووتەیە ئاماژەیەکی نکوڵی لێ نەکراوە بۆ ئەوەی کە سیموررروم بەشێکی پچووک و پێکهێنەری سوبارتوی مەزن و بەرفراوان بووە.

شولگی لەپاش جەنگی خوریی دووەم دەستی کرد بە بنیات نانی 'شورای سەرزەمینەکانی دەرەوەی قەڵەمڕەو' لە نێوان دیجلە و زنجیرە چیای حەمرین دا؛ واتە لـــە Š 37-38 دا. هۆی بنیات نانی ئەم شورایە بە ڕای هاللۆ لەوانەیە بۆ بەستنی ئەو ڕێگایانە بوو بێت کە بۆ سیموررروم دەچوون،[٤٠] ئەویش ئەگەر سیموررروم لەم سەمتەوە بووبێت. بەڵام بەڕای ئێمە پێ ناچێت ئەمە هۆی بنیات نانی ئەو شورایە بووبێت، بەتایبەتی کە زۆر بەسەر لەشکرکێشی سێ یەم دا تێ نەپەڕی بوو کەلەئەنجامیدا سیموررروم داگیرکرا و خاکەکەی خرایە سەر ئیمپراتۆری ئور. لەم بارەشدا مەترسی‌یەکی بۆ ئور نەبوو و پێویست نەبوو ڕێگاکانی ببەسترێن. شوراکە دەبێت ئەرکێکی تری هەبووبێت؛ بۆ بەرگرتن بە دوژمنێکی تر.

لە جەنگی خوری سێ یەم دا، لەماوەی دوایین حەوت ساڵی فەرمانڕەوایی شولگی دا، سوپاکانی ئور توانیان بگەنە سەرزەمینی نوێ لە قووڵایی نیشتیمانی خوری‌یەکاندا، کە پێشتر نەیانگەیشتبوونێ، بە تایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە. ئەمەش بەبێ ڕاماڵینی سەنگەرو مەتەرێزەکانی سەر ڕێگای سیموررروم بەدی نەدەهات. سوپای ئور ئەمجارە گەیشتە

---

[39] Hallo, *Op. Cit.*, p. 76 and note 61.
[40] *Op. Cit.*, p. 77.

لوللوبوم و *شاشروم* *Šašrum* – کە زۆر دەشێت هەمان *'شوشەڕڕا* *Šušarrā*' ی پاشتر بووبێت– و *ئوربیلوم* *Urbilum* لە باکورەوە و لەپاش ئەمانیش کیماش و خومورتی. هەواڵی پەلاماردانی ئەم دووانەی دوایی‌یان بابەتی نووسینێکی شاهانەی شولگیشن کە لە سوسە دۆزراوەتەوە.[٤١]

ڕاستیی داگیرکردنی سیمورروم و لکاندنی خاکەکەی بە ئیمپراتۆری ئورەوە بە دامەزراندنی فەرمانڕەوای مێسۆپۆتامیایی لەلایەن ئورەوە بۆ وولاتی سیمورروم دا دەردەکەوێت. ناسراوترینیان *'صیللوش–داگان* *Ṣilluš-Dagān*'ە کە لە دەقی نەخشی مۆرێکی لولەکیی سەر کیفی لەوحێکی ساڵی شەشەمی سەردەمی 'ئەمار–سین' دا ناوی و ناونیشانی بە: "فەرمانڕەوا (*ensí*) ی سیمورروم" هاتووە (بڕوانە شێوەی ژ. ٨).[٤٢] جێ مۆرێکی تری مێژوو نەزانراوی 'درێهم' یش هەر بە *ئێنسی* ی سیمورروم ناوی دەبات.[٤٣] واپێدەچێت لەدەوروبەری Š 42 دا لەم پۆستەدا دامەزرابێت،[٤٤] هەرچەندە ئیتر لەپاش Š 43 وە ناوی نایەت، لەوانەیە هەڵگیرسانی ڕاپەڕینێک لە سیمورروم لەدژی ئور بووبێتە هۆی لابردنی لە پۆستەکەی.[٤٥]

لە دەوروبەری ئەم سەردەمەدا بوو (Š 40) کە باجی maš-da-ri-a لە سیمورروم‌ەوە

---

[41] Sollberger and Kupper, *IRSA*, IIIA2p.
[42] Keiser, C. E., Neo-Sumerian Account Texts from Drehem, *Babylonian Inscriptions in the Collection of James B. Nies* 3, New Haven, 1971, Pl. LXXIX, no. 627.
مەبەست لە کیفی لەوحی قوڕ، توێ یەکی تەنکی قوڕە کەپاش نووسینی قەواڵە و بەڵگەنامەی گرنگ دەگیرایە لەوحەکەی و هەمان ناواخنی قەواڵەکە یان بەڵگەنامەکەی لەسەر دەنووسرایەوە و مۆر دەکرا. ئەم بەرگە یان کیفە تەنها لەکاتی کێشە و ناکۆکیی نێوان لایەنەکانی مۆرکەرانی قەواڵەکە لەبەردەم دادوەر و بەئامادەبوونی گەواهان دەشکێنرا و تەماشای نووسینی ناوەوەی سەر لەوحەکە دەکرا.
[43] Frayne, *Op. Cit.*, p. 251.
[44] Walker, p. 223.
[45] *Ibid.*

بۆ سومەر دەهات.[46] نامە شاهانەکانی کە میشالۆڤسکی بڵاوی کردوونەتەوە و تیایانـــدا *ئەرەد-مو* *Arad-mu*‛ ی کۆمیسەری باڵا دەڵێت پادشای ئور ناردمی بۆ وولاتی سوبـــیر "بۆ ئەوەی باجی سەرزەمینەکانی دەرەوەی قەڵەمڕەو ڕێک بخەم و باس و خواس لە باری هەرێمەکان بکەم" بە ڕوونی ئاماژە بـــۆ سیموررروم وەک یەکێـــک لە هەرێمـــەکانـــی قەڵەمڕەوی ئور لەم سەردەمەدا دەکات. هەندێک لەمەش زیاتـــر دەڕۆن و پێشنیـــاز دەکـــەن کە مەبەست لە وولاتی سوبیر لێرەدا سیموررروم خۆی بووە.[47]

شێوەی ژمارە ٨: جێ مۆری صیللوش-داگان

لەسەردەمی حوکمڕانیی ئەمار-سین دا سیموررروم سەرئێشەی بۆ ئور نەبوو، بۆیە لە کاتی ئەمدا هیچ لەشکرکێشییەکی نەکراوەتە سەر. لەجیاتی ئەمە، ئەمار-سین پەرژایە سەر کۆکردنەوەی هێزو توانای بۆ پەلاماردانی سەرزەمینەکانی کەوتبوونە باکوور ترەوە، وەک ئوربیلوم و شاشروم (بڕوانە خشتەکە). بە پشت بەستن بە زانیاریی هەندێک لە دەقە ئەرشیفییەکان، تێدەگەین کە ئەمار-سین بە درێژایی دامێنەکانی زاگرۆس، وەک لە *ئەرراپخوم* *Arrapḫum*‛ و ‚*دور-ماش* *Dūr-maš*‛ و *ئەگاز* *Agaz*‛ و *لوللوبوم* و خەمازی و ‚*شوریخوم* *Šuriḫum*‛ و ‚*شواخ* *Šuaḫ*‛ و *گابلاش* *Gablaš*‛ ‚*زەقتوم* *Zaqtum*‛ و ‚*دور-ئێبلا* *Dūr-Ebla*‛ دا بنکەی سەربازیی هەبووە.[48] ئەمە نیشانەیە

---

[46] Hallo, *Op. Cit.*, p. 77.

باجی maš-da-ri-a واتای ئەو قوربانی و دیارییانە بوو کە دەوڵەت لە هەندێک بۆنەدا وەک باج لە گەورە کاربەدەستانی دەوڵەتی وەردەگرت.

[47] *Op. Cit.*, p. 78.

بۆ نامەکەش، بڕوانە:

Michalowski, *The Royal Correspondence of Ur*, p. 142.

[48] Walker, 107.

بۆ ئەوەی کە ئیمپراتۆریی ئور ، هیچ نەبێت لەم دەمەدا، نەک تەنها توانیویەتی لەشکر بکاتە سەر ئەم سەرزەمینانە، بەڵکو دەستەڵاتێکی جێگیر و توندو تۆڵیشی بەسەریاندا شکاوە. هەر لەسەردەمی ئەمار-سین دا بەشە خۆراک و ئاژەڵ بۆ کەسانی بە بنەچە خەڵکی کوردستانی کۆن و لەوانەش سیموررری، براوەتەوە و پێیان دراوە.[49] لەسەردەمی فەرمانڕەوایی شو-سین *Šu-Sîn* دا، کە لەپاش ئەمار-سین هاتووەتە سەر تەختی پادشایەتی ئور، ئارامی و جێگریی دەستەڵات بۆ چەند ساڵێکی تریش درێژەی کێشا. بەڵام لەمە بەدواوە ئیتر سەنگی هێز و دەست ڕۆیشتوویی بەلای خوریەکاندا چوو، ئەمجارەیان بە هاوکاری لەگەڵ ئاموریەکاندا، کە سەرچاوە سومەریەکان 'مارتو *Martu*' یان پێ دەووتن. لەوانەیە باشترین بەڵگە لەسەر ئەم گۆڕانانە نامەکەی '*شەڕروم-بانی* *Šarrum-bāni*' ی کۆمیسەری باڵا بێت، کە بۆ شو-سین ی پادشایی نادووە. شەڕروم-بانی لەم نامەیەدا پادشای لەدوا هەواڵی کارو باری بنیات نانی "شورای ئاموریەکان بۆ بەرگرتن بە *تیدانوم*"[50] ئاگادار کردووەتەوە. تیایدا بۆ پادشای نووسیوە کە مارتو (=ئاموریەکان) لە ناوچەی نێوان هەردوو چیادا (=ئێبیخ *Ebiḫ*، واتە حەمرین) خێوەتیان هەڵداوە و سیموررریەکانیش هاتوون بۆ کۆمەکیان.[51] وا پێدەچێت سیموررروم لەم کاتەدا، ئەگەر هەمووش نەبێت، ئەوا هەندێک لە هێزو و لە سەربەستیی خۆی بەدەست هێنابێتەوە، بەڕادەیەکی وا کە توانیویەتی بڕیاری سەربەستی خۆی بدات و بەجێشی بگەیێنێت، بەڵگەش بۆ ئەمە کۆمەک کردنی مارتوە لە دژی دوژمنی هاوبەشی هەردووکیان: ئور. ۆوکەر، بە پشت بەستن بە زانیاریەکانی دەقە ئەرشیفیەکان، پێشنیاز دەکات کە مێژووی دەستپێکردنی ئەم جموجۆڵەی سیموررروم لە دژی ئور لە

---

[49] ئەم ڕاستیە بە پێی ناوەڕۆکی دەقە ئەرشیفیەکانی سەردەمی ئەم پادشایە هەڵهێنجراوە. بۆ نمونەش بڕوانە:

Walker, p.107.

[50] Michalowski, *Op. Cit.* p. 225-231.

[51] *Ibid.*

سالانی نێوان ٢-٩هەمین سالی فەرمانڕەوایی شو-سین دا بووبێت.[٥٢] کەواتە لەشکرکێشییەکی نوێی سومەری لەدژی سیموررروم هیچ قسەی لەسەر نەبوو، ئەوەبوو ئیبـــبی-سین *Ibbi-Sîn* بۆ دوایین جار سوپای نارده سەر سیموررروم و ناوچەکانی تری ڕۆژهەلاتی دیجلە، بە نیازی ئارام کردنەوەی وولاتەکەو سەرکوت کردنی پادشا تازە هەلکەوتووەکەی کە لەوانەیە ئیددیـــ(ـــن)-سین بووبێت.[٥٣]

بە پێی بەلگەنامە سومەرییەکان، یەکێک لە لایەنە سەرەکییەکانی کە پێکەوە لەگەل عیلامییەکاندا دوا شالاویان بردە سەر شاری ئور و بەوە کۆتاییان بە ئیمپراتۆری بنەمالەی سێ یەمی ئور هێنا، گەلی 'سو SU' بوو. هاللۆ ڕای وایە کە مەبەست لە گەلی سو بە پلەی یەکەم خورییەکانە.[٥٤] ئەگەر وابێت، ئەوا ئاساییە بلێین سیموررریەکان، کە لەم سەردەمەدا بە شێوەیەکی سەرەکی خوری بوون، کرۆکی ئەو هێزە سەربازییەیان پێک هێناوە کە ئەم شەڕەی بردووەتەوە، چونکە دیارە بەهۆی شوێنیان و پێشینەی مێژووییانەوە لە تیرە خورییەکانی تری ئەم سەردەمە ڕێکخراو تر و تەیار تر بوون بۆ شەڕی دژی ئور. وەک دەردەکەوێت، 'سو' بە پلەی یەکەم زاراوەیەک یان ناوێکی ئەدەبییانە بووبێت وەک لەوەی ناوێکی نەژادی بووبێت بۆ ئاماژە بۆ گەل و نەتەوە چیاییەکانی باکور و باکوری ڕۆژهەلات، کە خورییەکان لەم قۆناغەی مێژوودا لە هەموویان چالاک تر و دەست ڕۆیشتووتر بوون.

**سەردەمی ئیسن-لارسا** کە لە پاش ڕمانی بنەمالەی سێ یەمی ئورەوە دەست پێ دەکات، بەدەست هێنانەوەی سەربەخۆیی زۆر لە وولات و سەرزەمینە ژێردەستەکان و

---

[52] Walker, p. 110.

[53] ۆوکەر لەو بڕوایەدایە کە لەوانەیە ئیددیـــ(ـــن)-سین هەر لە سەردەمی ئیبـــبی-سین دا بانگی سەربەخۆیی هەلدابێت. بڕوانە:

Walker, p. 225.

[54] Hallo, *RHA*, p. 79-80.

پاشانیش پێکهێنانی چەندین دەوڵەتی پچووکی بە خۆیەوە دی. لەنێو ئەمانەش دا سیموررروم بوو بەسەرکردایەتیی ئیددیـ(ـــن)-سینی پادشای چوست و بەکاری. ئەم پادشایە چەند نووسینێکی شاهانەی جێ هێشتووە تیایاندا شتێکمان لەبارەی قەڵەمڕەوی شانشینەکەیەوە پێ دەڵێت کە لە سەرزەمینەکانی ڕۆژهەڵاتی دیجلەدا پێکەوەی نا. لەوپەڕی باکوورەوە، لەو ناوچەیەدا کە ئێستا ناوچەی بێتواتەی پێ دەووترێت و لە سەرووی دەشتی ڕانیەوەیە، چەند نووسینێکی گرنگ بە نەخشەوە دۆزراونەتەوە کە یادەوەری سەرکەوتنەکەی بەسەر شاری 'کولونوم *Kulunnum*' ی یاخی دا پاراستووە. نووسینێکی تری لە دامێنی چیای پیرە مەگروون دا، کەمێک لە باکوری ڕۆژئاوای شاری سلێمانی دا، دۆزراوەتەوە. ئەمەیان یادەوەریی چەندین سەرکەوتنی پاراستووە کە لە چەندەها بەرەی شەڕ و سەرزەمینی جۆراوجۆردا بەدەستی هێناون، لەوانەش 'خەڵان *Ḫalman*' لە باشورەوە و 'سیماشکی *Simaški*' لە ڕۆژهەڵاتەوە. ئەمانەش دەیسەلمێنن کە شانشینەکەی ئیددیـ(ـــن)-سین بەلایەنی کەمەوە ٢٤٠ کیلۆمەتریکی هەوایی مەودای قەڵەمڕەوی بووە. لە نووسینەکانی بێتواتەوە دەردەکەوێت کە کوڕێکی بە ناوی 'زابازونا *Zabazuna*' وە هەبووە،[٥٥] کە هەندێک بەڵگەی نووسراوی دۆزراونەتەوە و

---

[55] ۆوکەر (لەهەموو شوێنێکی نامەکەیدا) ئەم ناوە بە 'ئەنزابازونا *Anzabazuna*' دەخوێنێتەوە، لەبەر ئەوەی لە نووسینە مێخی‌یەکاندا نیشانەی خواوەندێتی لە پێش ناوەکەیەوە دێت، کە دەکرێت بە "ئەنـــ *An*-" یش بخوێندرێتەوە. شافەر و ڤاسەرمان لە لێکۆڵینەوەکەی نووسینەکەی ئورشەلیمیاندا بەبێ یەکلایی کردنەوە بە شێوەی AN-*zabazuna* جێ یان هێشتووە، کە دەکرێت بە هەردوو شێوەکە بخوێندرێتەوە. بەڵام بەڕای ئێمە، ئەگەر هەموو هاوچەرخەکانی ئیددیـ(ـــن)-سین و کوڕەکەی، وەک ئیدیـ(ـــن)-سین خۆی و پادشایانی ئیسن و لارسا، 'دیس-ئەتال *Dis-atal*' و 'زەردەمو *Zardamu*' ی فەرمانڕەوای کارخار (بڕوانە: Walker, p. 159؛ بڕوانە:
Collon, D., *Catalogue of the Western Asiatic Seals in the British Museum,* Cylinder Seals II: Akkadian- Post Akkadian, Ur III Periods, London, 1982, p. 164, no. 451)
و پێش ئەمانیش پادشایانی بنەماڵەی سێ یەمی ئور و پادشایانی ئەکەد، هەموو خواوێندرابوون، زۆر ئاسایی و ئەقڵ گرە کە زابازوناش خواوێندرا بێت و ئەو نیشانەیەی پێش ناوەکەی نیشانەی خواوەندێتی

ئەمیش وەک باوکی لە ڕووی سیاسی و سەربازی‌یەوە چالاک بووە. وا دیارە زابازونا بەناوی باوکی‌یەوە فەرمانڕەوایی کولونوم ی کردووە، چونکە ئەوکاتەی نووسینەکانی بێتواتە نووسراون، باوکی هێشتا لە ژیان دا بووە.

هەندێک بەڵگەی نووسراو پیشانی دەدەن کە ئیددیــ(ــن)-سین و تەنانەت کوڕەکەشی هاوچەرخی ئیشبی-ئێرڕا *Išbi-Erra*' (۲۰۱۷-۱۹۸۵پ.ز.) ی پادشای ئیسن بوون. هەندێک لەو بڕوایەدان ئیبــی-سین ی پادشای ئور هێشتا لە دەستەڵات دا بووە و ئیشبی-ئێرڕا ش لەسەر تەختی ئیسن نەبووە کە ئیددیــ(ــن)-سین بووەتە پادشای سیموررروم.[٥٦] هەرچەندە ناتوانرێت مێژوویووردی سەردەمی فەرمانڕەوایی زابازونا و باوکی دیاری بکەین، بەڵام دەتوانین ئەوەندە هەڵبهێنجینین کە کاتێک زابازونا لەسەر تەختی پادشایەتی دانیشتووە، ئیشبی-ئێرڕاش هێشتا هەر پادشای ئیسن بووە و هێشتا 'بیلالاما *Bilalama*' نەبووبووە پادشای شانشینی ئێشنوننا *Ešnunna*.' هۆی ئەم باوەڕە دەقێکی ناوەڕۆک ئابووری‌یانەیە کە لە ئیسن دۆزراوەتەوە (BIN IX 42: 9-10) و مێژووی x+19 (=واتە شتێک و نۆزدەساڵ، چونکە ژمارەکەی پێشی شکاوە) هەمین ساڵی فەرمانڕەوایی ئیشبی-ئێرڕا ی لەسەرە و لیستی کۆمەڵێک شتی لەسەر تۆمار کراوە کە بۆ پادشایەکی سیموررروم دەچن: "...کەل و پەلی داگیراو (=واتە بەستراو) (کە) بۆ پادشای سیموررروم (دەچن)."[٥٧] زۆر دەشێت ئەم پادشایەی سیموررروم کە لێرەدا باس

---

بێت نەک بڕگەی -*An*. لەمەش زیاتر، ئەگەر باوکی پادشایەکی خواویندراو بوو بێت، ئەوە ناگەیێنێت کە ئیتر کوڕەکەی نابێت خواوێندراو بووبێت، بەتایبەتی کە کوڕەکەی لەم کاتەدا هەمان دەستەڵات و پلە و پایەی پادشایەکی هەبووە کە نوێنەری باوکی بووە لە کولونوم و بەناوی ئەوەوە فەرمانڕەوایی کردووە. تەنانەت لە ناو پانتیۆنی خواوەندانیشدا باوک و کوڕی هەبووە، کەواتە بۆچی لەناو خێزانێکی شاهانەدا نەبووبێت و بۆچی زابازونا خواوێندراو نەبووبێت؟

[56]سەبارەت بەم ڕایە و پوختەی بەڵگە نووسراوەکان، بڕوانە:

Walker, p. 177; 224.

[57] "….nì-šu kad$_5$-a lugal Si-mu-ur-ru-um-šè." Cf.: Walker, *Op. Cit.*, p. 176.

کراوە ئیددیـــ(ـــن)-سین بووبێت، ئەم دیاری کردنەش بە یارمەتی نامەیەکی سەردەمی بابلیی کۆن کراوە کە لە ئێشنوننا دۆزراوەتەوە و بەڕای لێکۆڵەرەکەی بەتەواوی هاوچەرخی ئەم باس و خواسەیە.[٥٨] نامەکە سەرکەوتنی لەشکری *DUMU-ḫu-dam*ێک بەسەر ئیددیـــ(ـــن)-سین ناوێکدا لە چیاکانی ڕۆژهەلات باس دەکات کە هیچ ناوو نیشانێکی لەگەڵدا نەنووسیوە، بەلام زۆر لەوە دەچێت هەر هەمان ئیددیـــ(ـــن)-سین ی پادشا بووبێت. لە لایەکی تریشەوە، جێگە مۆرێک (As. T 223) کە ناوی زابازونای لەسەرە و لە چینێکی ژێر ئەو چینەدا دۆزراوەتەوە کە هی سەردەمی بیلالامای پادشای ئێشنوننایە، لە پەرستگای 'ئیتوریا *Ituria*' دا لە 'تەل ئەسمەر' دۆزراوەتەوە،[٥٩] بەڵگەی ئەوەیە کە زابازونا پێش بیلالاما بووە. بەم جۆرە، هەردوو پادشای سیموررووم لە بەشێکی سەردەمی فەرمانڕەوایی‌یاندا هاوچەرخی ئیشبی-ئێرڕا بوون، هیچ نەبێت لە دوایین دەساڵی دا.

## نووسینەکانی ئیددیـــ(ـــن)-سین:

نووسینەکانی ئیددیـــ(ـــن)-سین گرنگی‌یەکی ئێگجار زۆریان بۆ مێژووی کوردستانی کۆن هەیە، بەتایبەتی سەرزەمینەکانی ڕۆژهەلاتی دیجلە، هۆی هەرە لەپێشی ئەم گرنگی‌یەش لەوەوەیە کە یەکێک لە نووسینە زۆر کەمەکانن کە لە خودی کوردستانەوە هاتوون و لە خاکەکەی خۆیدا نووسراون. **نووسینەکانی بێتواتە (ID 1, 2, 3)** (وێنەی ژ. ١٣)،[٦٠] سێ ڕونووسی یەک دەق پێک دەهێنن کە بەشی هەرە زۆریان لە ناوەڕۆک

---

[58] Whiting, R. M., *Old Babylonian Letters from Tell Asmar,* Chicago, 1987, no. 2, p. 37-38.

[59] Sollberger, E., "Two New Seal-Impressions," *Anatolian Studies* 30 (1980), 63-64; Frankfort, H., S. Lloyd and Th. Jacobsen, *The Gimilsin Temple and the Palace of the Rulers at Tell Asmar,* Chicago, 1940, p. 146, no. 13.

[60] بۆ یەکەم جار لەلایەن عبد الهادی الفؤادي یەوە بلاوکرانەوە لە:

دا وەک یەکن بەڵام هەر یەکەیان پێشکەش بە خواوەندێکی جیاواز کراوە. بابەتی نووسینەکان، وەک پێشتریش ئاماژەی بۆ کرا، بۆ پاراستنی یادی سەرکەوتنی سیمورروومە بەسەر شاری کولوننوم ی یاخی دا. هەر یەک لە ڕونووسەکان بە ناوی ئیدیـ(ـــن)-سین دەست پێ دەکات، پاشان ناونیشانەکەی کە پادشای سیمورروومە و ئەمجا ناوی زابازونای کوڕی کە کردەوە سەربازییەکەی لە دژی شارەکە ئەنجام داوە.[٦١] نووسینەکە بە ڕاشکاوی دەڵێت کە گوایە کولوننوم دەست پێشکەر بووە لە دوژمنایەتی کردنی سیمورروم دا و شەڕی هەڵگیرساندووە.[٦٢] سەیر ئەوەیە کە قسە گێڕەوەی نووسینەکە لە دێڕی ٢٦ ی ستوونی یەک دا I, 26 لە ڕاناوی کەسی سێ یەمەوە بۆ کەسی یەکەم دەگۆڕێت، ڕێک وەک لە نووسینەکەی ئانوبانینی ٢ Annubanini II شدا هاتووە کە لە سەرپولی زەهاوە و بەهی ئیدیـ(ـــن)-سین یان زابازونای کوڕی دەزانرێت، نەک ئانوبانینی،[٦٣] هەروەها لە نووسینـــەکەی ئورشەلیـــم[٦٤] وتەنانـــەت لە

---

Al-Fouadi, A. H., "Inscriptions and Reliefs from Bitwāta," *Sumer* 34 (1978), pp. 122-9.

و لە پاشتردا لە لایەن فرەینەوە:

Frayne, *RIME* Vol. 4, E4.19, 1, 1; 2; 3; 4; 1001, pp. 707-714.

[61]ناوی شاری کولوننوم Kulunnum بە پێی زانیارییەکانی بەردەست، جارێکی تریش ناوی لە دەقێکی سەردەمی ئاشوری درەنگە وەخت (دوادواییەکانی ئاشوری نوێ) دا هاتووە کە لە 'تەل بیللا Tell Billa' دا دۆزراوەتەوە، بڕوانە:

Walker, p. 225.

[62]فاربەر Farber خوێندنەوەیەکی تری بۆ ئەم ڕستەیە پێشنیاز کردووە، بە ڕای ئەو دەشێت لە جیاتی *gi-ra-am i-ta-ba-al* بە واتای "شەڕی بەرپا کرد" ، ڕستەکە *zi-ra-am/tim i-ta-pá-al* بێت، بە واتای "ڕقی هەڵگرت لە بەرامبەر...،" بڕوانە:

Farber, W., "Did Kulunnum «Carry a Campaign» Against Anzabazuna of Simurrum?," *N.A.B.U.* (1998) 4 (décembre), no. 129 on page 121.

بەڵام ئەمە هەرچۆنێک بێت، شتێکی ئەوتۆ لە واتا گشتییەکە ناگۆڕێت.

[63] Edzard, "Zwei inschriften …," *AfO* 24 (1973), pp. 75-6. Col. II 43.

سەبارەت بەوە ی ئەم نووسینە هی یەکێک لە پادشایانی سیمورروومە و ڕاو بۆچوونەکانی تری دەربارەی ئەم بابەتە، بڕوانە:

وێنەی ژمارە ١٣: نووسینەکانی بێتوانە، A و B و C لەگەڵ دوو پارچەی C.

سەرچاوە: الفؤادي، سومر ٣٤ (١٩٧٨).

Shaffer and Wasserman, p. 1, note 2.
[64] Shaffer and Wasserman, p. 18. Col. v 4"-6".•

نووسینەکەی ئێرپریدو-پیزیر یشدا شافەر و ڤاسەرمان شتێکی وایان تێبینی کردووە.[٦٥]
ڤۆکەر نووسینەکەی بێتواتە بە یەکەمین نووسینێکی تا ئێستا زانراو لەقەڵەم دەدات کە باوکێک بۆ یادەوەری دەستکەوتەکانی کوڕەکەیی تەرخان کردبێت، ئەویش ئەگەر ئەو وەرگێڕانەی کە دراوە ئەو واتایە بێت کە نووسەرەکەی ویستوویەتی بیدات.[٦٦] بەڵام بەڕای ئێمە دەشێت سادەتر وەری بگرین، واتە ئیددیــ(ـــن)-سین خۆی هێشتا پادشا بووە و نوێنەرەکەی، کە کوڕەکەیەتی، بەناوی پادشای باوکی‌یەوە کردەوەیەکی سەربازیی ئەنجام داوە و سەرکەوتنەکەی لەلایەن پادشای یاسایی و کارا خۆیەوە، کە ئیددیــ(ـــن)-سینە، پێشکەش بەخواوەندان کراوە. بەڵام هەر دەبوایە ناوی زابازوناش لە نووسینەکەدا بهێنرێت بە پێی ئەوەی کە فەرمانڕەوای ئەو شوێنە بووە کە ئاژاوە و یاخیگەری‌یەکەی بەخۆیەوە دیوە، هیچ نەبێت بۆ مەبەستی پڕۆپاگەندەیی.

نووسینەکە ناوی خواوەندان *ئەدەد Adad*‘ و *ئیشتار Ištar*‘ و *نیشبا Nišba*‘ ی هێناوە کە فەرِیان بە پادشا بەخشیوە و لەشەڕی دژی کولونوم دا یارمەتی‌یان داوە، بۆیە وەک سوپاس و پێزانین خوانی بۆ ئەدەد و ئیشتار ڕازاندووەتەوە و تەختێکی بۆ نیشبا هەڵبەستووە.[٦٧] لە کۆتایی نووسینەکەدا لیستێک نەفرەت و تووک دێت لە هەرکەسێک دەستکاری نووسین و نەخشەکان بکات و بیان شێوێنێت. لەم لیستەدا ناوی خواوەندان *ئانو Anu*‘ و *ئێنلیل Enlil*‘ و *نینخورساگ Ninhursag*‘ و *ئێنکی Enki*‘ و *سین Sîn*‘ و *ئەدەد Adad*‘ و *شەمەش Šamaš*‘ و *ئیشتار Ištar*‘ و *نین-ئان-سیانا*

---

[65] *Ibid.*
[66] Walker, p. 174.
ڤۆکەر ئەوەش بە دوور نازانێت یەکەم ڕستە کە ناوی باوکی زابازونای تێدایە ڤۆکەتیف (Vocative=، واتە بانگ کردن، بانگ هەڵدان، وەک بۆ نموونە کە دەڵێیت "خوایە!") بێت.
[67] ڕونووسی C، بڕوانە:
Al-Fouadi, p. 124.

‘*Nin-an-siana* و ‘نیشبا *Nišba*’ هاتوون (دێڕەکانی ٢٦-٥٣).

باوەڕ وایە ئەم نووسینانەی لەسەر بەرد هەڵکەندراون، لە دیوارەکانی بینایەک گیرابن کە بەتایبەتی بۆ ئەم مەبەستە دروست کرابێت، لەوانەیە پەرستگا بوبێت و لەوانەشە

وێنەی ژمارە ١٤: ئەو بەردەی نووسینەکانی بێتواتەیان لا دۆزراونەتەوە. سەرچاوەی وێنە: مامۆستا عبد الرقیب یوسف.

بینایەکی یادگارانە بووبێت. ئەم باوەڕەش لەوەوە هاتووە کە پاشماوەی کەرەستەی بینا، کە لەم حاڵەتەدا ‘کاربۆناتی کالسیۆم CaCo3’ ە، لەسەر قەراغی ڕونووسی A لەلایەن الفؤادي یەوە تێبینی کراوە.[٦٨] سەرباری ئەمەش، شتێکی وا لە نووسینەکە خۆیشیدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هاتووە کە دەڵێت: "ئیشەکەی دەستم" (دێڕی ٢٦-٢٧) و بەدوایدا دەڵێت "نووسینەکەم" (دێڕی ٢٨-٢٩). دوور نیە ئەو تەختە نەبێت کە بۆ نیشبای هەڵبەستووە و لە ڕونووسی C دا باسی هاتووە. لێرەدا دەشێت ئاماژەیەک بۆ هەندێک لە شوێنەوارەکانی ناوچەی بێتواتە کە لەوانەیە پەیوەندییەکیان بەم نووسینانە و ناواخنەکانیانەوە هەبێت، بەسوود بێت. لەو شوێنەی پێی دەووترێت ‘بەردی سەنجیان’ و

[68] *Op. Cit.*, p. 122

لەنزیکی‌یەوە ئەم نووسینانە و نووسینەکەی ئەنتیکەخانەی ئورشەلیم دۆزراونەتەوە، بەردێکی گەورەی شێوە تەخت یان سەکۆی قوربانی (=Altar) هەیە، وا پێدەچێت لە سەردەمانی زوودا داتاشرابێت (وێنەی ژ. ١٥). بەردەکە تا دە دوانزدە ساڵێکیش پێش ئێستا دووئەوەندەی ئێستای بەرز بوو و لەلایەن تالانکەرانی شوێنەوارەوە تەقێندرایەوە،[٦٩] دانیشتوانی ناوچەکە پێی دەڵێن 'تەختی خورشیدی خاوەر.' نووسینەکان خۆیان لە دامێنی گردێکی گەورەدا دۆزرابوونەوە کە کەمێک لە باشوری شاری بێتواتەوەیە و پێی دەڵێن 'قەڵای بێتواتە' و بریتی‌یە لە وێرانەی قەڵایەکی کۆن کە لە گاشەبەردی گەورە بنیات نراوە وئێستا بەردەکانی لەسەرتەختی گردەکە و بە قەراغەکانی دەوروپشتی دا پەرش و بڵاوبوونەتەوە. کەواتە دەشێت بیناکەی کاتی خۆی نووسینەکان و نەخشەکەی تێگیراوە، لەسەرتەختی ئەم گردە بووبێت.

وێنەی ژمارە ١٥: ئەو بەردەی "تەختی خورشیدی خاوەر" ی پێ دەووترێت. سەرچاوەی وێنە: مامۆستا عبد الرقیب یوسف.

---

[69]هەندێک لەم زانیاری‌یانەم لە بەڕێز مامۆستا عبد الرقیب یوسف وەرگرتووە، زۆر سوپاسی دەکەم.

ئەم نووسینانە بە ووردی لەگەڵ ئەو نووسینەی بە نووسینی **ئانوبانینی ۲** ناسراوە و لە **سەرپوڵی زەهاو (ID 5)** ە و نەخشێکیشی لەگەڵدایە (وێنەی ژ. ١٦)، بەراورد کراوە. شێوە و ڕێنووس و زمانی ئەم نووسینانە ئێگجار لەیەک دەچن، بە تایبەتی هەردوو ستوونی ۲ و ۳، دێرەکانی ۲۹ بەدواوەی نووسینەکەی ئانوبانینی ۲ لەگەڵ بەشی دوایی نووسینەکەی بێتواتە، دێرەکانی ٣٤-٦١. گوێزانەوە لە ڕاناوی کەسی سێ یەمەوە بۆ کەسی یەکەم لەهەردوو نووسینەکەدا، لیستی ناوی خواوەندان؛ شێوازی بەدوای یەکدا هاتنیان و ناونیشانەکانیان، بەتایبەتی هی نیشبا و نین-ئان-سیاننا لە دیارترین ڕوخسارە دیارە لەیەکچووەکانیانن.[70] نووسینەکەی ئانوبانینی ۲ لەیەکچوونی لەگەڵ نووسینەکەی ئورشەلیمیشدا هەیە؛ نەخشەکانی لێ دەر بچێت، دەستەواژەی ***balāṭum lū ikkibšu*** و ڕستەی "نین-ئان-سیاننا خواوەند(ی کەسی)مە، نیشبا سەروەرمە" لەهەردوو نووسینەکەدا جێگای سەرنجن.

مێژووی نەخشەکە و نووسینەکە بە زیاد لە سەدەیەک کۆنتر لە نەخش و نووسینەکەی ئانوبانینی ۱ی پادشای لوللوبوم زانراوە.[71] هەر بەپێی ئەم پێشنیازە، ئانوبانینی ی پادشای لوللوبوم کە پاش پادشای سیمورروم هاتووە، نووسینەکەی پادشای سیموررومی سڕیوەتەوە و لەوانەشە ناوی خۆیشی لەسەر نووسیبێت تاوەکو کارەکانی بە هی خۆی بکات.[72] بەڵام ئەو بەڵگەیەی نووسینە نوێ یەکەی ئیددیـــ(ـــن)-سین، واتە نووسینەکەی هەڵەدنی (ID 6)، پێشکەشی دەکات، پاڵپشتیی ئەم پێشنیازە ناکات. بە پێچەوانەوە، ئاماژەی نووسینەکە بۆ ئانوبانینی و وولاتی لوللوبوم، هەرچەندە لە سەر بەردەکە لەم شوێنەدا داخوراوە، دەیسەلمێنێت کە ئیددیـــ(ـــن)-سین ئەگەر لەدەمێکی دواتر لە دەمی ئانوبانینی دا نەژیابێت —چونکە دەشێت نووسینەکەی هەڵەدنی لەم شوێنەدا

---

[70] Walker, p. 179; 182-3.

[71]ئەمە پێشنیازی ڕۆکەرە، بڕوانە:

Walker, p. 186; 189-90.

[72] *Ibid.*

ڕووداوی کۆنتر بگێڕێتەوە-، ئەوا بێگومان هاوچەرخی بووە.

**نووسینەکەی ئورشەلیم**، کە ئێستا لە ئەنتیکەخانەی ئیسرائیل دایە لە شاری ئورشەلیم-قودس، سەرباری شکاوی و داخورانی زۆری، بەڵام هێشتا گرنگیی گەورەی لە دەست

وێنەی ژمارە ١٦: نەخشەکەی پادشای سیموررووم لە سەرپول. سەرچاوەی وێنەکە:
Hrouda, *Iranische Felsreliefs*, Pl. II.
شێوەی ژمارە ٩ : ڕونووسی نووسینەکەی سەر ئەم نەخشە هەڵکەندراوە لە هەمان سەرچاوەوە وەرگیراوە.

نەداوە. نووسینەکە نەخشێکی پادشایشی لەگەڵدایە کە پێی بە دوژمنە بەزیوەکەیدا ناوە و ڕووی لە خواوەند ئیشتارە (وێنەی ژ. ١٧).[٧٣] نووسینە هەشت ستوونیەکە یادی سەرکەوتنی سیموررومی بەسەر کولوننوم دا پاراستووە. کولوننوم، هەروەک لە نووسینەکە خۆیەوە دەردەکەوێت، لەژێر دەستی کاکموم دا بووە.[٧٤] ئەو دێڕانەی لە نووسینەکە ماونەتەوە بە ناونیشانە شاهانەکانی پادشا دەست پێ دەکەن، پاشان سەرهوردی کاکموم و شارەکانی ژێر دەستی دەگێڕێتەوە کە ئیددی‌ـــ(ـــن)-سین توانیویەتی لەتاکە یەک شەودا داگیریان بکات و وێرانیان بکات. لەم نووسینەدا هاتووە کە کاکموم کولوننومی داوەتە دەست سیموررروم (iii 4´-iv 3)، شتێکی لەم جۆرە لە نووسینەکەی هەڵەدنیشدا تێبینی دەکرێت: "وولاتی *ئوتو-وی* *Utuwe* ی لەدەستی کاکموم سەندەوە و ئەمجا کاکمومی وێران کرد" (70-74). ئەمە واتای وایە کە ئیددیـــ(ـــن)-سین ناوچەو هەرێمە ژێردەستەکانی کاکمومی یەک لەدوای یەک لەژێر دەستی کاکموم دەردەهێناو دەیخستنە سەر شانشینەکەی خۆی. دیارە کاکموم زلهێزەکەی تری کوردستانی کۆنی ئەم سەردەمە بووە، چونکە، هەروەک دەبینین، سیموررروم تەنها لەسەر حسابی کاکموم دەیتوانی فراوان ببێت، زۆربەی ئەو سەرزەمینانەی سیموررروم دەیویست دەستیان بەسەردا بگرێت، لەژێردەستی کاکموم دا بوون. ئیددیـــ(ـــن)-سین خۆی باسی ڕابوردووی شکۆداری کاکموم دەکات و دەڵێت: "وولاتی کاکموم، کە لەڕۆژ(انـــ)ـــی زوویـــــــەوە باجی [بە] هیچ کەس [نە]داوە" (iv 9-16). بەڵام هەڵهێنجانێکی تریش ئەوەیە کە نووسینەکەی هەڵەدنی پێش نووسینەکانی ئورشەلیم و بیتواتە نووسراوە و لەوان کۆنترە. هۆی ئەم باوەڕەمان ئاراستـــەی بەرەوپێش چوونـــی

---

[73] نەخشەکە لە ڕووی هونەریەوە بەدرێژی لەلایەن پرۆفیسۆر 'ئورسولا زایدل' ەوە لەهەمان بابەتەکەی شافەر و ڤاسەرمانەوە لێی کوڵدراوەتەوە، بڕوانە:

*ZA* 93 (2003), pp. 39-52.

[74] تکایە تێبینی بکە کە ناوی کاکموم لەلایەن شافەر و ڤاسەرمانەوە بەهەڵە بە *'نیموم* *Nimum'* خوێندراوەتەوە.

ئیددیـــ(ـــن)-سینه که هەموو بەڵگەکان وا پیشان دەدەن لە باشورەوە بەرەو باکور هەڵکشابێت. لەم بارەدا دەبوایە لە پێشدا 'ئوتوم' بگرێت کە بە دەشتی ڕانیە و دەوروپشتی دەزانرێت،[٧٥] ئەمجا کولونوم لە بێتواتە، ئەو شوێنەی ئەم نووسینانەی لێ دۆزراوەتەوە. بە

وێنەی ژمارە ١٧: نەخش و نووسینەکەی ئورشەلیم لە ئەنتیکەخانەی ئیسرائیل. سەرچاوە:
Shaffer and Wasserman, *ZA* 93 (2003), p. 6.

جۆرێکی تر بڵێین، لە پێشدا دەشتی ڕانیەی گرتووە و یادی گرتنەکەیی لە نووسینەکەی هەڵەدنی دا تۆمار کردووە، لە کاتێکی دواتردا کولونومی لە ناوچەی بێتواتە گرتووە،[٧٦]

---

[75]سەبارەت بەوەی ئوتوم ناوچەی دەشتی ڕانیە و دەوروبەری بووە، بڕوانە:
Læssøe, J., *JAOS* 88 (1968), p. 122.

[76]لەیادمان نەچێت فرەین کولونوم بە گوندی 'گولان'ی ئێستای نزیک بێتواتە دەزانێت، بڕوانە:

که کەوتووەتە باکوری ئوتومەوە و بۆ یادی ئەمیان نووسینەکانی بیتواتەی جیّ هیشتووە. بەلگەیەکی تر ناونیشانی نیشبای گەورە خواوەندی شانشینە کە ئیدیـ(ـن)-سین تۆماری کردووە. لە نووسینەکەی هەلەدنی دا پێی دەلێت "پادشای ٨ کولیشوم *Kulišum*" (l. 2; 105)، واتە هەشت هەرێمان؛ کەچی لە نووسینەکەی ئورشەلیم دا دەبێتە "پادشای ٩ کولیشوم *Kulišum*" (i 14)، ئەویش پاش ئەوەی کولونومیشی خستووەتە سەر خاکی شانشینەکەی.[٧٧] دیارە چەندین هەرێم لەم نۆ هەرێمە ژێردەستە لەوانەن کە لە هەردوو نووسینەکەدا ناویان ڕیز کراوە.

دەشێت پێشنیازبکەین کە کولونوم، پاش ئەوەی لەپێشدا ئیدیـ(ـن)-سین دەیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و زابازونای کوڕی دەکاتە فەرمانڕەوای و نوێنەری پادشا تیایدا- بابەتی نووسینەکەی ئورشەلیم-، لە دژی نیری سیموررووم ڕادەپەڕێت و ڕاپەڕینەکەی لەلایەن زابازونا خۆیەوە تێک دەشکێندرێت، بەلام هەر بەناوی باوکی‌یەوە. یادی ئەم کارەیان بە نووسینەکانی بیتواتە پارێزراوە. ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت کە نووسینەکانی بیتواتە کەمێک لە نووسینەکەی ئورشەلیم دواترن، کە ناوی زابازونای تیادا نەهاتووە- هیچ نەبێت لەو

---

Frayne, *SCCNH* 10, 177.

فرەین شێوەی تری ئەم ناوە جوگرافی‌یەی هێناوەتەوە کە لە دەقەکانی سەردەمانی ئەکەدیی کۆن و بابلیی کۆندا لە شوێنەوارەکانی حەمرین دا هاتوون، وەک *K/Gul-la-ni* لە تەل سولەیمە و *Kul-la-an* لە تەل حەدداد. بڕوانە:

*Ibid.*

[77] وادیارە ئیدیـ(ـن)-سین، هەروەک نەریتەکانی مێسۆپۆتامیای کۆن، گەورە خواوەندی شانشینی بە پادشای ڕاستەقینەی وولات لەقەلەم داوە. بۆیە نیشبا بە پادشای هەر هەشت هەرێمەکە وەسف دەدات، بەلام وادیارە پادشا لە دواتر دا کەمێک لە ئایین دوور دەکەوێتەوە و خۆی بە پادشای نۆ هەرێم وەسف دەدات.

بەشانەدا کە ماون-.[۷۸] ئەوەی زیاتر پاڵپشتیی ئەم ڕایەشمان دەکات، ئەو تێبینی‌یەی شافەر و ڤاسەرمانە سەبارەت بە هەندێک سیمای ئێپیگرافی‌یانەی[۷۹] نووسینەکەی ئورشەلیم. هەندێک لەم سیمایانە دەری دەخەن کە خەت لێدەری نووسینەکانی بێتواتە هەمان خەت لێدەری نووسینەکەی ئورشەلیم نەبووە، بەڵکو کەسێکی تر بووە.[۸۰]

نووسینەکەی **هەڵەدنی** دوو جیاکەرەوەی سەرەکیی هەیە کە لە نووسینەکانی تری ئەم پادشایەدا نین: **یەکەمیان**، باس لە وولاتان و ناوچەو هەرێمی دوور لەیەک دەکات، وەک ئەوەی پادشا سەرگوزشتەی شەڕ و لەشکرکێشی‌یە زۆرەکانی بگێڕێتەوە، نەک

[78] مەحاڵ نیە، هەرچەندە من خۆم بە دووری دەزانم، کە نووسینەکەی ئورشەلیم دوای نووسینەکانی بێتواتە نووسرابێت. واتە، یەکەمیان بۆ تۆمارکردنی ڕووداوی تێکشکاندنی یاخی‌گەریی شارەکە بووبێت لەلایەن ئیدديـ(ـن)-سین ی باوکەوە بۆ یارمەتی کوڕەکەی و، ئەوانەی دووەم بۆ یادی تێکشکاندنی یاخی‌گەری‌یەکی دووەم بووبێت. شافەر و ڤاسەرمان باوەڕیان وایە هەردوو نووسینەکە یەک بەسەرهات دەگێڕنەوە، چونکە هەردووکیان لەیەک شوێندا دۆزراونەتەوە، لەهەمان کاتیشدا دان دەنێن بەوەی دەشێت نووسینەکەی ئورشەلیم کەمێک پاش نووسینەکەی بێتواتە نووسرابێت. بەڵام بەڕای ئێمە دەکرێت ئەمە وا ڕاڤە بکەین کە ئیدديـ(ـن)-سین نووسینە نوێ یەکەی لەهەمان شوێنی نووسینە کۆنەکەدا داناوە، وەک نشانەیەک بۆ گێڕانەوەی هەموو شتێک بۆ بارو دۆخی جارانی پێش یاخی‌گەری‌یەکە. تێبینیی ئەوەش بکە کە گێلب Gelb و کیناست Kienast لەگەڵ ڕای یاخی‌گەری‌یەکی دووەمدا و کۆمەکی ڕاستەوخۆی سەربازی‌یانەی ئیدديـ(ـن)-سین دا کۆکن، بەڵام هیچ بەدوای‌یەکداهاتنێکی کرۆنۆلۆجی‌یانەیان نەداوە. بڕوانە:
Gelb, I. J. and B. Kienast, *FAOS*, 379; 381.

[79] Epigraphy، واتە شێوەی نووسین و ڕێنووسی خەتی کۆن، لەم بارەدا نووسینی مێخی.

[80] Shaffer and Wasserman, p. 30.

لێرەدا مەبەست لە خەت لێدەر ئەو کەسەیە کە هونەری نووسین و خوێندنەوەی زانیوە و لە خزمەتی دەرباری شاهانەدا بووە و ئەوەی پێی گوتراوە نووسیویەتی. بەمانە دەووترێت Scribe، بۆیە ئەم ووشەیەش بەکاردەهێنم تاکو جیا بکرێتەوە لە نووسەر بەواتای ئێستای، کە بەرامبەر Author ە و ئەمە خۆی ناوەڕۆک و شێوە و زمانی نووسینەکە دیاری دەکات یا بەدەستی خۆیشی نەینووسێت. ووشەی خەت لێدەر لەڕۆژگاری ئێستاماندا بە نوشتە نووسیش دەووترێت.

لەشکرکێشی‌یەک لە ناوچەیەکی سنووردار‌دا. لەم لایەنەشدا لە نووسینە شاهانەکانی سەردەمی ئاشووریی نوێ دەچێت کە کورتەیەکی هەموو کردەوە سەربازی‌یەکانی پادشایان لە پاش لیستی ناونیشانەکانی و لیستی ڕیشە (Genealogy=) یەوە دەنووسی.[٨١] زۆر لە ناوە جوگرافی‌یەکانی ئەم نووسینە یەکەم جارە بەرچاو دەکەون و پێشتر نەزانراو بوون، زۆری تریشیان بەداخەوە شکاوو ناتەواون. ناوە جوگرافی‌یە ناسراوەکانی بە بەدوای‌یەکداهاتنی وەک ناو دەقەکە خۆی ئەمانەن: 'شاریداخوم *Šaridaḫum*'، ئەمجا 'خالمان *Ḫalman*' لەوپەڕی باشورەوە، پاشان دەچێت بۆ 'شیکشاببوم *Šikšabbum*' و 'ئوتو-وێ *Utuwe*' و 'کاکموم *Kakmum*' لە باکور. پاش ئەمان، بۆ یەکەم جار لە هەموو نووسینەکانیدا باسی ئاموری‌یەکان بە سەرکردایەتی پێنج لە شێخەکانیان *rabiānum* دەکات، کە سەری بڕیون و لە وولاتەکەی خۆیی گێڕاونەتەوە دواوە. لە کۆتاییشدا شکاندنی 'سیماشکی *Simaški*.' ڕاستیی ئەوەی کە ئەم ناوە جوگرافی‌یانە بە پێی بەدوایەکداهاتنی جوگرافی‌یانە ڕیز نەکراون، دەشێت نیشانەی بەدوایەکداهاتنێکی کرۆنۆلۆجی‌یانە بێت. لەم بارەیاندا، ئەو وولاتانەی لەسەرەتای نووسینەکەدا ناویان هاتووە، ئەوانەن کە لەسەرەتادا خراونەتە ژێر ڕکێفەوە و لە چەقی سیموررومیشەوە نزیک تر بوون، ئەوانەش کە لە کۆتاییدا ناویان هاتووە، لەچەقەوە دوورتر بوون. بەم شێوەیە، لەسەرەتاوە ناوی چەند وولات هەن، 'شاریداخوم *Šaridaḫum*' و 'خالمان *Ḫalman*' یان لێ دەربچێت، هیچیان لەبارەوە نازانین. ئەوەی دوایی‌یان لە باشور بووە

---

[81] سەبارەت بە شێوە و پێکهاتی نووسینە شاهانە ئاشووری‌یەکان، بڕوانە:

Baumgartner, W., "Zur Form der assyrischen Königsinschriften," *OLZ* 27 (1924), p. 313ff.;

بۆ زانیاری زیاتریش، بڕوانە:

Borger, R., *Einleitung in die assyrischen Königsinschriften*, I: Das Zweite Jahrtausend v. Chr., Leiden, 1961.

لەسەر ڕۆخی، یان نزیک ڕۆخی ڕوباری ئەڵوەند، لە دەوروبەری سەرپوڵی زەهاو.[٨٢] لەم خاڵەدایە کە 'ئانوبانینی' ی پادشای لوللوبوم باس کراوە، هەر لەم شوێنەشدا نووسینەکە تووشی زۆر شکاوی و داشۆران هاتووە، بەڵام پێ دەچێت باسی سەندنی پارچەیەک لە خاکی شانشینەکەی ئانوبانینی تێدا کرابێت، یان ڕاست کردنەوەی بارێک کە پێشتر ئانوبانینی بەسەر سیموررووم دای سەپاندبێت. پاش شکاوییەک ناوی *'شیکشاببوم Šikšabbum'* و شاری *'ئیتو Itu'* —کە لەوانەیە هەمان شار بووبێت کە لە نامەی شمارەی ژمارە SH 861 دا هاتووە- و وولاتی *'ئوتو-وێ Utuwe'* و *'کاکموم Kakmum'* دێن کە هەموویان لە باکورن، ئەمانیش بە پێی نووسینەکە نیشانی سەربازیی شەڕەکانی ئیددیـــ(ـــن)-سین بوون. پاش ئەم نیشانانە، ناوی ئاموورییەکان دێت، هەرچەندە نووسینەکە بەووردی دیاری نەکردووە لەکوێ بەرەورووی ئاموورییەکان بووەتەوە، بەڵام ڕستەکە کە دەڵێت: "لە وولاتەکەی/هەرێمەکەی خۆی گیڕانییە دواوە" ئاماژەیە بۆ خاکی سیموررووم و بەڵگەیە کە ئاموورییەکان توانیویانە پێ بخەنە ناو خاک و قەڵەمڕەوی سیموررومەوە. لە کۆتاییشدا، پادشا ئاموورییەکان و سیماشکییەکانی پێکەوە شکاندووە (دێڕی ٩٢-٩٤). ئەم دوانەی دوایی هیچ بەندێکی جوگرافییان پێکەوە نیە؛ ئاموورییەکان بەگشتی لە ڕۆژئاوا یان باکوری ڕۆژئاواوە و سیماشکیش لە ڕۆژهەڵات، لە بانی ئێران.[٨٣] ئەمە واتای ئەوەیە پادشا سەرکەوتنی بەسەر ئەم دوو دوژمنەدا بە دیارترین و گرنگترینی کارەکانی لەقەڵەم داوە، بەپێ ی ئەوەی شەڕێک بوون

---

[82]دەکرێت هاتنی ناوی خالمان لە نامەیەکی سەردەمی بابلیی کۆندا، هەرچەندە شکاویشی تێدایە، بەهەند وەربگرین. نامەکە لە ئێشنوننا دۆزراوەتەوە و باس لە شکاندنی ئیددیـــ(ـــن)-سین ناوێک لە چیاکانی ڕۆژهەڵات دەکات. ئەم نامەیە لەلایەن 'وایتینگ Whiting' ەوە بڵاو کراوەتەوە لە:

Whiting, *Old Babylonian Letters from Tell Asmar,* No. 2

کە پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە.

[83]سەبارەت بە شوێنی سیماشکی، بڕوانە:

Stolper, M. W., "On the Dynasty of Šimaški and the Early Sukkalmaḫs," *ZA* 72 (1982), p. 45-6.

بۆ پاراستنی خاکی نیشتیمانەکەی بوون. ئاموری‌یەکان، هاوپەیمانانی جارانی سیموررروم،[84] ئەو کاتەی هەردوو لا بەرژەوەندی‌یەکی هاوبەشیان هەبوو لە جەنگان لەدژی ئور، پاش گۆڕانی باری سیاسی‌یانەی ناوچەکە بوونە دوژمن و هەوڵیان دا بێنە ناو خاکی سیمورررومەوە.

جیاکەرەوەی **دووەمیش** نەبوونی کلێشەی تووک و نەفرەتە و بەهۆی ئەمەشەوە نەبوونی لیستی ناوی خواوەندان، وەک ئەوانەی لە نووسینەکانی تریدا هەن. لەم نووسینەدا تەنها ناوی دوو خواوەند هاتوون،[85] نیشبا، کە ڕوونە گەورە خواوەندی شانشین بووە و لەوانەیە پارێزەری پایتەختیش بووبێت؛ ئەوی تریش ئیشتار/ شاوشکایە، ئەو خواوەندەی لە نەخشە هەڵکەندراوەکانی ئانوبانینی ۱ و ۲ و ئورشەلیمدا نیگاری کێشراوە. ئەگەر کلێشەی تووک و نەفرەت لە نووسینەکەدا هەبووبێت، ئەوا دەبێت لەو بەشەدا بووبێت کە لە بەشی خوارەوەی ستوونی دووەمدا بووە و ئێستا هیچی نەماوە.

بەداخەوە نووسینەکەی سەرپول (=ئانوبانینی ۲ /ئیددیـــ(ـــن)-سین ٥) زۆر خراپ شکاوە و داشۆڕاوە، نزیکەی هەموو ئەوەی کە لێی ماوەتەوە کلێشەی تووک و نەفرەتەکەیەتی کە هیچ زانیاری‌یەکی مێژوویی وا بەدەستەوە نادات بتوانرێت بۆ دیاری کردنی مێژووەکەی پشتی پێ ببەسترێت. بەڵام هەروەک پێشتر لەم بەشی سێ یەدا ئاماژەی بۆکرا، بەووردی تێڕوانین لە شێوە و خەت و کلێشەی تووک و نەفرەتەکەی، هەروەها ووشەکانی کە تیایدا بەکارهاتوون زیاتر بەلای ئەو پێشنیازەدا دەشکێنێتەوە کە نووسینەکە هی یەکێک لە پادشایانی سیموررروم بێت، ئیددیـــ(ـــن)-سین یان زابازونای

---

[84] بگەڕێرەوە بۆ نامەکەی کە میشالۆڤسکی (p. 229) بلاوی کردووەتەوە. ئەم خاڵە لە نیوەی یەکەمی ئەم بەشەشدا باسی کراوە.

[85] ناوی خواوەند سین *Sîn* کە بەشی تیۆفۆریی ناوی پادشا پێک دەهێنێت، لەگەڵ ئەم دووەدا نەژمێردراوە.

کوڕی. زۆر دەشێت ئەم نووسینە لەپێش نووسینەکەی هەڵەدنی دا نووسرابێت، چونکە ئەم نووسینە دیارە بۆ یادەوەری سەرکەوتنێک لە ناوچەی سەرپول لێرەدا هەڵکەندراوە و ئەوەش زۆر دەشێت گرتنی شاری خالمان، یان هەر شارێکی تری دەوروبەری خالمان بووبێت. تەنها لەپاش ئەمەوە توانیویەتی لە نووسینەکەی هەڵەدنی دا باس لە خالمان و تۆپۆنیمەکانی تری دەوروبەری وەک ژێردەستەی خۆی بکات. لەمەش زیاتر، گرتنی ئەم شارەو لەڕێی ئەویشەوە دەست گرتن بەسەر شارێی خوراساندا بوو تینی پێ بەخشی دەست بکاتە جیهانگیری.

## مۆرە لوولەکی‌یەکانی سیموررروم:

دوو مۆری لوولەکی و جێ مۆرێک (=Seal impression) لە جێماوە ماددی‌یەکانی پادشایانی سیموررومن کە لە بەڵگە کۆنەناسی‌یەکانی شانشینن. یەکێک لە مۆرەکان (وێنەی ژ. ١٨) بۆ یەکەمین جارە لەلایەن شافەر و ڤاسەرمانەوە لەهەمان بابەتی نووسینەکەی ئورشەلیمدا بلاو دەکرێتەوە. مۆرەکە یەکێکە لە پارچەکانی کۆمەڵەی ئەنتیکەکانی هەردوو هاوسەر 'جۆناثان ڕۆز Mr. and Mrs Jonathan Rose' لە نیویۆرک.[86] مۆرەکە لە بەردێکی ڕەقی بریقەدار هەڵکەندراوە، نووسینێکیشی لەسەر هەڵکەندراوە کە دەڵێت ئیددی‌ـــ(ـــن)-سین پادشایەکی بەهێزە و زابازونا کوڕێتی:

"ئیددیـــ(ـــن)-سین، پادشای بەهێز، (خواوەند) زابازونا
کوڕیـــ(ـــتی). ئیلی-دەننو نۆکەریـــ(ـــتی)."[87]

مۆرێکی تر لە ئەنتیکەخانەی بەریتانی هەیە (BM 102055)، کە کۆلۆن بلاوی

[86] *ZA* 93 (2003), p. 32-34.
[87] "$^{d}$*I-dì-*$^{d}$En. ZU, LUGAL *da-núm*, $^{d}$*Za-ba-zu-na*, DUMU. NI, *ì-lí-dan-nu*, ⌈IR$_{11}$⌉-ZU:" Shaffer and Wasserman, p. 33.

کردووەتەوە،[٨٨] (وێنەی ژ.١٩) زۆر لەم مۆرەی یەکەم دەچێت. بەڵام نووسینەکەی سەری ناوی ئیدیــ(ـــن)-سین نابات، لەوانەیە هی ئەوەبێت مێژووی هەڵکەندنی دوای مردنی خۆی و هاتنە سەر تەختی کوڕەکەی بووبێت:

"زابازونا، پادشای بەهێز. *تێخێش-ئەتال* *Teheš-atal*ی خەت لێدەر،[٨٩] نۆکەرتـــ(ـــە)."[٩٠]

ناوهێنانی کوڕ یان جێنشینان (=Crown Prince) لە نووسینە فەرمییەکانی شانشینەکانی دامێنەکانی زاگرۆس دا و دابەش کردنی ناونیشان و دەسەڵات لەگەڵ پادشادا، پێدەچێت، هەروەک شافەر و ڤاسەرمانیش تێبینیان کردووە، نەریتێکی ئەو ناوچانە بووبێت.[٩١] هۆی ئەم باوەڕە نووسینەکانی سەر ئەم مۆرانە و نووسینەکانی بێتواتە و هەروەها جێ مۆرێکی شاهانەی ترە کە هی 'پیشێنتێن *Pišentēn*' ناوێکی پادشای *ئیتابالخوم* *Itabalhum*'ە کەلەسەر پارچە لەوحێکی شمشارە (SH 890) دۆزراوەتەوە.[٩٢]

جێ مۆرێکی پەیوەندی دار بە سیموررومەوە لەسەر لەوحێکی قوڕ لە ئێشنوننا

---

[88] Collon, D., *First Impressions, Cylinder Seals in the Ancient Near East,* London, 1993, p. 37, no. 121.

[89] بەواتای scribe، ئەوەی هونەری خەت و نووسین پیشەی بووە، نەک نووسەر بەواتای ئێستای.

بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٨٠ ی ئەم بەشە.

[90] "[d]*Za-ba-zu-na* LUGAL *da-núm Te-he-eš-a-tal* DUB. SAR ÌR. ZU:" Collon, *Catalogue of the Western Asiatic Seals in the British Museum,* Cylinder Seals II: Akkadian-Post Akkadian, Ur III Periods, London, 1982, no. 451, p. 164.

هەروەها بڕوانە:

Sollberger, *Anatolian Studies* 30 (1980), p. 63-65.

[91] Shaffer and Wasserman, p. 34.

[92] سەبارەت بەم جێ مۆرە، بڕوانە:

Eidem, J. and E. Møller, "A Royal Seal from the Ancient Zagros," *Mari Annales de Recherches Interdiciplinaires (MARI),* 6, Paris, 1990, p. 636.

دۆزراوەتەوە، یەکەم جار جاکۆبسن Jacobsen بڵاوی کردەوە[٩٣] و دواتریش سولبێرژێ Solberger دووبارە لێ ی کۆڵیوەتەوە.[٩٤] جێ مۆرەکە، هەرچەندە شکاوی تێدایە، بەڵام زانیاری گرنگی تێدایە، زابازونا بە "پادشای بەهێز" ناودەبات. لەمەش گرنگتر ئەوەیە جێ مۆرەکە لە جێگای کۆنی خۆیدا *in situ*[٩٥] لە پەرستگای *ئیتوریا* ‘*Ituria*’ دا دۆزراوەتەوە، لەژێر چینێکدا کە هی سەردەمی فەرمانڕەوایی *بیلالاما* ‘*Bilalama*’ ی پادشای ئێشنوننایە. واتە مێژووی جێ مۆرەکە لە نێوان کۆتایی بنەماڵەی سێ یەمی ئور و سەردەمی فەرمانڕەوایی بیلالاما ی هاوچەرخی *شو-ئیلیشو* ‘*Šu-ilišu*’ (١٩٨٤-١٩٧٥ پ. ز.) ی پادشای *ئیسن* *Isin* دایە.[٩٦]

وێنەی ژمارە ١٩: مۆری زابازونا لـــــــــە ئەنتیکەخانەی بەریتانی.

سەرچاوە:

Collon, *Catalogue of* ..., no. 451.

وێنەی ژمارە ١٨: مۆری ئیدد‌یــ(ــن) سین لە کۆمەڵەی ئەنتیکەکانی ڕۆزن.

سەرچاوە:

Shaffer and Wasserman.

---

[93] Frankfort, H., S. Lloyd and Th. Jacobsen, *The Gimilsin Temple and the Palace of the Rulers at Tell Asmar*, Chicago, 1940, p. 146, no. 13. (*apud*).

[94] Sollberger, *op. cit.*

[95] زاراوەی *in situ* ئەوە دەگەیێنێت ئەو شتەی دۆزراوەتەوە لەو جێگایە و لە چینەدا دۆزراوەتەوە کە لەکاتی خۆیدا دانراوە ئیتر نەگۆڕاوە و نەگوێزراوەتەوە بۆ شوێنێکی تر یان چینێکی تر. ئەمەش بۆ دیاری کردنی چۆنیەتی و مێژووی شتەکە و مەبەست لێ ی لە ڕووی کۆنەناسی‌یانەوە زۆر گرنگ و بە سوودە.

[96] Walker, p. 176.

تەماشای خشتەکەی لاپەڕە 177 ی هەمان سەرچاوەش بکە.

شایانی باسە کە وێنەی هەردوو ئیدیـــ(ـــن)-سین و زابازونای کوڕی لەسەر مۆرە نوێ یەکە (=واتە کۆمەڵی ئەنتیکەکانی ڕۆزن) هەڵکەندراوە و هیچیان نەریش، نەسمێڵیان نیە. هەر لەسەر ئەم مۆرەش وا نیە، بەڵکو پادشا لە نەخشەکەی ئورشەلیمیش (بڕوانە وێنەی ژ. ١٧) و نەخشەکەی سەرپولیش دا هەر وایە. ئەگەر هەر گومانێک لەدەست نیشان کردنی ناسنامەی ئەو کەسەدا هەبێت کە وێنەکەی نەخش کراوە، ئایا پادشا خۆیەتی یان زابازونایە،[٩٧] ئەوا ئەم دوو مۆرە زیاتر بەلای ئەوەدا دەمانبات بە پادشای بزانین. بە تایبەتی کە هەردوو پادشاش و کوڕەکەشی لەسەر هەمان مۆری کۆمەڵەکەی ڕۆزن پێکەوە وێنەیان نەخش کراوە و هەردووکیشیان بێ ڕیش و سمێڵن.[٩٨] وادیارە ئەمە خوو نەریتێکی تایبەت بە بنەماڵەی شاهانەی سیموررووم بووە و بنەماڵەی *گودێ-یا Gudea*ʻ و بنەماڵەی سێ یەمی ئورمان یاد دەهێنێتەوە، هەروەک شافەر و ڤاسەرمانیش تێبینی‌یان کردووە.[٩٩]

## شوێنی سیموررووم:

---

[97] Al-Fouadi, p. 128;

هەروەها بڕوانە:

Shaffer and Wasserman, p. 34.

هەندێک گومانیان بۆ ئەوە دەچێت کە زابازونا بێت، چونکە تەمەنی پچووک تر بووە لەباوکی بۆیـــە ڕیش و سمێڵی نەبووە.

[98] دیاری کردنی ناسنامەی ئەم دووکەسە کە پادشا و کوڕەکەین پێشنیازی شافەر و ڤاسەرمانەو ئەو پێشنیازەی ئێمەش لەسەر بناغەی ئەم ووتەیەیە. بەڵام بەلای منەوە هێشتا بواری ئەوە هەر هەیە گومان بکەین یەکێک لەو دوو کەسە کەسێکی تر، کەسێکی سێ یەم، بوو بێت، هەرچەندە ئەمەیان کەمتر ڕێ ی تێ دەچێت.

[99] Shaffer and Wasserman, p. 34.

پەیوەندی نێوان بنەماڵەی گودێ-یا و گەلانی ناوچە چیاییەکان مێژوویەکی کۆنتری لەمەش هەیە، بە تایبەتی لە هەندێک بواری زمانەوانیدا. ئەم بابەتە شپایزەر پێشتر لەسەری نووسیوە، بڕوانە:

Speiser, *Mesopotamian Origins*, p. 99.

هەموو بابەتەکانی کە باس کران دیسان پرسیارە گرنگەکەی جاران دەهێننەوە پێش: سیموررروم وەک شار و وەک وولات لە کوێ بووە؟ کۆنترین ڕا لەم بارەیەوە مایسنەر Meissner لە ١٩١٩ دا لە نووسینێکی دا خستی‌یە بەر چاو.[١٠٠] بەڕای ئەو دەبێت سیموررروم لە ناوچەی کەرکوک، لە نزیک وولاتی لوللوبوم بووبێت، چونکە هەردوو ناوی سیموررروم و لوللوبوم لە دیپاچە-مێژوویەکی شولگی دا پێکەوە هاتوون.[١٠١] جگە لەمەش هاتنی ناوی سیموررروم بەرامبەر *زاب(ب)ان* *Zab(b)an* لە هەندێک لەدەقەکانی سەردەمانی دواتردا، بەتایبەتی فەرهەنگە زمانەوانی‌یەکان (=lexical texts) و لیستی ناوە جوگرافی‌یەکان بەشێوەی (*Si-mur-ra*$^{ki}$*=Zab-ban*)،[١٠٢] هاندەرێکی تربوو بۆ باوەڕ بە بوونی سیموررروم لە نزیک پردێ (ئاڵتون کۆپری) ی ئێستا،[١٠٣] چونکە بە پێ ی سەرچاوە کۆنەکان زاب(ب)ان کەمێک لە باشوری زێ ی خواروو بووە. گۆتسە[١٠٤] Goetze لەمەدا لەگەڵ مایسنەرە، بەڵام نە فۆرێر[١٠٥] Forrer و نە

[100] Meissner, B., “Simurrum,” *Orientalistische Literaturzeitung (OLZ)*, (1919) No. ¾, p. 69-70.

بۆ سەرچاوەی زیاتر لەسەر ئەم بابەتە، تەماشای پێماڵەکەی فرەین بکە لەم بارەیەوە لە بابەتەکەیدا:

Frayne, “On the location of Simurrum,” pp. 243-269.

[101] Meissner, p. 69.

تەنانەت لەم دوایی‌یانەشدا سالڤینی Salvini و ڤیلهێلم Wilhelm یش ناوچەکانی سەرەوەی زێ ی خواروو بە شوێنی سیموررروم دەزانن:

Salvini, M., The Earliest Evidence……, *Urkesh and the Hurrians*, p. 111; Wilhelm, *The Hurrians*, p. 7.

لە باسەکەی ڤیلهێلمدا ڕوونە کە دۆزینەوەی نووسینەکانی ئیددی(ن)-سین لە بێتواتە لەپشت ئەم باوەڕەوەیەتی.

[102] ڕونووسێکی تر لەم دەقانە لە شاری ئاشوریش دۆزراوەتەوە شێوەیەکی جیاوازی ئەم ناوەی تیادا هاتووە بە شێوەی *Si-úr-ru*$^{ki}$، بڕوانە:

Meissner, *op. cit.*, p. 69.

[103] Meissner, p. 70.

[104] Goetze, A., “Ḫulibar of Duddul,” *JNES* 12 (1953), p. 120.

قایدنەر Weidner لەگەڵی نین.[106] ئەمان هەردووکیان پیشانیان داوە کە بەیەک زانینی سیمورروم و زابـ(ـبـ)ـان پێچەوانەی بەڵگە نووسراوە کۆنەکانە. لێکۆڵینەوەی لەوحەکەی 'سیپپار *Sippar*' کە هی سەردەمی بابلیی کۆنە[107] ناوی هەردوو سیمورروم و زابـ(ـبـ)ـانی پێکەوە بردووە و ئەمەش بەڵگەی قایدنەرە کە دوو شوێنی لەیەک جیا بوون، نەک هەمان شوێن، با لە نووسینەکانیشدا پێکەوەیان گرێ دابن. بەڕای ئەو دەبێت لە شوێنێکی خوارتر لە زێ ی خواروو بووبێتن.[108] ڕای فرەین لەم بارەیەوە جۆرێکی ترە، بەلای ئەوەوە سیمورروم ناوە کۆنەکەی وولاتەکە بووە لە سەردەمانی ئەکەدیی کۆن و ئوری سێ یەم و سەرەتای بابلیی کۆن دا، لە پاشان دا، ڕەنگە لەسەردەمی 'صیلی-سین *Ṣilī-Sîn*' و 'ئیلونا *Ilūnā*' ی فەرمانڕەوایانی ئێشنوننا دا، ناوەکە بۆ زابـ(ـبـ)ـان گۆڕاوە. ئەم ڕایە پشت بە زانیاریی‌یەکانی دەقە ئابووری‌یەکانی ئەرشیفەکانی 'مێ-توڕران *Mē-Turrān*' (تەل ئەلسیب و تەل حەدداد) بەستووە.[109] سەبارەت بە شوێنی سیمورروم لە باشورترەوە، قایدنەر بەڵگەی هەندێک نووسینی شاهانەی ئاشوری نوێ هێناوەتەوە. شەلمانیسسەری سێ یەم (٨٥٨-٨٢٤ پ.

---

[105] Forrer, E., *Die Provinzeinteilung des assyrischen Reiches*, Leipzig, 1920, p. 40-41

[106] Weidner, E., "Simurrum und Zaban," *AfO* 15 (1945-1951), p. 79.

[107] (88-5-12, 712)

لەوحە قوڕینەکە مێژووی چوارەمین ساڵی فەرمانڕەوایی 'ئەپیل-سین *Apil-Sîn*' (١٨١٣-١٨٣٠ پ. ز.) ی پادشای بابلی لەسەرە.

[108] Weidner, *AfO* 15, p. 77-79.

بەدووریشی نازانێت سیمورروم ناوی وولاتەکە بووبێت و زابـ(ـبـ)ـان یش گەورە شارەکەی:

*Op. cit.*, p. 79.

بەڕای ئەستۆر هۆی بەرامبەر یەک دانانی سیمورروم و زابـ(ـبـ)ـان لە فەرهەنگە زمانەوانی‌یەکاندا هەڵەیەکی نووسینی خەت لێدەرە دێرینەکانە، بڕوانە:

Astour, "Semites and Hurrians," p. 41, note 284.

[109] Frayne, "On the Location of…," p. 260;

هەروەها بڕوانە:

Frayne, *SCCNH* 10, p. 159.

ز.) له نووسینێکی دا گوتوویەتی لەڕێگایدا له شاری ئاشورەوە بەرەو *مێ-تورنــات* ‘*Mê-Turnāt* بە درێژایی شانی چیای *ئێبیخ* ‘*Ebiḫ* ڕۆیشتووە و له شاری زابــ(ـــبــ)ـــان وەستاوە، واتا له شوێنێکی نزیک چیای حەمرین له مەودای نێوان شاری ئاشور (قلعة الشرقاط) و ڕوباری سیروان. زۆر پێ دەچێت لەو حاڵەدا بووبێت کە عەزیم حەمرین دەبڕێت.[110]

بەڕای ناشف زابــ(ـــبــ)ـــان له شوێنێکی زۆرگەکانی نێوان کفری و قەرە تەپە دا بووە، ئەوەش بە لەبەرچاوگرتنی ناوەڕۆکی نووسینێکی *شەمشی-ئەدەد* ‘*Šamšī-Adad* (٨١١-٨٢٣ پ. ز.) ی پێنجەمی پادشای ئاشور.[111] ئەم گەیشتووەتە ئەنجامی ئەوەی کە زابــ(ـــبــ)ـــان لەسەر زێ ی خواروو نەبووە، ئەمەش سیمورروم لە پردێ دوور دەخاتەوە. دەقێکی ئەرشیفیی ئاشوری ناوەڕاستیش[112] هەیە پاڵپشتیی ئەم هەڵهێنجانە دەکات. دەقەکە لە شاری دێرینی *کار-توکولتی-نینورتا* ‘*Kār-Tukulti-Ninurta* (=تلول العقر) دۆزراوەتەوە و فرایدانک Fraydank لێ ی کۆڵیوەتەوە، دەقەکە دەڵێت "وولاتی (چیای؟) زابیان/زامبان، لەسەر ڕۆخی توران (=ڕوباری سیروان)."[113] فرەین لە

---

[110] Weidner, p. 76;

هەروەها بۆ کورتەی ئەم ڕایانە بڕوانە:

Frayne, "On the Location….," p. 261.

[111] Nashef, Kh., Die Orts- und Gewässernamen der mittelbabylonischen und mittelassyrischen Zeit, *RGTC* Band 5, Wiesbaden, 1982, p. 280.

هەروەها بۆ بیبلیۆگرافی سەبارەت بە زابــ(ـــبــ)ـــان تەماشای لاپەرەکانی 279-280 ی هەمان سەرچاوە بکە.

[112] VAT 18000.

[113] "KUR *Za-am-ba-an a-aḫ Tu-ra-an*" l.36.

بڕوانە:

Frayne, "On the Location…," p. 262-3.

سەبارەت بە وولاتی *زاب* ‘*Zāb* یش لە نووسینە شاهانە ئاشورییەکاندا، بڕوانە:

Schramm, W., "Das Land ZAB der assyrischen Königsinschriften," *Orientalia* 38 (1969), p. 126-7.

لێکۆڵینەوە ووردەکەیدا لەبارەی گەڕان بە دوای سیموررروم دا و بە پشت بەستن بەم نووسینە، وای بۆ چووە لەسەر ڕوباری سیروان بوو بێت، نەک لەسەر عەزێم، هەروەک ڤایدنەر بۆی چووە. بەڵام ئەم بۆچوونە کاتێک ڕاست دەبێت کە ئەم زاب‌ـ(ــبـ)ـانە لەگەڵ سیموررروم دا یەک بووبێتن.[114] ڕاستیی ئەوەی کە کۆکردنەوەی تالانی‌یەکانی

---

[114]Frayne, *op. cit.*, 263.

فرەین چەند بەڵگەیەکی تریشی بۆ پێشنیازەکەی هێناوەتەوە:

١) یەکێک لە ساڵەکانی فەرمانڕەوایی نەرام-سین ی ئەکەد بەیادی سەرکەوتنی بەسەر هەزدووشاری *ئەرامێ* *Arame*' و سیموررروم دا، ناونراوە. ئەمەش بەڵگەیە کە نەرام-سین ڕێگای بەرەو باکوری گرتووە کە بە درێژایی ڕوباری سیروان بەرەوژوور چووە، لەپێشدا ئەرامێ ی گرتووەو ئەمجا سیموررروم.

٢) ئەرامێ، کە لە لیستە جوگرافی‌یەکەی 'تەل حەرمەل' (=*شادوپپوم* *Šaduppum*ی دێرین) دا ناوی هاتووە، لەسەر ڕوباری سیروان بووە لە باشوری ئەو خاڵەوە کە تیایدا ڕوبارەکە حەمرین دەبڕێت. ئەم دیاری کردنەی شوێنی ئەرامێ لەم شوێنەدا کاری فرەین خۆیەتی.

٣) لە دەقێکی ئەرشیفیی ئوری سێ یەم دا کە مێژووەکەی هی ساڵی ٤٨ی شولگی‌یە، لەشکری ئەرامێ و لەشکری ئێشنوننا پێکەوە ناویان هاتووە.

٤) '*صیللوش-داگان* *Silluš-Dagān*' ی فەرمانڕەوای سیموررروم لەلایەن ئورەوە، پێ ی دەووترا فەرماندەی لەشکری سیموررروم و لەشکری *ئیشیم-شولگی* *Išim-Šulgi*.' ئەمەی دواییشیان هەر لە ناوچەی سیروان بووە. بڕوانە:

Frayne, *op. cit.*, p. 263.

هەرچەندە مەحاڵ نیە سیموررروم لەم ئاراستەیەوە بوو‌بێت، بەڵام پێویستە ئەم زانیاری‌یانەی بەبەڵگە هێنراونەتەوە بە ووردی تەماشا بکرێن. ڕەخنەی من لەوەیە کە شاڵاوبردنەسەر دووشار لە هەمان ساڵدا مەرج نیە بەڵگە بێت بۆ ئەوەی هەردووکیان لەسەر یەک تەوەر بووبێتن یان لەیەک ناوچەدا بووبێتن. دەشێت لەسەر دوو تەوەری جیا بووبێتن یان تەنانەت لە دوو ناوچەی جیاشدا بووبێتن. شەڕ کردن لە دوو بەرەی جیادا لە یەک ساڵدا هیچ کاتێک مەحاڵ نەبووە. دووەم، صیللوش-داگان توانیویەتی فەرماندەیی لەشکری دووشار یان دوو ناوچەی نزیک لەیەک بکات و لە دوو تەوەری جیاشەوە. دوایین خاڵیش، نمونەی تر هەن لەسەر کەسانێک کە پۆستی گرنگیان لە شار و ناوچەی دوور لەیک دا هەبووە، تەنانەت شوێنی دوور لەیەکیش،

وولاتە بەزیوەکانی دەوروپشتی سیمورروم کە لەساڵانی دوایی شولگی دا پەلاماردران، لە ئەستۆی 'صیللوش-داگان Ṣilluš-Dagān'ی فەرمانڕەوای سیمورورومی سەر بە ئوری سێ یەم دا بووە، بەبەڵگەیەکی تەواو لەقەڵەم دراوە لەسەر بوونی سیمورروم لەسەر یەکێک لە پێنج ڕێگاکەی مادگایان بە سیروانەوە دەبەستەوە.[115] ئەم بۆچوونە ئەقڵ گرە لەبەرئەوەی ئەم ڕێگایانە وولاتەکانی دەوروپشتیان بەیەکەوە دەبەستەوە، بەڵام پرسیارە گەورەکەی لێرەدا سەر دەردەهێنێت و ناکرێت خۆمانی لێ لابدەین سەبارەت بە شوێنی مادگایە. هەر بەڕای فرەین، مادگا دەبێت لەدەوروبەری کفری[116] یان تاوق بووبێت. سەرباری ئەمەش دەکرێت بڵێین فەرمانڕەوای سیمورروم مەرج نیە لەبەرشوێنی شارەکەی ئەم ئەرکەی پێ سپێردرابێت، بەڵکو دەشێت لەبەر ئەوە بووبێت سیمورروم تاکە شاری گەورەی ناوچەکە بووبێت و فەرمانڕەواکەشی پیاوێکی سەر بە ئور بوو.

بە کورتی، بەبۆچوونی فرەین زۆر لەوەدەچێت سیمورروم لەسەر سیروان بووبێت، لە خاڵێکدا کە یەکێک لەو ڕێگا زۆرانەی لە کفرییەوە دێن، ڕووبارەکە دەبڕێت. باشترین خاڵیش بەلایەوە قەڵای شیروانەی ئێستایە، ئەو قەڵایەی چەند سەدەیەک لەمەوپێش

---

لەمانەش 'ئەرەد-نەننا Arad-Nanna' و 'زاریقوم Zāriqum' هەر لە سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئوردا. بەلای منەوە زۆر شیاوە ئەم ناونیشانانە کۆی ئەو پۆستانە بن کە ئەو کەسە بە درێژایی ساڵانی کارکردنی لە دەوڵەت دا هەیبووە، واتە شتێکی وەک کورتە کارنامەیەک .curriculum vitae

[115] Frayne, *op. cit.*, p. 263-4.

[116] دیاری کردنی شوێنی مادگا گیروگرفتی زۆری بەدواوەیە، زۆر پێشنیاز لەم بارەیەوە کراون و بەگشتی شوێنەکەی لە ناوچەکانی نێوان کفری و تاوق و تازە خورماتو دا دادەنێن. فرەیـــن لە دوایین بابەتـــی دا ( *SCCNH* 10, p. 158) گوندی ماتیکە لە هەموویان بە گونجاوتر دەزانێت، ئەم گوندە کەمێک لە باشوری تاوقەوەیە. لە نووسینێکی پێشتری دا (On the Location of Simurrum, p. 264) کفریی بە شوێنی مادگا دەزانی. بۆ بیبلیۆگرافیی زیاتر لەم بارەیەوە، بڕوانە:

.*SCCNH* 10, p. 157-8.

لەسەرتەوقی گردێک بنیات نراوە و کەوتووەتە نزیک خاڵی بەیەک گەیشتنی ئاوی پونگلە و سیروان، "نزیک لە کارخار *Karḫar*'."[117] باوەڕیشی وایە ناوی 'کوشکی زەنگ' کە شاخێکی نزیک لە قەڵای شیروانەوەیە، لە ناوی زامبان یان زابــ(ــبــ)ــان ەوە وەرگیرابێت و پەرەی سەندبێت، هەروەها ناوی (قەڵای) شیروانە و (ڕوباری) سیروان هەردوکیان ڕەنگدانەوە و پاشماوەی ناوی سیموررومی دێرین بن: بەم شێوەیە پەرەیان سەندبێت:

**Siwurr+ān > Sirwān.*[118]

هەرچەندە پێشنیازەکانی فرەین گرنگن و شایانی لێ ووردبوونەوەی زیاترن، بەڵام لەهەندێک لەو خاڵانەدا کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کردن، قبوڵ کردنیان نارەحەتە. ئەمەش لە نرخی ئەو بۆچوونە بەبەهایەی کەم ناکاتەوە کە سیموررروم لە ناوچەی باشوری کەرکوک دیاری دەکات، لەسەر ڕۆخی سیروان و نزیک دەربەندە ستراتیجی‌یەکانی کە ڕێگاوبانەکانی ڕۆژهەڵات و باکوری دەربەندیخانیان لەژێر دەستدایە. ئێتیمۆلۆجی‌یەکەی ناوی سیموررروم کە ئەستۆر پێشنیازی کردووە لەم بارەیەوە گرنگی‌یەکی تایبەتی هەیە، بەڕای ئەو ناوەکە ڕیشەیەکی ئەکەدیی هەیە، ئەویش "*s/šimuru(m)*" ە کە واتای 'زیرە'[119]، دەبەخشێت و ئەمیش بەهەمان شێوەی ناوە جوگرافی‌یەکە لە سەردەمی بابلیی

---

[117] Frayne, *SCCNH* 10, p. 148.

کارخار بەڕای ئەم لە شوێنێکی نزیک قەسری شیرین بووە لەسەر ڕوباری ئەڵوەند و لەسەر شاڕێ ی خوراسان. لەم بارەدا یان ئەوەتا سیموررروم نزیک کارخار نەبووە، یان سیموررروم زیاتر بەلای باشوری ڕۆژهەڵاتەوە بووە.

[118] Frayne, p. 266-7.

دەبێت لەبیریشمان نەچێت ناوی شیروانــ(ــە) ناوێکی کوردی‌یە بە واتای "شوان/ مەشقدەری شێر " یان "شیر/ شمشێردوان." بەڵام سیروان ئەوەندەی من بزانم ئێتیمۆلۆجی‌یەکی دیاری لە زمانی ناوچەکەدا نیە.

[119] دەبێت ئەوەش بڵێم کە فەرهەنگەکانی زمانی ئەکەدی بۆ ئەم ووشەیە "ڕەشکە" ش وەک واتایەکی شیاوی دووەم دەدەن، بۆ نمونە بڕوانە:

کۆن دا، لە دەقەکاندا بەهەردوو شێوەی سیمورروم و شیمورروم هاتووە." لەمەش سەرنج ڕاکێش تر، 'زیـــرە' لە زمـــانـــی ئـــەکەدی دا ناوێـــکی تریشـــی هەیە کـــە 'hašmūru/ hašiʾūru' ە و بەهەمان شێوە لە ناوەڕاستی چاخی برۆنز و لە سەردەمی ئاشوریی نوێش دا ناوی ناوچەیەکی شاخاویی باکوری ڕۆژئاوای سەرووی سیروانیش بوو.[120] بەم جۆرە، ئەستۆر ناڕاستەوخۆ هەردوو ناوی 'سیمورروم Simurrum' و 'خاشـــ(ـــیـــ)ـــمو/ـــار Haš(i)mu/ar' لە ڕووی زمانەوانی‌یەوە وابەستەی یەک دەکات. ناوی خاشمار یان خاشیمورو لە سەرچاوە کۆنەکاندا هەم بە چیا و هەم بە دەربەندێکی گرنگ ناسراوە. نزیکترین و گرنگترین دەربەندێک لەم ناوچەیەدا دەربەندیخانە کە دەست بەسەر ئەو ڕێگایانەدا دەگرێت کە بەرەو بەشی باشوری دەشتی شارەزوور دەچن و وەک دەروازەی باشوری دەشتەکە وایە.[121]

---

Black, J. and A. george, N. Postgate, *A Concise Dictionary of Akkadian*, 2nd ed., Wiesbaden, 2000, p. 111.

پێویستە ئاماژەش بکەم کە ئەمە تاکە ناوی جوگرافیی بێگانە نیە کە ناوێکی ئەکەدیی هەبێت، بۆ نمونە 'کونشوم Kunšum' گەورەشاری شانشینی 'ئیتابالخوم Itaballhum' لە زاگرۆس کە بە ئەکەدی واتای "گلۆلە خوری" دەبەخشێت، شاری 'مادا کتو Madaktu' ی عیلام بە ئەکەدی واتای "ئۆردوگا (ی سەربازی)" یان "هێزی لەشکرکێشی" دەبەخشێت. جگە لەمانەش، نمونە لەسەر ناوی جوگرافی تر هەن هەر لە ناو مێسۆپۆتامیا خۆی دا کە ناوی گیا و داوو دەرمانیان هەبووە، وەک شاری 'ئەزوپیرانو Azupirānu' کە گوایە سارگۆنی ئەکەدی تیادا لە دایک بووە، واتای "زەعفەران" ی هەیە.

[120] Astour, "Semites and ....," p. 41; Nashef, *RGTC* 5, p. 122.

[121] لیڤاین Livine وای بۆ چووە کە 'خاشـــ(ـــیـــ)ـــو/ـــار' لەو خاڵەدا بوو بێت کە تیایدا سیروان لەحەمرین دەردەچێت:

Levine, L., "Geographical Studies in the Neo-Assyrian Zagros I," *Iran: Journal of the British school of Persian Studies*, XI (1973), p. 23;

ڕای ڤایدنەریش لەم بارەیەوە لەم سەرچاوەیەدا هاتووە:

Weidner, "Die Feldzüge Šamši-Adads V. gegen Babylonien," *AfO* 9 (1933-34), p. 97;

بەڵام بەلای شپایزەر Speiser و بیلەربێک Billerbeck و شترێک Streck دوە لەدەربەندیخان بووە، بڕوانە:

بەستنەوەی ناوی سیموررووم بە ناوی گیایەکەوە دەقی نووسینەکەی گەڕیدەی سەدەکانی ناوەڕاست 'مِسعَر بن المُهَلهَل' (لە سەدەی ١٠ ی زایینی دا ژیاوە)[122] مان بیر دەخاتەوە کە دەربارەی شارەزوور نووسیویەتی. ئەوەی المهلهل وتوویەتی 'یاقوت الحموی' لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا ''مُعجَم البُلدان' وەری گرتووە و بەم شێوەیە بۆمانی پاراستووە و گواستووەتەوە.[123] المهلهل گوتوویەتی "شارەزوور بە هەردوو کێوی شەعران و زەڵم بەناوبانگە کە بە قەدیانەوە جۆرە گیایەک

نەخشەی ژمارە ٦: مەودای شانشینی سیموررووم کە وا پێ دەچێت لەسەر دەستی ئیددیـــ(ـــن)-سین گەیشتبێتێ.

Speiser, "Southern Kurdistan in the Annals of ...," *AASOR* 8 (1926-1927), p. 26 and note 49.

[122] Le Strange, *The Lands of Eastern Caliphate*, p. 190.

[123] الحموی، یاقوت، معجم *البلدان*، الجزء ٣، بیروت، ١٩٨٢، ل. ٣٧٥-٦، بروانە: شهرزور. الحموی لە ١٢٢٨ ز. دا کۆچی دوایی کردووە.

دەڕوێت کە بۆ بیاوەتی باشە.[١٢٤] لێرەدا دوو خاڵمان لەبەر دەستدایە کە لەگەڵ دوو خاڵەکەی تردا یەک دەگرنەوە: ناوی کێوەکە کە لەناوی ’(خا)شیئورو *‘(Ḫa)ši'ūru* دەچێت و جۆرە گیایەک کە تا ئێستا هیچ شتێکی زیادە لە بارەیەوە ناتوانین بڵێین. بەداخەوە ناوی کێوی شەعران ئێستا بەکار نایەت، بۆیە ناتوانین جێگاکەی دیاری بکەین ئەوەندە نەبێت کە لەشاری دێرینی شارەزوور نزیک بووە و، بەهیچ شێوەیەکیش ئەوەندەی حەمرین و قەڵای شیروانە دوور نەبووە.[١٢٥] المهلهل شتێکی گرنگی تریشی تۆمار کردووە؛ گوتوویەتی شارۆباری شارەزوور ناوی ’تامیـــ/ـــورا *Tami/urā*‘ یە. هەرچەندە نیشانەکانی دەنگی لەسەر ڤاوەڵی دووەم دانەناوە و نازانین ’تامیرا‘ بووە یان ’تامورا‘ (ئەو تەنها بە ’التامرا‘ نووسیویەتی)، بەڵام بوونی سێ ڕەگەزی سەرەکیی ت–م–ر *t-m-r* گرنگە و ئاسان و ئاسان دەستنیشان دەکرێن. ئەگەر ئێمە ئەم هیدرۆنیمە[١٢٦] پێ بە پێی ڕێساکانی فۆنۆلۆجیی زمانی ئەکەدی مامەڵە بکەین، ئەوا دەشێت (*t*) ی سەرەتا لە (*s*) یان (*š*) یکی ئەکەدییەوە هاتبێت، وەک چۆن بۆ نموونە ’ *šiṭru(m)* ی ئەکەدی کە واتای "(پارچە) نووسین" دەبەخشێت بووەتە ’سطر *satru(m)*‘ بە واتای "دێڕی (ی نووسین)،" یان ’*šiql(um)*‘ ی ئەکەدی، بە واتای قورسایی و لەویشەوە یەکەی دراوی زیو ’شیقل‘ وەرگیراوە، لە عەرەبی دا بووەتە ’ثقل *ṯiql(un)*‘ و نموونەی زۆری تریش. دەنگی (ث *ṯ*) یش لە کوردی دا کە زمانی ناوچەکەیە دەبێتە (س) یان (ت)، ئەو دەنگەی کە لەناوی

---

[124] هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

[125] یەک کێو هەیە کە ناوەکەی کەمێک لە ناوی شەعران نزیک بێت، ئەویش ’شەمێران‘ە، لەبەری ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی دەستکردی دەربەندیخان، کە کەوتووەتە باشوری دەشتی شارەزوورەوە. بەڵام ئەمە هێشتا لە دڵنیایییەوە زۆر دوورە.

[126] Hydronym واتە ناوی ڕووبارو کەناڵ و دەریا و لەو جۆرانە.

تامیـــ/ـــورا دا دەبیینینەوە.[١٢٧] واتە دوور نیە و دەکرێت لەم ناوەدا ناوی شـــ/سیموررو/ـــا ببینینەوە:

*Šimurra/u > S/Šamurra > Tamurra*

ئەم بۆچوونە دەکرێت پاڵپشتیی ڕاکەی فرەینیش بکات لەوەدا کە ناوی سیروان ڕەنگدانەوەی ناوی سیموررومی دێرینە، بە تایبەتی ئەگەر ئەوە لەبەرچاو بگرین کە ڕوباری سیروان گەورە ڕوباری ناوچەکەیە و ناوی تامراش ئێستا بەکار نایەت، ئەویش ئەگەر ناوی 'تانجەرۆ' لە ناوی تامراوە نەهاتبێت.

گەڕان بەدوای تۆپۆنیمی سەردەمانی دواتردا و تەنانەت نوێشدا کە لەگەڵ ناوی کۆنی سیموررومدا یەک بێتەوە دەمانباتە سەر ناوی شارێکی خاوەن ڕابوردوویەکی شکۆدار. ئەویش شاری 'صـ/سەیمەرە *Saimarra*'یە، کەلە هەرێمی 'میهرەجان کوذەک' یان 'میهرەجان قوذەق' دا بوو کە ئێستا لە لوڕستانی پچووکە. سەیمەرە ناوی ئەو ڕوبارەشە کە بەم هەرێمەدا تێدەپەڕی.[١٢٨] هەرچەندە ئەم پێشنیازەیان ئاڵۆزترە، لەبەرئەوەی ئەم شارە دوورتر بووە، لەناو لوڕستاندا و لە باشوری ڕۆژهەڵاتی حەلوان و سەرپولەوە بووە، بەڵام شایانی لێ

---

[127] کوردی کە زمانێکە لە لقی هیندو-ئێرانی زمانە هیندو-ئەورووپی یەکان و لە هەزارەی یەکەمی پ. ز. دوە لەگەڵ هاتنی میدی یەکاندا لە ناوچەکەدایە، ڕێزمان و فۆنۆلۆجی یەکەی لەهی زمانە هیندو-ئەورووپی یەکان دەوروبەری دەچێت لەلایەنی گۆڕینی ئەو دەنگانەی ئاماژەیان بۆ کرا.

هەر لەم بارەیەشەوە نابێت ڕاستیی زمانی سەردەمی ئیمپراتۆری میتانی پشت گوێ بخەین. فەرمانڕەوایانی میتانی پێ دەچێت خۆیان بنەچەیەکی هیندو-ئەورووپی یان هەبووبێت یان لەژێر کاریگەری یەکی هیندو-ئەورووپیی بەهێزدا بووبێتن، بە بەڵگەی بوونی هەندێک ووشە و زاراوە و ناوی خواوەندانی هیندو-ئەورووپی لە هەندێک لە سەرچاوە نووسراوەکانی سەردەمی میتانی دا. واتە زمانی میدی یەکەم زمانی هیندو-ئەورووپی نەبووە کە هاتووەتە کوردستانەوە.

[128] الحموی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل. ٤٣٩. بڕوانە: صیمرە. هەروەها بڕوانە:
Le Strange, *op. cit.*, p. 202 f.

ووردبوونەوەیە. لەمەش سەرنج ڕاکێشتر، شارێکی تر هەبووە لە نێوان حەلوان و سەیمەڕەدا ناوی سیروان بووە، هەمان ناوی ڕوباری سیروان کە باسمان کرد (بڕوانە نەخشەی ژ. ٧). هەردوو شاری سەیمەڕە و سیروان لە سەدەکانی ناوەڕاست دا لە ترۆپکی گەشە و ئاوەدانی یاندا بوون و ناوەکانیان، کە ناتوانین ئێتیمۆلۆجی یەکی ڕوونیان بۆ دیاری بکەین، دەشێت لە ڕووی فۆنۆلۆجی یەوە بەجۆرێک بە ناوی سیموررومەوە ببەسترێنەوە. لەگەڵ ئەمانەدا، ناوچەی ئەم دوو شارە لە مەودای چالاکی یە سەربازی یەکانی سیموررومەوە زۆر دوور نەبووە و بوونی پەیوەندی یەک لە نێوانیاندا مەحاڵ نەبووە. نەخش و نووسینێکی پادشایەکی سیموررووم (ناسراو بە نووسینەکەی ئانوبانینی ٢) لێیانەوە نزیکە، هەر لەم ناوچەیەشدا بووەە کە ئیددیــ(ــن)-سین بەسەر خاڵمان دا سەرکەوتووە و خستوویەتی یە ژێر ڕکێفی یەوە. ناوی سەیمەڕە دەشێت ڕەنگدانەوەی ناوی دێرینی سیموررووم بووبێت، بەڵام لە ڕووی جوگرافی یەوە نارەحەتە سیموررومی دەقەکانی سەردەمی ئوری سێ یەم و سەرەتای بابلیی کۆن لە شوێنێکی وا دوورەدەستدا بووبێت لە چاو شوێنەکانی تردا کە لەو دەقانەدا ناویان هاتووە. بەڵام ئەم مەسەلەیەش شیکاری خۆی هەیە؛ دەکرێت سیموررووم کە لە ناوچەی سەیمەرە بووە، لەکاتی پەلکێشان و برەوسەندنی دەستەڵاتیدا بۆ ناوچەی خوارووی شارەزوور، کە لەوانەیە لەسەر دەستی ئیددیــ(ــن)-سین بووبێت، ناوەکەی لەم ناوچەیەش لەشارێکی نوێ نرا بێت کەلەسەر دەستی پادشایانی سیموررووم دروست کرابێت و ئاوەدان کرابێتەوە.[١٢٩]

---

[129] نمونە لەسەر حاڵەتی لەم جۆرە لە جیهانی کۆنیش و نوێشدا زۆرن، زۆر جار کەشاری نوێ بنیات نراون ناوی ئەو شارانەیان لێ نراوە کە بنیاتنەران لێیەوە هاتوون. وەک شاری نیویۆرک و هارلم لە وولاتە یەکگرتووەکان لە سەردەمی ئێستادا کە دووبارە بوونەوەدی شاری یۆرک و هارلمن لە ئەوروپا. لە جیهانی

شتێکی تریش دەشێت، سیموررومی بنە لە ناوچەی سەیمەرە بووبێت، بەڵام لەپاشدا چەقی قورسایی‌یەکەی گواسترابێتەوە بۆ ناوچەی ستراتیجیی حەلوان و سەر شارێگای خوراسان.

دوا پێشنیاریش پەیوەندی بە زابازوناوە هەیە، دوور نیە زابازونا پاش دەستەڵات گرتنەدەست لە ناوچەی ڕوباری سیروان پایتەختێکی نوێ ی بنیات نابێت و بەناوی خۆیەوە ناوی نابێت، لە پاشدا، وەک زۆر جاری تریش ڕووی داوە، ناوەکە کورت کرابێتەوە بۆ '*زابا(نـ)ـزونا *Zaba(n)zuna*.' ئەم پێشنیازەیان لە ڕووی کرۆنۆلۆجی‌یەوە لەگەڵ گۆڕینی ناوی سیموررووم بە زابـ(ـبـ)ـان لە دەقەکانی سەردەمی 'صیلي —سین *Ṣillī-Sîn*' و 'ئیلونا

---

کۆنیشدا نمونەی شاری 'نیننا *Ninna*' لە سومەر و 'نینو-وا *Ninua*' (نینەوا) لە باکور لە سوبارتو، 'ئور *Ur*' لە سومەر و 'ئورا *Ura*' لە کوردستانی ژێر دەستی تورکیا (پێ دەچێت ئورفە بووبێت). لەمانەش ڕوونتر، چەمچەماڵە کە ڕەنگ دانەوەی 'چەمچەماڵ/ جەمجەمال' ی نزیک هەمەدانە. سەرباری ئەمانەش نمونە زۆرن لەسەر مانەوەی ناوی جوگرافی کۆن لە ڕۆژگاری ئێستاماندا، وەک 'شوشەڕڕا *Šušarrā* < 'شمشارە،' 'موصاصیر*Muṣaṣir*' > 'مجێسر' (هەرچەندە ئەمەیان تەواو لەگومان بەدەر نیە)، 'ئەزیرو *Aziru*' > 'ئەزمەڕ،' 'ئەربیلوم /ئوربیلوم *A/Urbilum*' > ئەربیل' (هەولێر). هەندێک ناوی تریش هەن کە لەسەرچاوەکانی چاخەکانی ناوەڕاست دا هاتوون و لەگەڵ هەندێک ناوی سەرچاو مێخی یەکاندا لەیەک دەچن و دوور نیە ڕەنگدانەوەیان بن، لەوانە:

'کیماش *Kimaš*' دەشێت 'قومس' بووبێت، هەرێمە گەورەکەی جارانی کوردستانی ژێر دەستی ئێران، کە لە ڕووی جوگرافی یەوە زۆر لەگەڵ کیماش دا یەک دەگرنەوە.

'خارشی *Ḫarši*' لەگەڵ 'هارسین' دا زۆر لەیەک دەچن.

'گیدانو *Gidanu*' لەگەڵ '(کەرخ) جەدان،' کەرخ واتای "قەڵا" یان "حەسار" دەگەیێنێت.

'پادان *Padān*' لەگەڵ 'ماسپەذان،' لەوانەیە 'ماس' شێوە بە ئێرانی کراوەکەی 'ماه' بێت و بە واتای "وولات" بەکار دەهات، وەک 'ماه البصرة' و 'ماه الکوفة' ی سەرچاوەکانی چاخەکانی ناوەڕاست. ماه خۆیشی لە ووشەی "مات *māt*" ی ئەکەدی‌یەوە هاتووە کە واتای "وولات" و "ناوچە" ، دەبەخشێت. هەروەک چۆن ووشەی 'کورە' لە 'KUR' ی سومەری بە واتای "وولات" و "ئیقلیم" لە 'KALAM' ی سومەری بە واتای "هەرێم" وەرگیراون و لە نووسراوەکانی سەردەمانی ئیسلامی دا دەبینرێن.

‘*Iluna* ی فەرمانڕەوایانی ئێشنوننا و دواییش ’ئەپیل-سین ‘*Apil-Sîn* ی فەرمانڕەوای بابل دا تەواو دەگونجێت.

نەخشەی ژمارەی ٧: ڕۆژئاوای ئێرانی ئێستا لە چاخەکانی ناوەڕاست دا، هەرێمی کوێستان (اقليم الجبال) و تیایدا هەردەە شاری سەیمەرە و سیروان پیشان دەدات.
نەخشەکە لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراوە:

G. Le Strange, (Opposite p. 185)

ئەم قۆناغە لە شەمشی-ئەدەدی یەکەم (١٨١٣-١٧٨١ پ. ز.)ی پادشای ئاشورەوە دەست پێ دەکات، یان ووردتر بڵێین: دەتوانرێت بنووسرێت. لەسایەی ئەم پادشایەوە بڕێکی زۆر گەورە زانیاری بەسوود و بایەخداری سەردەمی فەرمانڕەوایی‌یەکەی نووسران. ئەمەش بەهۆی سیاسەتە فراوان خوازی‌یەکەی کە لە چەندین بەرەوە پەیڕەوی دەکرد، چونکە بەهۆی ئەمەوە باس و خواسی شەمشی-ئەدەد بووە بابەتی نامە ئاڵ و گۆڕکراوەکانی سەردەمەکەی، هەم هی خۆی و هەم هی دوژمن و ناحەزەکانی. ئەرشیفەکانی شمشارە و ماری نمونەی چاکی ئەمەن. ساڵانێکی زۆر بەسەر دۆزینەوەی ئەم دوو ئەرشیفەدا تێپەڕین تاوەکو بەڵگەی نووسراوی نوێی تری ئەم سەردەمە لە 'تل الرماح'[1] و 'لەیلان'[2] دۆزرانەوە. بۆ مێژووی کوردستانی ئەم سەردەمە ئەرشیفەکانی شمشارە لەهەموو ئەرشیفەکانی تر گرنگترن. پەنجەرەیەکن دەتوانین لێیانەوە بڕوانینە مێژووی ناوچەکە، زانیاریی مێژوویی و زمانەوانی و نەژادی و جوگرافی‌یانەی زۆر بەهاداریان لەخۆ گرتووە. ئەرشیفەکانی ماری ش زۆر گرنگن، چونکە فەرمانڕەوای شارەکە لەسەردەمی شەمشی-ئەدەد دا کوڕەکەی خۆی بووە و زۆرجار، لەوانەشە بەردەوام، بە نامە لە ڕووداوەکانی بەرەی کوردستان ئاگادار دەکرا.

---

[1] Dalley, S., J. D. Hawkins and C. Walker, *The Old Babylonian Tablets from Tell al-Rimah,* London, 1976.

[2] Kuhrt, *The Ancient Near East,* Vol. I, p. 85;

هەروەها بڕوانە:

Weiss, H., "Tell Leilan on the Habur Plains of Syria," *Biblical Archaeologist* 48 (1985), p. 6ff.

ئەرشیفەکانی ماری زانیاری گرنگ و هەندێک جاریش وورد سەبارەت بە پەرەسەندنە سیاسی‌یەکانی کوردستانی دێرینی پاش کۆتایی هاتنی داگیرکاریی ئاشوری لەناوچەی شمشارە بەدەستەوە دەدەن. ئەم دەمەش زۆر گرنگە چونکە ئەو دەمەیە کە تیایدا گەلانی کوردستانی دێرین، بە تایبەتی تورووککو *Turukkû* بۆ بنیات نانی داهاتووی سیاسی خۆیان جڵەویان گرتە دەست. لەهەمان کاتیشدا ئەرشیفەکانی شمشارە لەگەڵ وێران کردنی شارەکەدا ئیتر بێدەنگ بوون، بۆیە ماری نزیکەی تاکە پەنجەرەیە کە لێیەوە بتوانین تەماشای مێژووی ناوچەکەمان لەم سەردەمەدا بکەین.

## گەمەکاران:

نەخشەی سیاسی‌یانەی کوردستان لەم سەردەمەدا لە گۆشەنیگای بەڵگە نووسراوەکانی شمشارەوە بەم جۆرە بوو: میرنشین و شانشینی پچووک پچووک هەموو ناوچەکەیان گرتبووەوە، هەریەکێکیان شارێکی کردبووە پایتەختی فەرمانڕەواکەی کە لەم سەردەمەدا زۆربەیان خوری بوون. هۆزی تورووککو *Turukkû* کە یەکێک لە هۆزە خوری‌یە گەورەکان بوو، بگرە لەوانەشە یەکێتی‌یەکی هۆزایەتیی خوری بووبێت، سەرەکی ترین گەمەکاری سەردەم بوو، لەئەرشیفەکانی شمشارە و ماری دا لە لایەنەکانی تر زیاتر ناویان بەرچاو دەکەوێت. بەڵام هێشتا بوار بۆ نا-خوری‌یەکانیش مابوو، وەک گوتی‌یەکان و لوللوبی‌یەکان کە لەڕووی سیاسی‌یەوە چالاک بوون و لەگەمەی سیاسی و دەسەڵات دا ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو. هەندێک جار ناوی شوباری‌یەکانیش لە نامە ئاڵ و گۆڕکراوەکاندا هاتووە، بەڵام وەک دەردەکەوێت وەک زاراوەیەکی گشتی بۆ هەموو گەلانی کوردستان بەگشتی بەکار هاتبێت، نەک نەژادێکی دیاریکراو. لەمەش گرنگتر

هەر سەبارەت بە شوباری‌یەکان، نامەکان هەموو جارێک "پادشایانی شوبارتوم"[3] (بە کۆ) بەکاردەهێنن، ئەمە ئاماژەیەکی ترە بۆ باری یەکە سیاسی‌یە پچووکەکانی پێشتر پەنجەمان بۆ ڕاکێشا. بێگومان لەرۆژئاوای ئەمان هەموویانەوە دەوڵەتە بەهێزەکەی کە تازە شەمشی-ئەدەد دایمەزراندبوو، هەبوو. چەقی هێزی ئەم دەوڵەتە لە دەوروبەری شارەکانی ئاشور *Aššur*' و ئێکەللاتوم *Ekallātum*' و 'شوبات-ئێنلیل *Šubat-Enlil*' دا کۆ بوبووەوە. ئێشنوننا *Ešnunna*' ش لە باشوری ڕۆژهەلات و 'عیلام *Elam*' لە ڕۆژهەلات و باشوری ڕۆژهەلاتەوە بەرژەوەندی خۆیان لە ناوچەکەدا هەبوو، بە پێ ی تەرازووی هێزی ناوچەکە هەندێک جار هاوکاری هەندێک لایەنیان دەکرد و هەندێک جاری تریش شەڕیان لەگەڵ دەکردن. بۆ نمونە، ئێشنوننا لەگەڵ ماری دا هاوپەیمانی تورو ککی‌یەکان بوو، سەردەمێکیش بوو عیلام هاوپەیمانی گوتی‌یەکان بوو لەشەڕیاندا لەدژی تورو ککی‌یەکان لە 'شوشەڕڕا *Šušarrā*.' ئایدیم و لاسۆ شانشین و یەکە سیاسی‌یەکانی کوردستانی ئەم سەردەمەیان بۆ چوار جۆر دابەش کردووە:[4]

ا) ئەوانەی سەر ڕوباری دیجلە، بریتی بوون لە: 'نورڕوگوم *Nurrugum*'- ئێکەللاتوم *Ekallātum*'- ئاشور *Aššur*.'

ب) ئەوانەی دەشتی ڕۆژهەلاتی دیجلە، بریتی بوون لە: 'ئوربێل *Urbēl*'، 'قابرا *Qabrā*'- 'ئەرڕاپخە/ـــا *Arraphe/a*'- ئێشنوننا *Ešnunna*.'

---

[3] بۆ نمونە بڕوانە: "... و هەواڵەکانی پادشایانی شوبارتو..."

"*13) ù ṭ[e₄-e]m* LUGA. MEŠ *14) [ša šu-ba]-ar-tim...,*" Charpin, D., "Les Représentants de Mari à Ilân-ṣurâ," *Archives Épistolaires de Mari I/2- ARM 26*, Paris, 1988, No. 309 [M. 8722];

"حەموورابی ئاوای بە تەتەرەکانـــ[ـــی ئیشمێ-داگان] ووت: «پادشایانی شوبارتوم سەردارتیان ئاگادار کرد...»

"*61') ᵐha-am-mu-ra-bi ki-a-am iq-bi um-ma šu-<-ma>* LUGAL. MEŠ *ša m[a]-a-at šu-bar-t[i]m 62') ú-ba-nam e-li be-lí-ku-nu ta-ar-ṣu-ma ...,*" *op. cit.*, No. 384 [A. 1175].

[4] Eidem and Læssøe, *The Shemshra Archives I: The Letters*, p. 21.

ج) ئەوانەی دامێنەکانی زاگرۆس، بریتی بوون لە: ‹کوممێ *Kumme*›- ‹خابوراتوم *Ḫaburatum*›- ‹یائیلانوم *Ja'ilānum*›- ‹ئەخازوم *Aḫazum*›- ‹کاکموم *Kakmum*›- ‹شیموررروم *Šimurrum*›- ‹نامار(وم) *Namar(um)*›- ‹نیک/ــقوم *Nik/qum*›.

نەخشەی ژمارە ٨: نەخشەی هەندێک لە ناوە جوگرافییەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە لەسەردەمی ئەرشیفەکانی شمشارە و ماری دا.

د) ئەوانەی ناوەوەی زاگرۆس، بریتی بوون لە: تورووککوم *Turukkum*ʼ-

*لوللوبوم Lullubum*‘ – *گوتیوم Gutium*.‘[5]

نوررِوگوم له ناوچەکانی دەوروبەری نینەوا بوو،[6] ئێکەللاتوم یش لەسەر دیجلە بوو، نزیکەی ۲۰ کم له باکوری شاری ئاشور (قلعة الشرقاط) بوو، لەوانەیە ’تلول الهیکل‘ ی ئێستا بوو بێت.[7]

قابرا شارێک و دەولەتێکی گرنگ بوو، لەسەر رێگای نێوان ئەررِاپخە و ئوربێل (هەولێر) بوو لەبەری باکوری زێ ی خواروو.[8] ناوی قابرا له دەقەکانی نوزی دا به شێوەی ’*کاپرا Kaprā*‘[9] هاتووە و لەم دەقانەوە وا دەردەکەوێت له دوو بەشی سەرەکی پێک هاتبێت؛ قابرای گەورە و قابرای پچووک. وولاتی قابرا له لەشکرکێشییەکی هاوبەشی شەمشی-ئەدەد و ’*دادوشا Daduša*‘ ی ئێشنوننا دا گیرا.

---

[5]ئەوان عیلامیشیان لەگەڵ ئەم گروپەی دواییاندا ژماردووە، بەلام بەلای ئێمەوە عیلام زیاتر وەک هێزێکی دەست تێخەر کاریگەری له ناوچەکەدا هەبووە وەک لەوەی خۆی راستەوخۆ گەمەکار بووبێت.

سەرباری ئەمەش، هێزی تریش له ناوچەکەدا هەبوون که کاریگەرییان هەبووە و لێرەدا ناویان نەهاتووە، دیارە ناتوانین ناوی هەموویان بزانین، بەلام لەرێی جێ مۆرێکەوە ناوی یەکێک لەمانە دەزانین، ئەویش شانشینی *ئیتابالخوم*‘ە که له بەشی سێ یەمدا ئاماژەمان بۆ کرد.

[6] Yuhong, Wu, “The Localisation of Nurrugum and Ninet=Ninuwa,” *NABU* 1994/ 2, section: 38.

[7] Eidem and Læssøe, p. 21-22.

[8]سەبارەت بە شوێنی قابرا، تەماشای ئەم سەرچاوانە بکە:

Eidem, J., “News from the Eastern Front,” *IRAQ* 47 (1985), p. 84; Frayne, *SCCNH* 10, p. 166; Lewy, H., “A Contribution to the Historical Geography of the Nuzi Texts,” *JAOS* 88 (1968), p. 151.

[9] Finke, J., *RGTC*, Band 10, p. 129-130.

وێنەی ژمارە ١٩: میلی سەرکەوتنەکەی دادوشای پادشای ئێشنوننا بە بۆنەی گرتنی قابراوە، کە لە ئەنتیکەخانەی بەغدا دا پارێزراوە. سەرچاوەی وێنە:

B. Ismail, “Eine Siegesstele des Königs Daduša von Ešnunna,” *Im Bannkreis des Alten Orients,* Innsbruck, 1986.

لە نامەکانی SH 809 و SH 894 ی شمشارەوە وا دەردەکەوێت کە **کومێ** و **خابوراتوم** لە دامێنەکانی زاگرۆس دا بووبێتن، لە شوێنێکی باکوری ڕۆژئاوای شمشارەوە. نامەی یەکەمیان وێستگە و مەنزڵەکانی سەر ڕێگای شمشارە بۆ خابوراتوم دەژمێرێت، چونکە لە خابوراتوم شەمشی-ئەدەد چاوەڕوانی گەیشتنی *کوشی‌یا* ‘*Kušiya*’ ناوێکی لە شوشەڕراوە دەکرد.[10] نامەی دووەمیشیان هەر بۆ ئەوە نێردراوە *کو-واری* ‘*Kuwāri*’ فەرمانڕەوای شوشەڕرا هەمان کوشی‌یا ی ناوبراو بۆ کومێ بنێرێت تاوەکو چاوی بە شەمشی-ئەدەد بکەوێت.[11] ئەمە لەوانەیە نیشانە بێت بۆ بوونی کومێ و خابوراتوم لە شوێنێکی نزیک یان لە دەورو بەری ئێکەللاتوم کە لەم کاتەدا پایتەختی شەمشی-ئەدەد بوو.

هەمان نامەی SH 809 کە باس لە هەواداری‌یە بگۆڕەکانی *یاشـوب-ئەدەد* ‘*Jašūb-Adad*’ ی فەرمانڕەوای *ئەخازوم* ‘*Aḫazum*’ دەکات، دەکرێت هەندێک زانیاری سەبارەت بە شوێنی وولاتەکەیەوە لێ هەڵبکرێنین. بەلای ئایدیم و لاسۆ وە ئەو هێزانەی یاشوب-ئەدەد هاوپەیمانێتی لەگەڵ بەستوون دەبێت دراوسێ ی ڕاستەوخۆی وولاتەکەی بووبن. بۆیە **ئەخازوم** لە ناوچەی نێوان دەشتی ڕانیە و هەولێردا بووە[12] لە نێو توروککی‌یەکان لە باکور(ی ڕۆژهەلاتی) یەوە، شیمورری‌یەکان لە باشور(ی

---

[10] Eidem and Læssøe, No. 1, p. 70-71.

کومێ کە چەقی پەرستنی خواوەندی خوری ناسراو *تێششوپ* ‘*Teššup*’ بوو، ڕۆلیگ Röllig یش بەگشتی لە باکوری ڕۆژهەلاتی وولاتی ئاشورەوە دایدەنێت:

Röllig, W., “Kumme,” *RlA* 7 (1980-1983), p. 336.

ڤیلهێلم هەولێکی داوە ئێتیمۆلۆجی ئەم ناوە جوگرافی‌یە بدۆزێتەوە و لەو ڕێ یەشەوە واتای و پەیوەندی‌یە زمانەوانی‌یەکانی:

Wilhelm, G., “Kumme und Kumar: Zur hurritischen Ortsnamenbildung,” *Beiträge zur altorientalischen Archäologie: Festschrift für B. Hrouda zum 65 Geburtstag,* Herausgegeben von P. Calmayer, K. Hecker, L. Jackob-Rost and C. B. F. Walker, Wiesbaden, 1994, p. 315 ff.

[11] Eidem and Læssøe, No.21, p.72-73.

[12] *Op. cit.*, p. 22.

ڕۆژهەڵاتی) یەوە، شەمشی-ئەدەد لە ڕۆژئاوایەوە و کاکموم لە باشور(ی ڕۆژهەڵاتی) یەوە. جگە لەمەش جارێک یاشوب-ئەدەد لە ئەڕڕاپخە و *ئائینوم* *A'innum* کۆبوونەوەی لەگەڵ شەمشی-ئەدەد دا هەبووە، ئەو دوو شارەی کە دەبێت نزیکترین شاری ژێردەستی ئاشورییەکان بووبێتن لە ئەخازومەوە. بەڵام لەلایەکی تریشەوە ئەمە لەسەدا سەد نیە، چونکە نمونەش هەن لەسەر هاوپەیمانی نێوان هێزی وا کە لەسەر زەوی دوور لەیەک و لەیەک دابڕاو بوون، وەک ئەوەکەی نێوان خەمازی و ئێبلا. جگە لە شاری *شیکشابوم* *Šikšabbum*ی پایتەخت، ئەخازوم دووشاری تریشی هەبووە، ئەوانیش *ئیککالنوم* *Ikkalnum* و *تاروم* *Tarum* بوون.[١٣]

**یائیلانوم** یەکەیەکی سیاسیی تری ئەم سەردەمە بوو کە لەدەشتی هەولێردا، لە نزیک قابرا بوو. لەوە دەچێت ناوەکەی لە ناوێکی کەسیی ئاموریەوە هاتبێت، بۆیە زۆر جار نیشانەی ناساندنی (=Determinative) ناوی کەسی دەخرایە پێش ناوەکەیەوە. فەرمانڕەواکەی لە سەردەمی ئەرشیفەکانی شمشارەدا ناوێکی ئاموری هەبوو، کە دەشێت بە دوو جۆر بخوێندرێتەوە: *بەنی-ئەددو* *Beni-Addu* کە شێوە ئاموریەکەیەتی، یان *مار-ئەدەد* *Mār-Adad*[١٤] کە شێوە ئەکەدی-ئاشوریەکەیەتی. شارە سەرەکیە ناسراوەکانی *توتاروم* *Tutarum* و *خیمارا* *Ḫimara* و *دور-یائیلانوم* *Dūr-Ia'ilānum* بوون.

**کاکموم** و **شیموررووم** پێشتر لە بەشی پێشوودا باسی شوێنەکانیان کرا. ناوی یەکێک لە پادشایانی کاکموم لەم سەردەمەدا دەزانین، ناوی خوریی *موشکاوێ* *Muškawe*ی

---

[13] *Ibid.*

نامەی *ARM 169+, 5-35*ی کە لە ماری دۆزراوەتەوە بە ڕوونی دەڵێت: "شاری ئیککالنوم کە لە وولاتی ئەخازومە،" بۆ ئەم نامەیە بڕوانە:

Eidem and Læssøe, p. 51.

[14] *Op. cit.*, p. 23.

هەبووە. نامەیەکی شمشارە بۆ پادشایەکی شیمورروم نێردراوە و ناوەکەی بەداخەوە نەماوە، پاشماوەی ناوێکی لەسەر لەوحەکە ماوە کە 'تو-... ...-Tu'[15] ە، بەڵام ناتوانین تەواو دڵنیا بین ئەمە ناوی پادشا خۆیەتی یان یەکێک لە ئەندامانی دەرباری بووە، چونکە نازانین نامەکە پادشا ناردوویەتی یان نا.

لە باشورەوە وولاتانی **نامار(وم)** و **نیک‌ـ/ـقوم** هەبوون. یەکەمیان زۆر پێ دەچێت لەسەر شارێ ی خوراسان بووبێت، لەوانەیە لەدەورەبەری خانەقینی ئێستا.[16] دووەمیشیان لەوانەیە لە ناوچەی سیروان بووبێت، لە نزیک 'توپ‌ـ/ـگلیاش *Tup/gliaš*' لە باکوری نامارەوە لە سیروانی ژوورو.[17]

**توروککی‌یەکان** چەند هۆزێکی خوری ڕەگەز بوون، لە ناوچە کوێستانی‌یەکانی باکور و باکوری ڕۆژهەڵاتی دەشتی ڕانیەدا نیشتەجێ بوون و یەکێک لە گەمەکارە سەرەکی‌یەکانی ئەم سەردەمە بوون. ئەم توروککی‌یانە کە لەدیدی مێسۆپۆتامیایی‌یەکانەوە خەڵکانی کەنار و دوورەدەست بوون،[18] بەباشی لە زنجیرەیەک شانشین دا خۆیان ڕێک

---

[15] *Op. cit.*, p. 24.

[16] تێبینی بکە فرەین نیکوم لەدەوروبەری خانەقین دادەنێت، نەک نامار(وم)، بڕوانە:

Frayne, *SCCNH* 10, p. 151.

[17] Röllig, W., "Niqqu(m)," *RlA* 9 (1998-2001), p. 569.

هەروەها بڕوانە:

*RGTC* Band 1, p. 133,

بەپێ ی ئەم سەرچاوەیەی دوایی‌یان کە پشت بە ووتەی فایدنەر دەبەستێت، ئەم وولاتە بەشێک لە توپلیاش بووە.

[18] Klengel, H., "Das Gebirgsvolk der Turukkū in den Keilshcrifttexten altbabylonischer Zeit," *Klio* 40 (1962), p. 5.

کلێنگل بە *Randvölker* ناویان دەبات.

هەروەها بڕوانە:

Lafont, B., "La Correspondence d'Iddiyatum- Introduction," *Archives Épistolaires de Mari I/2, ARM 26,* p. 469.

خستبوو و پادشایانی خوری ناو فەرمانڕەوایی‌یان دەکردن. ئەم پادشایانە، هەر یەکێکیان لە پایتەختی خۆی دادەنیشت و لەگەڵ یەکتری هاوپەیمان بوون،[19] بەهەموویان یەک "پادشای مەزن" یان هەبوو کە پادشای گەورەترین و بەهێزترینی ئەم شانشینانە بوو، ئەم "پادشای مەزن" ە *تەلپوشەڕڕی Talpušarri*‘[20] بوو و پایتەختەکەی شاری *کونشوم* *Kunšum*‘ بوو. ئەم ڕاستی‌یە لە نامەکانەوە دەردەکەوێت کە تیایدا بە "باوک"ی نامەبۆنووسراوەکان ناوزەد کراوە.[21] تەنانەت کو-واری و دەستەو دایەرەکەشی توروککی بوون، چونکە لەجیاتی "ئێوە" ی نامەی SH 809، لە نامەی SH 894 دا "توروککی" نووسراوە،[22] LÚ *ti-ru-ki-i* نامەیەکی تریش باسی زەوی‌یەکانی کو-واری لە دەرەوەی شوشەڕپا دەکات، لە شوێنێک کە ناوی *زوکولا Zukula*‘ بووە و *تێنتوری Tenturi*‘ ناوێک بەڕیوەی بردوون، کە لەوانەیە کوڕە گەورەی خۆی بوو بێت.[23] ئەمە بەڵگەیە کە کو-واری لە بنەڕەتدا خەڵکی دەرەوە بووە، نەک خەڵکی

---

[19]بۆ نموونە تەماشای ئەو هاوپەیمانێتی‌یە بکە کە چەند پادشایەکی توروککو (؟) سوێندیان بۆ خوارد و هەواڵەکەی لە SH 812 دا تۆمار کراوە.

[20]لەسەردەمی کو-واری دا پادشای مەزن دیارە تەلپوشەڕڕی بووە، ئەمەش بە نامەی ژمارەی ژمارە SH 811, 1. 30-32 دا دەرکەوتووە کە دەڵێت: ".. و ئەگەر هەموو وولاتەکان کە بە فەرمانی تەلپوشەڕڕی هەڵدەسووڕێن..." بەڵام *'پیشتینڕین'* ی *'تیتابالخوم'* یش پادشایەکی مەزن بووە، یان هیچ نەبێت یەکێک لەم پادشا مەزنانە بووە.

[21]Eidem and Læssøe, p. 26.
[22] *OP. cit.*, p. 25.
[23] *Op. cit.*, p. 36; and SH 822.

تێبینی بکە تێنتوری ناوی ئەم شوێنەی بە *'زیگولا Zigulā'* نووسیوە، ئەم ناوەش ناوی *'زیگولائێ* Zigulae'مان یاد دەهێنێتەوە کە ناوێکی کەسی نامەکەی سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی ئوورە و بە فەرمانڕەوای سوبارتو ناوی هاتووە، بڕوانە:

Gelb, *HS*, p. 19 and 38.

بەڵام میشالۆفسکی لەم ساڵانەی دوایی دا ئەم ناوەی بە شێوەیەکی تر خوێندەوە و بەلای ئەوەوە دەبێت *'زینوم Zinum'* بێت:

Michalowski, *The Royal Correspondence of Ur*, p. 255.

شوشەڕپا.[٢٤] لە هەموو ئەمانەوە هەڵدەهێنجرێت کە توروککیی‌یەکان کۆچەری یان نیمچە کۆچەریی کوێستان نشین نەبوون وەک هەندێک لە توێژەران بۆی چوون،[٢٥] بەڵکو زیاتر لە دراوسێ گوتی و لوللوبی‌یە نیشتەجێکانیان دەچوون. نامەیەکی تری شمشارە SH 810 بە ڕوونی ئاماژە بۆ زەویی تەلپوشەڕری لە ئوتوم و گۆڕینەوەی بەشێکی بە تۆتیا لە شوشەڕرا دەکات. زەوی‌یەکانی تەلپوشەڕری لە ئوتوم و هی کو-واری لە زوکولا سیستەمی فیودالیی نوزی و *ئەلالاخ* *Alalaḫ* (ئەلالاخ شارێکی خوری بوو لە باکوری ڕۆژئاوای سوریای ئێستا) بەبیر دەهێننەوە.[٢٦] وولاتی توروککیی‌یەکان بە هەموو بارێکدا هەر لەوە دەچێت لە شاخەکانی باکور و باکوری ڕۆژهەڵاتی شوشەڕرا بوو بێت، بەڵگەی ئەمەش بەکارهێنانی زۆری "هەڵگەڕان" لە شوشەڕراوە و "داگەڕان" بۆ شوشەڕرایە کە لە نامەکانی شمشارەدا هاتوون:

*"adi atta teliām"* (SH 812, l. 46);
*"u atta itti ṣuḫārīka eliām"* (SH 812, l. 51-52);[٢٧]
*"⌜ṣābum⌝ ša ur*[*ad*]*akkum"* (SH 829, l. 39).

لەبەر ڕۆشنایی ئەم زانیاری‌یانەدا هەندێک هەن ناوچەی حەوزی ورمێ بە شوێنێکی گونجاو بۆ وولاتی توروککیی‌یەکان دەزانن،[٢٨] بەڵام بەڕای ئێمە دەشێت لە ناوچەی ڕانیە

[24] SH 826.

[25] بۆ نمونە بڕوانە:

Groneberg, *RGTC* 3, p. 241; Læssøe, J., *People of Ancient Assyria (PAA)*, London, 1963, p. 70.
[26] Eidem and Læssøe, p. 37.

[27] هەروەها بڕوانە نامەکانی:

SH 858, 10; SH 810, 39; SH 801, 13; SH 811, 12; 33; SH 827, 36; 40, SH 804, 6, 11, 14.
نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت کە فرمانی *elûm* جگە لە واتای یەکەمی، بە واتای "سەروو چوون بۆ لای دەستەڵاتێکی بەرزتر" یش بەکاردێت. بەڵام ئەم واتایەی لێرەدا زیاتر لەوە دەچێت بەرەو ژوور بوونەوە بێت بۆ چیاکان.

[28] Eidem and Læssøe, p. 28.

نزیک تر بووبێت، له ناوچه شاخاوی‌یه‌کانی ده‌ورووپشتی قه‌لادزێ و ڕانیه خۆی، به تایبه‌تی که ناوچه‌ی جه‌وزی ورمێش وه‌ک ڕانیه ده‌شتایی‌یه.

**لوللوبی‌یه‌کانی** ئه‌م سه‌رده‌مه، هه‌روه‌ک له نامه‌کانی شمشاره‌وه ده‌رده‌که‌وێت، له شانشینه‌کانی تری ناو دۆله‌کان جیا بوون.[۲۹] ئه‌مان به ناو دۆله‌کانی ناو کوێستانه‌کاندا پرش و بلاو بوبوونه‌وه و له ناوچه چیایی‌یه سه‌خته‌کاندا یه‌که‌ی سیاسی‌یانه‌ی پچووک پچووکیان هه‌بوو. له نامه‌کانی شمشاره‌وه تێ ده‌گه‌ین که پاراستنی ئاشتی و به‌رده‌وامی دان به په‌یوه‌ندیی باش له‌گه‌ڵ سه‌رداران و پادشایانی لوللوبی‌یه‌کاندا، بۆ دابین کردنی گه‌یشتنی به‌رده‌وامی دانه‌وێڵه بۆ شانشینه توروککی‌یه‌کانی ده‌وروبه‌ری شوشه‌ڕا ئێکجار گرنگ بووه.[۳۰] به‌لام ئه‌م نامانه ده‌ری ناخه‌ن ئایا لوللوبی‌یه‌کان خۆیان به‌رهه‌م هێنی دانه‌وێڵه بوون یان ڕێگاو بانه‌کانی گه‌یشتنی‌یان به‌ده‌ست بووه. نامه‌یه‌ک هه‌یه ناوه‌ڕۆکه‌که‌ی ته‌واو ڕوون نیه، پێده‌چێت باسی سه‌رکه‌وتنێکی لوللوبی‌یه‌کان بکات به‌سه‌ر ئێشنونادا، ڕه‌نگه له‌و کاته‌دا که ئیشنوننا هاوپه‌یمانی شه‌مشی-ئه‌ده‌د بوو.[۳۱] ئه‌گه‌ر ئه‌مه وابووبێت، ئه‌وا به‌ڵگه‌ی هێزو ده‌ست ڕۆیشتوویی لوللوبی‌یه‌کانه له‌م سه‌رده‌مه‌دا. **گوتی‌یه‌کان** یه‌کێک له زلهێزه کاریگه‌ره‌کانی ناوچه‌که بوون له سه‌رده‌می ئه‌رشیفه‌کانی شمشاره‌دا. به‌فه‌رمانده‌یی ئیندوششێ *Indušše*ی پادشایان هه‌ره‌شه‌یه‌کی ئه‌وه‌نده گه‌وره بوون بۆ شانشینه

---

[29] *Op. cit.*, p. 30.

[30] بۆ نمونه بروانه:

SH 812; SH 827.

[31] Ziegler, N., "L'armée,- quell monster!," *NABU* 4: *Florilegium marianum* (1997), p. 145-146.

به‌داخه‌وه ناتوانین به‌ته‌واوی له وه‌رگێڕانی ده‌قه‌که دڵنیا بین، کامیان له‌شه‌ڕه‌که‌دا سه‌رکه‌وتوو بووه و کامیان به‌زیو. نامه‌که ته‌نها ئه‌وه‌نده‌ی تیادایه که ده‌ڵێت:

"*da-am$_7$-di-im ša* LÚ *èš-nun-na$^{ki}$*" (l. 4)

له‌گه‌ڵ:

"*da-am$_7$-di-im ša Lu-ul-li-im*" (l. 11).

توروككی‌یەكان كە پاڵی پێوەنان ئەو هاوپەیمانێتی‌یە لەنێوان خۆیاندا مۆر بكەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی گوتی‌یەكان كە لەنامەی SH 812 دا باسی كراوە. بەڵام وادیارە ئیندوششێ لەوە دڕ تر و جەربەزە تر بووە كە بەری پێ بگیرێت، چونكە هەروەك لەپاشتردا دیبینین، توانیویەتی توروككی‌یەكان ببەزێنێت.

شانشین و میرنشین و شارەكانی تری كە لە لەوحەكانی شمشارەدا باس كراون و ڕۆڵیان لە بەسەرهاتە سیاسی‌یەكاندا هەبووە، لە ڕێی سەرچاوەی ترەوە نەناسراون بۆیە زۆر نارەحەتە شوێنەكانیان دیاری بكەین. لەمانەش شانشینی زوتلوم **Zutlum**[32] كە ناوی سوپاسالارەكەی 'بێردیگێندائێ *Berdigendae*' پارێزراوە و پادشاكەی وادیارە 'كیگیرزا *Kigirza*' بووە؛ كوسانارخوم **Kusanarḫum**[33] كە پادشاكەی 'ناششومار **Naššumar**' بووە؛ 'شودامێلوم **Šudamelum**'[34] و شارەكانی ئالیائێ **Aliae**[35]، ئاردامێكوم **Ardamekum**[36]، ئیلالائێ **Ilalae**[37]، 'شاشخارشوم **Šašḫaršum**'[38] و 'زوكولا **Zukulā**'[39] شایانی باسە كە كونشوم **Kunšum**' لەگەڵ كونزوخخێ *Kunzuḫḫe*' یان كوشوخخێ *Kušuḫḫe*' ی دەقەكانی نوزی بەیەک دەزانرێت و هەندێک بە وڵاتی كاشی‌یەكانی تێ دەگەن.[40]

---

[32] SH 818, 14; SH 820, 38; SH 819, 14; SH 811, 8, 11; SH 812, 16.
[33] SH 818, 14?; SH 812, 5, 7, 12, 19; SH 868, 5.
[34] SH 812, 19.
[35] SH 812, 8.
[36] SH 829, 36.
[37] SH 812, 5.
[38] SH 813, 4.
[39] SH 811, 16; SH 822, 31.
[40] Eidem and Læssøe, p. 28.
سەبارەت بە ناوە جوگرافی‌یەكانی *kuššu(ḫḫe)*، *kunzu(ḫḫe)* و *kuzzu(ḫḫe)* و پەیوەندی‌یان بە وڵاتی كاشی‌یەكانەوە، بڕوانە:

Finke, *RGTC* 10, p. 160-2,

و هەروەها بیبلیۆگرافیاكەی سەبارەت بەم بابەتە.

## کرۆنۆلۆجی:

دارشتنەوەی کرۆنۆلۆجی‌یەکی وورد و دروستی ڕووداوەکان کارێکی ئاسان نیە، بەڵام ئایدیم Eidem بە پشت بەستن بە سەرچاوە و دەقەکانی شمشارە و ماری تاڕادەیەکی زۆر لە دارشتنی کرۆنۆلۆجی‌یەکی پێشهاتەکانی ئەم سەردەمەدا سەرکەوتووە.[41] کارێکی گونجاوە کە ئایدیم ئەو سەردەمەی ئەرشیفەکەی شمشارەی تێدا نووسراوە و باسی دەکات، بەسەر سێ دەمدا دابەش کردووە: ١) دەمی پێش-ئاشوری، ٢) دەمی باڵادەستیی ئاشوری و ٣) دەمی پاش-ئاشوری. نامەکانی شمشارەش بە پێی ناوەڕۆکیان و ئەو بەسەرهاتانەی باسیان دەکەن دەشێت دابەش بکرێنە سەر دوو دەمی سەرەکی. دەمێکی زووی نامەگۆڕینەوەی ناوخۆی نێوان سەردارانی زاگرۆس و کو-واری، ئەمجا پاش ئەو، دەمێکی دواتر کە تیایدا شوشەڕا بووە هەرێمێکی ژێردەستی شەمشی-ئەدەد. ئەم ژێردەستی‌یە زۆر لەوە دەچێت لە لیمو *līmu*[42] ی *ئەسقودوم /ئاشور-مالیک*

---

[41]بۆ ئەمە بڕوانە:

Eidem, J., "News from the Eastern Front: The Evidence from Tell Shemshāra," *IRAQ*, p. 88 ff.

[42]لیمو لەلای ئاشوری‌یەکان پۆستێکی دەوڵەتی بووە کە هەرساڵەو کاربەدەستێکی گەورەی دەوڵەت دەیگرتە دەست و ساڵەکە بەناوی ئەوەوە ناودەنرا و بەو جۆرە مێژوو دیاری دەکرا. بۆ ئەمەش دەوڵەت لیستی ئەم لیموانەیان هەبوو و خۆشبەختانە هەندێکی بەدەست گەیشتوون و لە ڕێیانەوە مێژووی ڕووداوەکانی سەردەمی ئاشوری دەزانین. بۆ نمونە وەک لێرەدا دیارە زانیومانە کە لیموی ئاشور-مالیک (ئەمە ناوی ئەو کاربەدەستەیە و واتای ناوەکەی: 'خواوەند ئاشور ئامۆژگارە' دەبەخشێت) بەرامبەر ساڵی ١٧٨١ ی پ.ز.ە. دەبێت تێبینی بکەین کە هەندێک ناوچە زنجیرە لیموی خۆیان هەبووە و جیابووە لەوەی ئاشور خۆی، بۆ نمونە لە ناوچەی ماری. لیمو لە ئەدەبیاتی ئەسیریۆلۆجی‌یانەی هاوچەرخدا بە Eponymy ناسراوە.

*Asqudum/Aššur-mālik*' (لە دەوروبەری ١٧٨١ پ.ز. دا) بووبێت.[٤٣] دەمی یەکەم کورت بوو بە چەند مانگێکی کەمی بەهار مەزەندە دەکرێت، هەرچەندە چەند نامەیەکی کەمی کۆنتر بە چەندساڵێکیشیان تێدایە.[٤٤] بەڵام دەمی دووەم درێژترەو ڕووداوەکانی باسی دەکەن بەدرێژایی هەردوو ٢٨ هەمین و ٢٩ هەمین ساڵی فەرمانڕەوایی شەمشی-ئەدەد دا دابەش بوون.[٤٥] جێگای سەرنجە کە ناوەکانی لە نامەکانی دەمی یەکەمدا تۆمارکراون، هەم ناوی کەسی و هەم ناوی جوگرافیش، جیاکەرەوەیەکیان تێدایە پێدەچێت سیمایەکی ئەو زمانە خوریيە بووبێت کە لەم ناوچەیەدا قسەی پێ کراوە، هیچ نەبێت لەم سەردەمەدا. ئەم جیاکەرەوەیەش لکاندنی *e*- یەکە بەو ناوانەوە کە بە -*a* کۆتاییيان دێت، وەک:

*Šušarrāe* (SH 827, l. 26), *Qabarae* (SH 827, l. 9), *Ugutlae* (SH 811, l.13), *Ilalae* (SH 812, l. 5), *Berdigendae* (SH 812, l. 15), *Aliae* (SH 812, l. 8)[٤٦]

ڕوونە کە ئەم شێوە ناوانە شێوە ڕاستە ڕەسەنەکانی ناوەکان بوون و لەم نامانەدا بەڕاستی و ڕەوانی نووسراون، چونکە لەلایەن کەسانی وەک '*شێپراتو Šepratu*' و '*تێنتوری Tenturi*' وە نووسراون کە زمانی زگماکیان زمانی ناوچەکە بووە.

بڵاوکردنەوەی دەقی گرنگی 'کرۆنیکلی ئێپۆنیمەکانی ماری Mari Eponym Chronicle (MEC)' لە لایەن بیرۆ Birot وە بۆ دیاریکردن و بەدوای یەکدا ڕیز کردنی زۆر لە ڕووداوەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایی شەمشی-ئەدەد یاریدەدەر بوو.[٤٧]

---

[43] Eidem and Læssøe, p. 16; 34.
[44] *Op. cit.*, p. 34.
[45] *Op. cit.*, p. 16.
[46] تاکە نموونەی ناوێکی لەم جۆرە کە لە نامەی بێگانەیەکدا هاتبێت '*ئیگیلیشتائی Igilištae*' یە کە لە نامەکەی شەمشی-ئەدەد دا بۆ کو-واری (SH 887, l. 42) هاتووە.
[47] Birot, M., "Les Chroniques "Assyriennes" de Mari," *MARI* 4 (1985), p. 219 ff.

## دەمی پێش-ئاشوری:

لەم دەمەدا شوشەڕرا، کە پایتەختی وولاتی ئوتوم *Utûm*[48] بوو، هەرێمێکی سەر بە شانشینی توروککی بوو. فەرمانڕەوای شوشەڕرا لەم کاتەدا کو-واری *Kuwāri* ناوێک بوو[49] کە برێکی باش ئۆتۆنۆمی و سەربەستی خۆیی هەبوو. زۆر لەوە دەچێت فەرمانڕەوایەک یان میرێک[50] بووبێت کە بەناوی پادشای توروککی‌یەوە فەرمانڕەوایی

---

[48]بۆ نمونە بڕوانە SH 827, l. 25-26: "بۆ ئەوەی بەڵکو (ئیتر) بەرامبەر وولاتی ئوتوم و شاری شوشەڕرا دۆستانە بجولێنەوە." بۆ ئەم نامەیە بڕوانە:

Læssøe, J., "IM 62100: A Letter from Tell Shemshara," *Studies in Honour of B. Landsberger on his 75th Birthday,* Chicago, 1965, p. 193,

لەم دوایی‌یانەدا لەلایەن ئایدم و لاسۆ وە جارێکی تر بڵاو کراوەتەوە و لە کتێبە نوێ یەکەیاندا ژمارە ٦٤ ی وەرگرتووە. نمونەی تریش لەسەر ئەم خاڵە لە نامەی SH 812, l. 50:

Læssøe, "The quest for the country of *Utûm," *JAOS* 88 (1968), p. 122,

لە کتێبەکەی ئایدم و لاسۆ دا ژمارە ٦٣ ی وەرگرتووە. هەر دەقی SH 825 کە لە هەمان ئەم بابەتەی سەرەوەدا هاتووە ئاماژەیەکی گرنگی تیادایە، باسی کۆکردنەوەی هێزو لەشکر دەکات لە شوشەڕرا و شوێنی ترەوە، پاشان لە کۆتایی دا، لە پشتی لەوحەکە، کۆی هێزەکانی داوە و نوسیویەتی کۆی هەموویان ٥٠٠ چەکدار لە وولاتی ئوتومەوە. بەڕوونی دەری دەخات کە شوشەڕرا شارێکی وولاتی ئوتوم بووە. دیسان هەر لە هەمان بابەت دا لاسۆ ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە فینێ Finet شاری بوروڵلوم *Burullum* ی بە پایتەختی وولاتەکە زانیوە، بڕوانە: *Ibid*. بەڵام بەڕای ئێمە ئەگەر ئەم ڕاست بێت، ئەوا دەشێت تەنها پاش وێران کردنی شوشەڕرا بووبێتە پایتەخت. ڕەنگە بوروڵلوم هەمان بورالی *Burali* بووبێت کە لە نووسینێکی ئەدەد-نیراری *Adad-Nirari* ی سێ یەم (٨١٠-٧٨٣ پ.ز.) دا پێکەوە لەگەڵ هەولێردا ناویان هاتووە، واتە ئەم دووانە پێدەچێت لەیەک نزیک بووبێتن. بۆ ئەمە بڕوانە:

Falkner, M., "Studien zur Geographie des alten Mesopotamien," *AfO* 18 (1957-58), p. 7.

[49]ئەم ناوەش لەوە دەچێت خوری بێت، سەبارەت بەناوەکەی بڕوانە:

Læssøe, *The Shemshāra Tablets,* Copenhagen, 1959, p. 29, notes 30 and 31.

[50] Eidem, J., "*nuldānum/ nuldānūtum-* A Note on Kingship in the Zagros," *NABU* 1990, No. 63.

کردبێت. پادشای توروککیی‌یەکان لەم کاتەدا *تەلپوشەڕری Talpušarri* بوو و شاری *کونشوم Kunšum* پایتەختی بوو. دەشێت ئەمە ئەو بگەیێنێت کە شانشینی توروککی لەم کاتەدا لەلای ڕۆژئاواوە هاوسنووری شانشینی قابرا بووە، بۆیە *شێپراتو Šepratu*، کە یەکێک لە پادشایانی توروککیی چیاکانی ئەو نزیکانە بوو، هەموو خەمی ئەوە بوو بزانێت هەنگاوی داهاتووی شەمشی-ئەدەد پاش گرتنی قابرا چی‌یە. ئەم خەم خۆری و دڵەڕاوکێ یە بە ڕوونی لە نامەیەکی‌دا کە بۆ کو-واری ی ناردووە (SH 812) دەردەکەوێت کە تیایدا دەپرسێت:

"دەبێت بزانیت نیازی شەمشی-ئەدەد چی‌یە، ئەگەر نیازی وابوو بەلایەکی تردا بچێت و خەمی وڵاتی ئوتوم مان نابێت..."[51]

لەهەمان نامەوە دەردەکەوێت کە فەرمانڕەوایی کو-واری و بوونی دەستەڵاتی توروککیی‌یەکان لە وڵاتی ئوتوم دا شتێکی نوێ نەبووە، بەڵکو پیشانی دەدات کە خۆی و بنەماڵەکەی دەمێک بووە لەوێ فەرمانڕەوا وکاربەدەست بوون:

"بۆ هەتا هەتایە دەمان لێ دەکەنەوە (ووشە بە ووشە: دەنگ هەڵدەبڕن)[52] و دەڵێن: وا ئەو (واتە: کو-واری) ئاوای کرد، ئەوەی

---

لە دەقەکاندا پۆستی کو-واری بە پادشا یان میر نەنووسراوە، بەڵکو بە *نولدانوم nuldānum* نووسراوە. ئایدیم ئەم زاراوەیەی بە پشت بەستن بە بەڵگەی ناو دەقەکان و شـــی کردنەوەی خۆی بـــە 'Prince' یان 'Duke' وەرگێراوە.

[51] "*39) ù at-ta wa-ar-ka-at ᵐsa-am-si-ᵈ*IM *40) pu-ru-ús-sú-ma šum-ma ul-li-iš pa-ni-šu 41) iš-ta-ka-an-ma ni-sa-tum a-na ma-at 42) ù-te-emᵏⁱ la i-ba-ši,"* Eidem and Læssøe, No. 63.

[52] بە وەرگێرانی ووشە بە ووشە مەبەستمان لە وەرگێرانی دەقەکەیە وەک خۆی چۆن لە دەقەکەدا هاتووە، نەک وەرگێرانێکی ئازادی واتاکەی. ئەمە بەرامبەر 'Literary translation=الترجمة الحرفية' یە.

که باوو باپیرانی *نُولدانوتوم* **nuldānūtum** یان کردووه..."[٥٣]

هەرچەندە کو-واری، وەک ئاماژەمان بۆ کرد، شوشەڕڕایی نەبوو بەڵکو بێگانەیەک بوو لە لایەن پادشای توروککو وە کرابووە نولدانوم ی ناوچەکە.

یەکێک لە ئەرکە سەرەکی‌یەکانی کو-واری وادیارە دابین کردن و گەیاندنی دانەوێڵە بووە بۆ سەروەرە توروککی‌یەکەی. ئەمە لە نامەکانی دەمی یەکەمەوە هەڵهێنجراوە کە تیایاندا بەردەوام داوای دانەوێڵەی لێ دەکات و پێ ی دەڵێت لە پێناوی ئەمەدا لەگەڵ "پادشایان" ی لوللو دا ئاشتی بچەسپێنێت. ئەگەر بزانین ئەم بەشەی کوردستان تا ئەو سەردەمەش کە کشتوکاڵ دەکرا و دانەوێڵە دەچێنرا، پشتی بە دانەوێڵەی ئەم سێ دەشتەی سندی و ڕانیە و شارەزوور دەبەست (بڕوانە بەشی یەکەم)، ئەوا ناوەڕۆکی ئەم نامانەمان بەلاوە سەیر نابێت.

پەیوەندیی نێوان توروککی‌یەکان و زنجیرێکی تری ناوچەکە لەم سەردەمەدا، واتە گوتی‌یەکان، دۆستانە نەبوو. هەردوو لا نێوانیان خراپ بوو و گوتی‌یەکان تا ئەو کاتەی نامەی ژمارەی SH 812 ش بۆ کو-واری نووسرا، سێ ساڵ بوو گەمارۆی پایتەختەکەی تەلپوشەڕڕی یان دابوو. لەم نامەیەدا هەواڵی بەستنی هاوپەیمانی‌یەکی گەورەی نێوان توروککی‌یەکان و ڕێک خستنەوەی سوپاکانیان بە کو-واری ڕاگەیەنراوە. ئەو هاوپەیمانی‌یە بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئیندوشش ی پادشای گوتی بوو، هەر بۆیەشە لە نامەکەدا هانی کو-واری یان داوە بەلایەنگیریان بمێنێتەوە.

[53] "*53)* KA-*šu-nu ur-ra-am 54) ši-ra-am i-te-bu-ma ki-am i-qa-bu-ú 55) um-ma šu-nu-ma šu-ma ki-a-am i-te-pè-eš 56) ša a-bu-šu ú a-bi a-bi-šu nu-ul-da-nu-tam 57) i-pu-šu*...," Eidem and Læssøe, No. 63.

سەبارەت بە زاراوەی *nuldānūtum* بڕوانە:

Eidem, J., "*nuldānum/ nuldānūtum- ...*" *NABU* 1990/ 2, No. 63; Kupper, J.-R., "Zaziya, «prince» d'Itabalhum," *NABU* 1990/4, section 131.

کۆبوونەوەی تەلپوشەرِری لەگەڵ سەرانی تری توروککیدا لە شاری ئالیائێ *Aliae* بووە، لەو شوێنەی لایەنی نوێ ی تریش ئامادەبوون و هاتوونەتە هاوپەیمانییەکەوە:

"بە کو-واری بلێ: 'شێپراتو *Šepratu*' ی برات وا دەڵێت: 'زوزوم

*Zuzum*'، خانیزاروم Hanizarum[54] ی 'ئیلالائێ *Ilalae*'[55] کە بۆ 'کوسانارخوم*Kusanarhum*' نێردرابوو، هات و لەگەڵ خۆی دا پادشای کوسانارخومی بۆ ئیلالائێ هێنا. لەگەڵ 'کیگیرزا *Kigirza*' و تەلپوشەرِری دا کۆبووەوە و سۆێندی گەورەیان بۆ یەک خوارد. پادشای کوسانارخوم، 'ناششومار *Naššumar*' و کورەکانـــ(ـــی)، 'تاروگور *Tarugur*' (و) 'شورتی *Šurti*' لەگەڵ ۳۰۰۰ چەکداردا دێن؛ 'بێردیگێندائێ *Berdigendae*' ی سوپاسالاری 'زوتلوم *Zutlum*' بە لەشکرەکەیەوە بۆ کونشوم دێت و، کیگیرزا بە لەشکری خۆیەوە و لەشکری کوسانارخوم و 'شودامێلوم *Šudamelum*' دوە بۆ گەمارۆدانی ئەرروونوم

---

[54]خانیزاروم زاراوەیەکە کە تەنها لەم دەقانەی شمشارەدا هاتووە و تا ئێستاش بەتەواوی روون نیە واتای چییە و لە چییەوە هاتووە. ئەوەندە هەیە کە دیارە جۆرە پۆستێک بێت یان زیاتر لەوە دەچێت پلەیەکی سەربازی بێت. لاسۆ بە دووری نازانێت ئەمە شێوەیەکی بە ئەکەدی کراوی ووشەیەکی خوری بێت. لە یەکێک لە دەقەکانی کە لە بۆغازکۆی (KUB 12, 44, ii 20) دا دۆزراوەتەوە، ووشەیەکی لەیەکچوو هاتووە کە *Ha-ni-za-ra-a-e* یە. سەرنجی بۆ ئەوەش راکێشاوە کە لە کۆمەڵە ووشەی *hnzr* یش دەچێت کە لە دەقەکانی شاری ئوگاریت دا هاتوون و هەندێک ئێتیمۆلۆجییەکی سامی —بۆ نمونە خنزیر ی عەرەبی— و هەندێک ئێتیمۆلۆجییەکی خوری *hinzuri-** بە واتای "کچ"- یان بۆ پێشنیاز کردووە. بۆ ئەمە بروانە:

Læssøe, *The Shemshāra Tablets,* p. 83.

[55]کەسێکی تریش بەهەمان ناودود لە نامەیەکی شاری ماری دا هاتووە. لەوێدا بە جوتیارێک ناوبراوە کە هاوسەرەکەی لە قابراوە نێردراوەتەوە، بروانە:

Joannès, F., “La Femme sous la paille,” *Memoires de NABU* 1- *Florilegium marinarum,* Paris, 1991, p. 83.

*Arrunum*'کەوتنە ڕێ (دێڕی ١-٢١) .... تۆش باشترینی لەشکرەکەت بەفەرماندەیی خۆت بێنە و هەڵگەڕێ بۆ ئێرە (دێڕی ٤٣-٤٤)."[٥٦]

دەشێت یاشوب-ئەددەدی ئەخازوم یش لەنێو هاوپەیمانانەدا بوو بێت، چونکە لە پاشدا شەمشی-ئەددەد لە نامەیەکیدا بۆ کو-واری (SH 809) دەردی دڵ لە ئەمبەر و ئەوبەری زۆر و هاوپەیمانی یە بگۆڕەکانی یاشوب-ئەددەد دەکات، یەکێکیش لەو لایەنانەی لە سێ ساڵی ڕابوردوودا بە پێی نامەکە هاوپەیمانیان بووە تورروککو بوو.

نامەیەکی تریش SH 819 کە زۆر پێ دەچێت دواتر لەم نامەیەی پێشوو نووسرابێت، تەلپوشەڕری خۆی بۆ کو-واریی ناردووە. تیایدا لە دوایین هەواڵی خۆئامادەکردن و تەیارکردنی لەشکری بۆ هەڵکوتانە سەر ئیندوششێ بە کو-واری ڕادەگەیێنێت. نەخشەکەی وابووە لەگەڵ سەرەتای بەهاردا بە فەرماندەیی خۆی لە 'زوتلوم'ەوە شالاو بەرێت:

"ئێستا ئەووڵاتانەی بە هانامانەوە هاتوون نزیکن و منیش لەزوتلوم فەرماندەیی سوپا دەکەم"[٥٧]

---

[56] "*1) a-na ku-wa-ri qí-bí-ma 2) um-ma $^{m}$še-ep-ra-tu 3) a-ḫu-ka-a-ma 4) $^{m}$zu-zu-um ḫa-ni-za-ru-um 5) ša i-la-la-e$^{ki}$ ša a-na ku-sa-na-ar-ḫi-im 6) iš-pu-ru-úš il-li-kam-ma 7) ù it-ti* LUGAL *ša ku-sa-na-ri-im 8) it-ra-am a-na a-li-a-e$^{ki}$ 9) ù it-ti-šu ki-gi-ir-za ù ta-al-pu-šar-ri 10) in-na-me-er ù ni-iš* DINGIR. MEŠ *ga-am-ra-am 11) i-na bi-ri-ti-šu-nu iš-ku-nu 12) ù* LUGAL *ša ku-sa-na-ri-im $^{m}$na-aš-šu-ma-ar 13) ù ma-ru<-šu> ta-ru-gu-ur $^{m}$šu-úr-ti 14) it-ti ṣa-bi-im 3 li-mi i-la-ku-nim 15) ù $^{m}$be-er-di-ge-en-da-e* GAL-d<MAR-> TU *16) ša zu-ut-li-im it-ti um-ma-na-ti-šu 17) a-na* URU$^{ki}$ *ku-un-ši-im$^{ki}$ i-la-kam 18) ù ki-gi-ir-za it-ti ṣa-bi-šu 19) ù ṣa-bi-im ša ku-sa-na-ri-im ù šu-da-me-li-im 20) a-na a-ru-ni-im$^{ki}$ la-wi-im 21) it-ta-al-ku....*" (l. 1-21) " *43) ṣa-ba-ka da-am-qa-am ṣa-ab-tam-ma 44) i-na qa-ti-ka ù i-li-am,*" cf. Eidem and Læssøe, No. 63.

[57] "*10) i-na-an-na ma-ta-tum 11) ša a-na ti-il-lu-ti-ni 12) i-il-la-ku 13) iq-te-er-ba-nim,*" SH 819, Eidem and Læssøe, No. 54.

کو-واری لە هاوپەیمانی‌یەکەدا بوو وئەرکی بوو بە لەشکرەکەیەوە لەگەڵیاندا بێت، هەروەک ’ئێنتوری *Tenturi*‘ ناوێک، کە لەوە دەچێت کوڕی خۆی بووبێت، لە نامەی SH 812 دا بۆ ئەمە هانی داوە:

> "..و ئەگەر هەموو وولاتانی کە تەلپوشەڕری سەروەری‌یان دەکات هاتبێتن، دەبێت تۆش بێیت. دوا مەکەوە (ووشە بە ووشە: گیر مەمێنە)."[٥٨]

عیلامیش لە (باشوری)ڕۆژهەڵاتەوە کە لەم کاتەدا ’شیروک-توخ *Širuk-tuḫ*‘[٥٩] پادشای بوو یەکێک لە هاوپەیمانانی توروککو بوو لەدژی گوتی‌یەکان. قەول وابوو ئەویش بە ١٢,٠٠٠ سەرباز بەشداریی لەشکرکێشی‌یەکەی توروککو لە دژی ئیندوششێ بکات، ئەمە لە نامەی SH 827ەوە دەرکەوتووە:

> "شوروختوخ ی پادشای عیلام، ئەم پەیامەی بۆ ’تابیتو *Tabitu*‘ ناردووە: ’بۆچی وولاتی ئیتاباڵخوم نوێنەر نانێریتە لام؟ لەشکر تەیار بووە؛ لەدژی ئینداششو دەکەونە ڕێ‘."[٦٠]

باوەڕ وایە کە ئەم هاوپەیمانی‌یەی دژی گوتی‌یەکان لەپاڵ توروککو دا ئاشور و

---

[58] " *30) ù šum-ma ma-ta-tum 31) ma-li ᵐta-al-pu-šar-ri 32) i-ra-di-a-am i-la-ku-nim 33) ù at-ta i-li-a-am 34) la ta-ka-la,"* Eidem and Læssøe, No. 59.

[59]ناوی ئەم پادشایە لە نامەکانی شمشارەدا بە ’شوروختوخ *Šuruḫtuḫ*‘ نووسراوە. بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەم پادشایە، بڕوانە:

Potts, *The Archaeology of Elam*, p. 167f.

[60] Eidem and Læssøe, No. 64: "*50) ᵐŠu-ru-uḫ-tu-uḫ LUGAL ša NIM.MA-tim 51) a-na ᵐta-bi-tu iš-pu-ra-am 52) um-ma šu-ú-ma a-na mì-nim ma-at i-ta-ba-al-ḫi-im 53) ma-ru ši-ip-ri-im a-na ṣe-ri-ia 54) la i-ša-pa-ra-am um-ma-na-tum pa-aḫ-ra 55) a-na ṣe-er ᵐin-da-aš-šu pa-nu-šu ša-ak-nu."*

ئیشنوناشی تێدا بووبێت،[٦١] بەڵام نامەی SH 827 ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە سەردارانی توروککو جۆرە هاوکاری‌یەکیان لەگەڵ ئاشوری‌یەکاندا هەبووە، بەڵام بە بێ ئەوەی متمانەیان پێ بکەن.[٦٢] شێپراتو داوای لە کو-واری کردووە لە ڕاستی و دروستیی هەندێک لەو هەواڵانە بکۆڵێتەوە کە دەربارەی شەمشی-ئەدەدن بەڵام بە بێ ئەوەی نوێنەرەکەی ئاشوری‌یەکان ئاگای لێ بێت. هەرچۆنێک بێت، دیارە شیموررروم و لوللوبی‌یەکان، یان بەشێکیان، هاوپەیمانی کو-واری بوون، چونکە بە پێ ی نامەی SH 812 کاتێک کە کو-واری بۆ کۆمەکی تەلپوشەڕی "هەڵگەڕا،" هەندێک لە هێزەکانی ئەمان لە شاری شوشەڕا جێ هێڵران.[٦٣]

بەڵام کو-واری خۆی دوا دەخست، لەوانەشە، ئەگەر زۆری لێ نەکرایە، لە هاوپەیمانی‌یەکە بکشایەتەوە. چونکە قاتی‌یەکی گەورەی دانەوێڵە بووە هۆی دابین نەبوونی خۆراکی لەشکری لەشکرکێشی‌یەکە و بووە بابەتێکی زۆر گەرمی نامە ئاڵو گۆڕکراوەکان، دیارە هەر ئەم قاتی‌یەش هۆی سەرەکیی شکانی بەرەی توروککی بووە. نووسیویانە عەمبار و کەندووەکان بەتاڵن و لەشکر نزیکە. کو-واریش لەم لاوە لە توانای دا نەبوو هیچ ئازووقەیەک بنێرێت، یان مەبەستی نەبوو بنێرێت. بەم شێوەیە، ئەنجام کارەسات بوو، بە پێچەوانەی ئامانج و نەخشەی لەشکرکێشی‌یەکە، ئیندوششێ توروککی‌یەکانی خراپ شکاند. نامەی SH 818 کە 'سین-ئیشمێ-ئەننی *Sîn-išme'anni*'[٦٤] بۆ کو-واریی ناردووە، بەم شێوەیە بەسەرهاتەکان دەگێڕێتەوە:

---

[61] بۆ نمونە بڕوانە:

Eidem, *IRAQ*, p. 90; Potts, *op. cit.*, p. 168.

[62] دەتوانین ئەم ڕاستی‌یە لە نامەکەی تەلپوشەڕی‌یەوە بۆ کو-واری (SH 804) تێ بگەین کە تیایدا داوای لێ دەکات نوێنەرەکەی *یائیلانوم* '*Ia'ilānum*' ی بۆ بنێرێت، بەڵام هی ئاشور نا.

[63] Eidem and Læssøe, p. 39.

[64] لە نامەکاندا دیاری نەکراوە سین-ئیشمێ-ئەننی کێ بووە، لەوانەیە یەکێک لە سەردارە زۆرەکانی توروککو بووبێت.

> "ئیندوششێ بە تاڵانکاری‌یەوە هات و [.....] بەروبوومی شاری کونشوم و بەروبوومی *ئیرتاخوم* *Irtaḫum*‘ فەوتاند. (دێڕی ٣-٧)، .... ئێستا، ئیندوششێ ماوەی بیست و [...] ڕۆژ بە ناو وولاتەکەدا سوڕایەوەو ئێمە لەبەرەیەکی کراوەدا ڕووبەڕووی نەبووینەوە. (دێڕی ١٧-٢١) .... برا متمانەی بەبرای نیە! تۆ نابێت دەستمان لێ بەربدەیت! پیاوانە بکەوەرە خۆت! (ووشە بە ووشە: وەک گەورەپیاو بە!) و عەمارەکانت مەحکەم بکە! (دێڕی ٢٤-٢٧)."[٦٥]

نامەی SH 899 کە کو-واری بۆ سین-ئیشمێ-ئەنێ ی نووسیوە لە شمشارە دۆزراوەتەوە، وادیارە دوایین نامەی کۆمەڵەی نامەکانی دەمی پێش باڵادەستیی ئاشوری‌یە لە شمشارە کە فریا نەکەوتوون بینێرن.[٦٦]

## دەمی باڵادەستیی ئاشوری:

یەکێک لە ئەنجامەکانی ئەم سەرکەوتنەی ئیندوشێ و هەرەس هێنانی بەرەی توروککی، هەڵاتنی ژمارەیەکی زۆر لە توروککی‌یەکان بوو کە پەنایان بردە بەر شوشەڕا. بەمە دەمی یەکەم کۆتایی هات و دەمی دووەم، کە دەمی باڵادەستیی

---

[65] "*4) ᵐin-[d]u-úš-še iḫ-ḫa-ab-⸢ta⸣-am-ma 5) ⸢e-bu⸣-[ur]* URU[ki] *ku-⸢un⸣-ši-im[ki] 6) ⸢x x⸣ [x (x)] ⸢e⸣-b[u-u]r ir-⸢(x)⸣-⸢ta⸣-ḫi-im 7) [x x x x] im-ḫa-aṣ;" "17) ⸢ i-na-an-na iš⸣-tu 20 [(+ x)] u₄-mì-im 18) ᵐi[n-d]u-úš-še i-na li-bi ma-tim 19) ⸢i-ta-na⸣al-la-ak-ma 20)* [GIŠ]TUKUL. MEŠ *ú ta-ḫa-za-am 21) it-⸢ti⸣-šu ú-ul ni-pu-úš;" "24) a-⸢ḫu⸣-um a-na a-ḫi-im ú-ul ip-pa-la-às 25) ⸢at-ta⸣ aš-ra-nu-um la ti-gi 26) ⸢lu-ú⸣ a-wi-lum at-ta 27) n[a-k]a-ma-ti-ka du-un-ni-in."* Cf.: Eidem and Læssøe, No. 36.

وەرگێڕانی دەقەکە بۆ کوردی بەهەندێک دەستکاری‌یەوەیەو دەقاودەقی ئینگلیزی‌یەکەیمان دانەناوەتەوە.

[66]Eidem and Læssøe, p. 36.

ئاشوری‌یه، ده‌ست پێ ده‌کات. له‌نێو ئه‌م په‌ناهێنه‌رانه‌دا پادشا و میر و ده‌ره‌به‌گی گه‌وره هه‌بوون. ئه‌مانه گیروگرفتی ماندووکه‌رو سه‌رئێشه‌ی نه‌بڕاوه‌یان بۆ هه‌ردوو کو-واری و پاشان شه‌مشی-ئه‌ده‌د دروست ده‌کرد. شتێکی چاوه‌ڕوانکراوه که له‌نێو ئه‌م په‌نابه‌رانه‌دا ناوی *'ته‌لپوشه‌ڕڕی* *Talpušarri*،[٦٧] *'تێنتوری* *'Tenturi*،[٦٨] *'شیـــپ-شـــه‌ڕڕی* *Šip-šarri*،[٦٩] *'زازی-یا* *'Zaziya*[٧٠] و *'خازیپ-تێششوپ* *'Ḫazp-Teššup*[٧١] له ده‌قه کارگێڕی‌یه‌کانی شمشاره‌دا ببینینه‌وه که خواردن و جل و به‌رگیان بۆ بڕاوه‌ته‌وه.[٧٢] له نامه‌یه‌کی شه‌مشی-ئه‌ده‌د دا بۆ کو-واری SH 911+922[٧٣] داوای له کو-واری کردووه ئه‌و تورو‌ککی‌یانه‌ی بۆ بنێرێت که ناتوانێت به‌خێویان بکات، ڕه‌نگه بۆ دامه‌زراندنیان له هه‌ندێک کار و باردا.[٧٤]

---

[67] ناوی ئه‌م له ده‌قی ژماره ١٠٥ دا هاتووه، بۆ ده‌قه‌که بڕوانه:

Eidem, J., *The Shemshāra Archive 2: The Administrative Texts (SAAT),* Copenhagen, 1992, No. 105.

هه‌رچه‌نده ته‌واو دڵنیا نین له‌وه‌ی ئه‌م ته‌لپوشه‌ڕڕی‌یه ته‌لپوشه‌ڕڕیی پادشا خۆی بووبێت، به‌ڵام ئه‌و ئاماژه‌یه‌ی له نامه‌ی SH 887 دا سه‌باره‌ت به‌م هاتووه و باس له‌وه ده‌کات که خۆی و ده‌ست وپه‌یوه‌نده‌که‌ی/ له‌شکره‌که‌ی (*ṣābum*) به‌ند کراون، زۆر زیاتر بۆ ئه‌وه ده‌چێت که پادشا بووبێت.

[68] ده‌قی ژماره ١٤٠، بڕوانه:

*SAAT,* No. 140.

[69] *SAAT,* Nos. 132; 144 and 146.

[70] *SAAT,* Nos. 129; 133; 136 and 146.

[71] *SAAT,* Nos. 19; 46; 74; 116; 121; 125; 129; 133 and 146.

[72] جێگای سه‌رنجه که ناوی سین-ئیشمیێ-ئه‌نی له ناویاندا نابینینه‌وه؛ ده‌بێت له‌شه‌ڕێکی دواتردا له‌گه‌ڵ دوژمن کوژرابێت؟ یان چووه‌ته پاڵ دوژمن؟ تائه‌وکاته‌ش که نامه‌ی SH 818 بۆ کو-واری نووسیوه هه‌ر ماوه و وه‌فادار بووه.

[73] Eidem and Læssøe, No. 15.

[74] سه‌باره‌ت به‌مه بڕوانه:

Læssøe, J. and Th. Jacobsen, "Šikšabbum Again," *JCS* 42/2 (1990), p. 161-6; Læssøe, J., *PAA,* p. 150.

هەرەس هێنانی بەرگریی توروککی و بەرەوپێش هاتنی چاوەڕوانکراوی گوتیی‌یەکان بەرەو شوشەڕرا، بۆ کو-واری و قەڵەمڕەوەکەی هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە بوو. لەمەیدانی شەڕدا بۆ بەرەوڕووبوونەوەی ئیندوششێ بەتەنها مابووەوە و بۆ بەرەنگاربوونەوەی پەستانی بەردەوامی لەشکری گوتیش تەنیا باڵ بوو. ڕوونە کە ئەم بارو دۆخە بووە وای لێ کردووە بۆ یارمەتی و کۆمەک پەنا بەرێتە بەر ئاشوریی‌یەکان بەوەی سەرووەرێتی شەمشی-ئەدەد قبوڵ بکات و بچێتە ژێر باڵی‌یەوە. وادیارە ئەمە لە دەوروبەری ١٧٨١ پ.ز. دا بووە، ئەم ساڵە بەرامبەر لیمـــوی *ئەســقــودوم/ ئاشور-مالیک* *Asqudum/ Aššur-Mālik*ʿە.[٧٥] پێش ئەوەی هاوکێشەی هێزەکان بەم جۆرە بگۆڕێت، کە هێشتا شوشەڕرا بەشێکی شانشینی توروککی بوو، ترسیان لە نیازەکانی شەمشی-ئەدەد لە بەرامبەر شاری شوشەڕرا و وڵاتی ئوتوم هەبوو؛ ئایا نیازی ئەوەی هەیە ئەمانە بخاتە سەر شانشینەکەی خۆی یان نا.[٧٦] لە کە کاتێکدا شاڵاوەکانی گوتیی‌یەکان بۆ سەر خاکی ئوتوم و دەوروپشتی نەوەستا بوو، نامەی SH 859+881 لەلایەن سەرلەشکرێکی شەمشی-ئەدەدەوە بۆ کو-واری نووسراوە بە ڕاشکاوی ئاماژە بۆ ئەم بارە دەکات:

> "لەم کاتەدا ٢٠٠ سەربازی گوتی ... بەردەوام هەڵدەکوتنە سەر وڵاتەکە و تۆش بێدەنگی! چۆن وەڵامی پادشا بدەینەوە؟ من سەربازم لەبەر دەستدا نیە."[٧٧]

---

[75] Eidem and Læssøe, p. 34.

نامەی SH 905 لە شەمشی-ئەدەد بۆ کو-واری ئاماژەی بۆ ووتەیەکی ئیندوششێ تێدایە کە گوایە کاتێک کو-واری بۆ داوای کۆمەک و چوونە ژێر ڕکێف بۆ لای شەمشی-ئەدەد چووە، زێڕو زیوی لەگەڵ خۆی بردووە و پێشکەشی کردووە.

[76] تەماشای نامەی ژمارە SH 812 بکەرەوە کە پێشتر باسمان کرد.

[77] Eidem and Læssøe, No. 42: "14) *i-na-an-na 2 me ṣa-b*[*u*]*-um* LÚ *qú-tù-ú 15)* ⸢*ù*⸣ *ma—tam iš-ta-na-aḫ-ḫi-iṭ 16)* ⸢*ù*⸣ *at-ta ši-ip-pa-*[*a*]*t 17) mi-na-am ni-ip-pa-al* LUGAL *18) ṣa-bu-um i-na qa-ti-ia ú-ul* [*i-ba-aš-ši*]."

بەڵام کو-واری دەست و پەیوەندیکی نمونەیی شەمشی-ئەدەد نەبوو؛ لە نامە ئاڵ و گۆڕ کراوەکانەوە دەردەکەوێت کە هەرچی شتێک سەروەرە نوێ یەکەی لێ ی داوا دەکرد ئەم هەمووی جێ بەجێ نەدەکرد.[٧٨] ئەگەر بارودۆخەکەی کو-واری باش لێک بدەینەوە ئەوا ئەمە شتێکی سەیر نابێت. ئەو بە ناچاری چووبووە ژێر باڵی ئاشوری‌یەکانەوە، لەم لاوە هاوپەیمانیی توروککی تێک شکابوو و سەروەرەکانی جارانی لای خۆی ببونە پەنابەر، گوتی‌یەکانیش ئەو دوژمنە سەرسەخت و جیرە بوون کە بەردەوام لەهەولی تێک شکاندنی بەرگریی کو-واری دا بوون. لەولاشەوە شەمشی-ئەدەد براوە بوو، بەتایبەتی کە کو-واری بینی چۆن شەمشی-ئەدەد شاری قابرای گرت. سەرباری ئەمەش، کو-واری باش دەیزانی پلانە فراوان خوازی‌یەکەی شەمشی-ئەدەد قەڵەمڕەوەکەی ئەم نابوێرێت، ئەگەر بە ئاشتی نا، ئەوا بە زۆر. لەوانەیە یەکەم بەرهەمی چوونە ژێر باڵی ئاشوری‌یەکان، پتەو کردنی هێز و دەستەڵاتی کو-واری لە شوشەڕا بووبێت بە پێی بڕیارەکەی شەمشی-ئەدەد، بەوەی بە ناردنی ٦٠٠ سەرباز بۆ شوشەڕا پشتگیری لێ کرد (SH 861):

"ئەوا ٦٠٠ سەربازم بۆ پارێزگاری کردنی شوشەڕا بۆت نارد. ڕێگە بدە با ئەم سەربازانە بێنە ناو شوشەڕا خۆیەوە، تۆش خۆت وەرە

---

[78] بۆ نمونە نامەکانی *ئێتێللوم Etellum*، سەرلەشکری شەمشی-ئەدەد، کە تیایاندا دەڵێت چەند چاوەڕوانی لەشکرەکەی کو-واری بووە تاکو پێکەوە شاری شیکشابوم بگرن بەڵام بێهوودە بووە. کو-واری چەندین نامەی سەبارەت بەم بابەتە بۆ هاتووە، بەڵام هیچی نەکردووە. بڕوانە نامەکانی:
SH 14; SH 39; SH 41; SH40 and SH 42.
تەنانەت کو-واری هەندێک جار تاقەتی وەڵام دانەوەی نامەکان و ناردنی زانیاریی داوا لێکراویشی نەبووە، ئەمە لە نامەکەی *کوراشانوم Kurašānum* SH 921 دا ئاشکرا کراوە، بۆ نامەکە بڕوانە:
Eidem and Læssøe, p. 51 (No. 29).

بۆلام."[٧٩]

ئەو دوژمنەی لەم کاتەدا شوشەڕرای لێ پارێزراوە ناکرێت لە ئیندوششێ بەولاوە هیچ کەسێکی تر بێت. وێرانەکانی شورایەکی گەورەی بەرگریی لەگاشەبەرد بنیات نراو بەدرێژایی سەرتەختی چیای 'خالّی دەربەند' ەوە تا دەگاتە دەشتی ڕانیە ماون،[٨٠] دوور هی ئەم سەردەمانە بێت. شوێن و هەڵکەوتنی شوراکە بۆ بەرگری کردن لە دەشتی ڕانیەیە لە هێرش و پەلامارێک کە لە ڕۆژهەلاتەوە بێت، ئەمەش لە هەموو لایەنێک زیاتر بۆ کو-واری و گوتییەکان دەگونجێت، بەڵام پرسیار لێرەدا ئەوەیە ئایا ململانێ یەکەی نێوان ئەم دووانە ئەوەندە درێژەی کێشاوە تاوەکو کو-واری فریای بنیات نانی ئەم شورا گەورەیە کەوتبێت؟ نامەی SH 878 کە تیایدا شەمشی-ئەدەد داوا لە کو-واری کردووە لەگەڵ گەورە پیاو و پیاوماقولانی وولاتیکەیدا بچنە لای لەوانەیە پەیوەندیی بە مەراسیمی سوێند خواردنی لایەنگیری و دڵسۆزی بۆ شەمشی-ئەدەدەوە هەبووبێت، بۆیە لەوانەیە پێش نامەی SH 861 نووسرابێت. گوتییەکان دەست بەردار نەبوون و کەوتنە هەوڵی ڕێگای دیپلۆماسییانەو فرت و فێڵ بەکارهێنان. بۆ ئەمە ئاشورییەکانیان بەوە هێور کردەوە کە پەیمانیان بە باڵیۆزەکەیان دا هەتا شوشەڕرا لەژێردەستی شەمشی-ئەدەد دا بێت، ئەمان پەلاماری نەدەن، بەڵام لەهەمان کات دا خۆیان بۆ پەلامارادانی ئامادە دەکرد. بۆیە باڵیۆزەکە متمانەی بە ووتەکانی ئیندوششێ نەبوو و لە پادشای داوا کردووە کو-واریی بن دەستیان ووشیار بکاتەوە و ڕێ نمایی بداتێ. نامەی SH 887 ئەمە باشتر ڕوون دەکاتەوە:

[79] Eidem and Læssøe, No. 19: "*4) a-nu-um-ma 6 me ṣa-ba-*[*a*]*m* ˹*a*˺*-n*[*a*] ***ma***-*ṣa-ar-*˹*ti*˺ *5) šu-šar-ra-d*[ki] *aṭ-ṭà-ra-ad 6) ṣa-bu-um šu-*[*ú*] ˹*a*˺*-na li-ib-bi 7)* ***šu-šar-****ra-*˹*a*[ki]˺ *li-ru-ub-ma 8) ù at-ta a-na ṣe-ri-ia al-ka-am.*"

[80] Brown, T. W., "A Report on the Discovery of a Line of Ancient Fortifications on a ridge to the East of the Rāniya, Sulaimanyah Liwa," *Sumer* XIV, part 1 &2 (1958), pp 122-124.

"وەرەد-شەرریم 'Warad-šarrim لەلایەن ئیندوششێ[٨١] وە گەیشتە ئێرە و پەیامی دامێ. ئێندوششێ تا سەر ئێسقان لە دژتانە و ناهێڵێت بحەسێنەوە! ئەگەر هات و بەرەو لای ئێوەوە هات ئەوا دەبێت ئامادە بن و ئۆردوگاکانتان بڵاوە پێ مەکەن."[٨٢]

شەڕ لە دژی شانشینێ ئەخازوم و یاشوب-ئەددەدی پادشای بەشێکی باشی لە بابەتی نامەکانی شمشارە بردووە. ئەم پادشایە، کە لە شاری گرنگ و مەحکەمی شیکشاببوم دادەنیشت، بە ئەمبەر و ئەوبەری زۆر و هاوپەیمانی‌یە بگۆڕەکانی گیروگرفتی زۆری بۆ پادشای ئاشور دروست کردبوو. شەمشی-ئەدەد سەبارەت بەمە دەردی دڵی لای کو-واری کردووە.[٨٣] بەڵام وادیارە یاشوب-ئەدەد ڕێگای لەوە باشتری لەبەردەمدا نەبووە، کەوتبووە نێوان دوو بەرداشەوە، لە چیاکانی ڕۆژهەڵاتەوە و لە دەشتی ڕۆژئاواوە. لەپاش گرتنی ئەرڕاپخا و قابراوە ترسی ئەوەی هەبوو ئاشور و ئیشنونا پێکەوە پەلاماری بدەن. لەپاش ڕمانی بەرەی توروککیشەوە دەبوایە دیسان هاوپەیمانی‌یەکەی بگۆڕێت. بۆ هاوڕێی خۆماڵیی تر گەڕا و پاش ئەوەی هەوڵەکەی لەگەڵ ئاشوردا سەری نەگرت، چوو بەرەی کاکموم-گوتیوم-ئەخازوم ی پێکەوە نا.[٨٤] کو-واری دەبوایە بە ناردنی ١٠٠٠ سەرباز بۆ ئیتیللومی سەلەشکرەکەی شەمشی-ئەدەد کۆمەکی لەشکرکێشی‌یەکەی ئاشور بۆ

---

[81]ناوی پادشای گوتی هەندێک جاریش بە شێوەی Endušše نووسراوە و جاری واش هەیە بە Indaššu. ئەم شێوەیەی دوایی‌یان لەگەڵ ناوی ئێنسیی 'Zabšali زەبشالی' ی سەردەمی بنەماڵەی سێیەمی ئوردا یەک دێتەوە کە ناوی 'Indassu ئینداسسو' بوو. بۆ ناوی ئەم ئێنسی‌یە بڕوانە:
Potts, *The Archaeology of Elam,* p. 168.

[82] Eidem and Læssøe, No. 8: "*12) ù* ÌR. LUGAL *13) iš-tu ma-ḫa-ar in-du-úš-še il-li-kam-ma 14) ṭe₄-ma-am ub-lam in-du-úš-še 15) ṣa-ri-im-kum ú-ul pa-ṭì-ir-kum 16) as-sú-ur-ri i-la-ka-kum ṭe₄-em-ka 17) lu-ú ṣa-ab-ta-at ù bi-ra-ti-ka 18) la tu-uš-ma-ad.*"
(وەرگێڕانە کوردی‌یەکە بە هەندێک دەستکاری‌یەوەیە).

[83]بڕوانە نامەکانی SH 809; SH 894.

[84] Eidem and Læssøe, p. 44.

سەر ئەخازوم بکات. ئیتیللوم لەم کاتەدا گەمارۆی شیکشاببومی پایتەختی ئەخازومی دابوو:

"ئەوا لەشکریکم لەگەڵ ئیتیللوم دا بەرێ کرد بۆ گەمارۆ. ١٠٠٠ سەرباز لە لەشکرەکەی خۆتی بۆ بنێرە بۆ شیکشاببوم."[٨٥]

ئەمجا ئیتیللوم بە چەند نامەیەک کەوتە هاندانی کو-واری بۆ ئەوەی بۆ شەڕی شیکشاببوم بچێتە پالی، لەم نامانە SH 859+881 ە کە دەڵێت:

"شیکشاببومی لێ دەربچێت ئیتر کێ دوژمنتە؟ لەو بەولاوە دوژمنێ ترت نیە."[٨٦]

هەروەها:

"شیکشاببوم دوژمنتە! بۆ هەردووکمان، تۆش و منیش هەڕەشەیە. با خۆمان بۆ گەمارۆدانی شیکشاببوم تەیار بکەین...... پێش ئەوەی پادشا بگات؛ با بە هەردوکمان خزمەتێکی سەروەرمان بکەین. دوودڵ مەبە! وەرە!"[٨٧]

چەند نامەیەک بۆ هاندان و تەماع وەبەرخستنی کو-واری نێردران تاوەکو بەشداریی لەشکرکێشییەکە بکات و لەشکرەکەی بنێرێت، بەڵام بێهوودە بوو، ئیتیللوم ناچار بوو

---

[85] SH 917, Eidem and Læssøe, No.14: "*4) a-nu-um-ma ṣa-ba-m <<x>> 5) it-ti e-te-el-lim 6) a-na la-we-e<<ki>> 7) aṭ-ṭà-ra-ad<<ki>>8)* (erased) *9) 1 li-im ṣa-ba-ka 10) šu-ta-aṣ-bi-it-ma 11) a-na* ⌜*ṣe-ri-šu*⌝ *12) ši-ik-ša-am-bi*$^{ki}$ *13) ṭú-ru-ud<<ú>>.*"

[86] Eidem and Læssøe, No. 42: "*59) ul-la-nu-um ši-ik-ša-bi-im*$^{ki}$ *ma-an-nu-um 60) na-k*[*a*]-⌜*ar*⌝ *-ka ul-la-nu-uš-šu 61) na-ka-ar-ka ú-ul i-ba-aš-ši.*"

[87] SH 913, Eidem and Læssøe, No. 39: "*4) ši-ik-ša-ab-bu-um*$^{ki}$ *na-ka-ar-ka 5) u-ka-šu-um ù ia-ši-ia ma-ru-uṣ 6) ša ši-ik-ša-ab-bi-im*$^{ki}$ *7) <<x>> la-we-e-em i ni-pu<<x>>-uš<<x>> .... 28) la-ma* LUGAL *i-la-ka-am ni-nu 29) iš-te-et i nu-dá-am-mi-iq 30)* ⌜*a*⌝*-na be-lí-*$ni_5$ *31)* [*l*]*a tu<-la>-ap-pa-at al-ka-am.*"

ئۆردوگاکەی بپێچێتەوە و بکشێتەوە (SH 877 دەکاتە ژمارە 40 لە لای Eidem and Lǽssøe ). لەولاشەوە، ئەخازوم باش خۆی بۆ شەڕەکە ئامادە کردبوو و هاوپەیمانیی خۆی بۆ بەرنگاربوونەوەی ئاشوری‌یەکان بەستبوو. جگە لە توروککی‌یە هەڵاتووەکان، گوتی‌یەکانیش سەرباز و خۆراکیان لە زێ وە دەپەڕاندەوە بۆ کۆمەکی شیکشاببوم و خۆراگرتنی لە بەرامبەر ئاشوری‌یەکاندا. نمونەیەکی باشی ئەمە بەشی ئەو نامەیە ( SH 859+881 بەرامبەر ژمارە 42ی Eidem and Lǽssøe) یە کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، کە تیایدا ئیتیللوم کو-واری لە هەموو ئەم شتانە ئاگادار دەکاتەوە و بە زمانێکی گلەیی ئامێزەوە لێ ی دەپرسێت: "چۆن وەڵامی پادشا بدەینەوە؟"[٨٨]

نامەیەکی گرنگ بەڵام بەداخەوە پڕ لە شکاوی نامەی SH 891ە، ناوی نێرەرەکەی شکاوە و نازنین کێ یە، بەڵام هەڵوێستەکەی کو-واری بەرامبەر شەمشی-ئەدەدمان بۆ ڕاڤە دەکات. شێوەی داڕشتنی نامەکە بە پێی ئەوانەی بڵاویان کردووەتەوە[٨٩] شێوەیەکی تاکە و نووسەرەکەشی لە هەموو نووسەرەکانی نامەکانی تری ئەرشیفەکەی شمشارە جیایە. زانیاریی گرنگی بۆ کو-واری هێناوە سەبارەت بە ڕێکەوتنێکی نێوان شەمشی-ئەدەد و دوژمنەکەی کو-واری: ئیندوششێ. کو-واری دەبێت هەستی بە خیانەت لێ کران و پشت لێ کردنی سەروەرەکەی کردبێت، لە هەمان ئەو کاتەدا کە داوای لێ دەکرا لە دژی یاشوب-ئەدەدی ئەخازوم شەڕی بۆ بکات. لەوە دەچێت نێرەری ئەم نامەیە هەواڵگرێکی کو-واری بوو بێت کە هەواڵی بۆ کۆ کردووەتەوە:

"تۆ سەبارەت بە *ئیمدی ئەدەد* *Imdi-Adad*' ی نۆکەری

[88] Eidem and Læssøe, No. 42: "*17) mi-na-am ni-ip-pa-al* LUGAL."
[89] Eidem and Læssøe, p. 53.

'سەمسی-ئەددو *Samsī-īddu*'[90] بۆمت نووسی کە دیاریی زیوین و زێڕین و کوتە زیوی بۆ ئیندوششێ هێناوە. قسەکە ڕاستە و بیستم هەرچی بۆ هێناوە لە زیو و زێڕ و کوتە زیو..... ئەو (واتە: شەمشی-ئەدەد) بەم جۆرە بۆ ئیندوششێ ی نووسی: ' من و تۆ- ڕێکەوتنەکەمان دەبوایە زۆر زووتر بووایە (ووشە بە ووشە: درەنگە). بتێکی تۆ و بتێکی خۆم لە زێڕ دروست دەکەم، برا دەست لە ملی برا دەکات. کچەکەی خۆمت دەدەمێ و بۆ مارەیی کچەکەی تۆش وولاتی شوشەڕڕا و وولاتی [.......]ت دەدەمێ."[91]

بگەڕێینەوە بۆ سەرکردەوە پیاوماقوڵانی تورووککی کە لەم کاتەدا لای کو-واری بوبوونە پەنابەر. ئەمان، هەروەک لە نامەکانی نێوان کو-واری و شەمشی-ئەدەدەوە دەردەکەوێت، بۆ هەردوو لایان بوبوونە گیرو گرفت. ڕستەیەکی بایەخدار لە یەکێک لەم نامانەدا بەمانە دەڵێت "ڕۆڵەکانی وولات" و ئەمە دەشێت بەڵگەی ئەوە بێت کە هاووڵاتیی ئوتۆم بووبێتن، ئوتومیش بەشێکی شانشینی تورووککیی جاران بوو.[92] وادیارە دیارترینی ئەم سەرکردانە 'خازیپ-تێششوپ *Ḫazip-Teššup*' بوو کە لە چارەی

---

[90] سەمسی-ئەددو/ئیددو شێوە ئاموری‌یەکەی ناوی شەمشی-ئەدەدە. لەڕاستیدا ئەم پادشایە زۆر جار بەم شێوەیە ناوی نووسراوە چونکە خۆی بە بنەچە ئاموری بووە، بەڵام لە وولاتی ئاشوردا زۆر شتی، لەوانەش ناوی، مۆرکێکی میسۆپۆتامیایی وەرگرتووە و ناوەکەشی بووەتە شەمشی-ئەدەد.

[91] Eidem and Læssøe, No. 71: *"1′)* [...........*aš-š*]*um* ${}^{m}$*im-di-*${}^{d}$IM ÌR ${}^{d}$*s*[*a-am-si-*${}^{d}$UTU] *2′)* [*š*]*a ta-ma-ar-tam* KÙ. BABBAR KÙ. GI *ù ru-*[*uq-qa-at*] *3′)* KÙ. BABBAR *a-na* ${}^{m}$*in-du-úš-še ub-lu ta-aš-p*[*u-ra-am*] *4′) a-wa-tum ši-i ki-na-at ù ma-li ub-l*[*u-šum*] *5′) še-me-ku* KÙ. BABBAR KÙ. GI *ù ru-uq-qa-at* KÙ. [BABBAR] *6′) ša ú-ša-bi-lu............ 7′) a-na en-du-úš-*[*še*] *8′) ki-a-am iš-pu-ur um-ma šu-ma-a 9′) a-na-ku ù at-ta pu-ḫu-ur-ni u-za-bi-*[*il*] *10′) ṣa-la-am-ka ù ṣa-al-mi ša* KÙ. GI *11′) lu-še-pi-iš-ma a-ḫu-um ki-ša-ad a-ḫi-im 12′) li-ki-il* DUMU. MÍ *ma-ar-ti 13′) lu-ud-di-na-ak-kum-ma a-na ša-ar-ra-k*[*u-ut*] *14′)* DUMU. MÍ*-ti-ia ma-a-at šu-šar-ra-a*${}^{ki}$ *15′)* ⌈*lu-ud*⌉*-di-na-ak-kum ù ma-a-at* [......].*"*

[92] بۆ ئەم ڕستەیە بڕوانە:

SH 887, l. 9.

نووسرابوو ڕۆڵێکی گەورە لە گەمەی سیاسیدا یاری بکات؛ بەشێکی زۆری نامە ئاڵ و گۆڕکراوەکانی شمشارە بۆ کێشەی ئەم تەرخان کراوە. وەک دەردەکەوێت خازیپ-تێششوپ کاری بۆ هەڵگیرساندنی یاخیگەرییەک لە دژ کو-واری لە وولاتەکەدا کردووە، یان هیچ نەبێت کو-واری خازیپ-تێششوپی بەمە تۆمەت بار کردووە، پاش ئەوەی ترسی لە زیادبوونی کاریگەری و بەرز بوونەوەی پلە وپایەکەی لە ناوچەکەدا، لێ نیشتووە. کاتێکیش شەمشی-ئەدەد پێشوازی لە خازیپ-تێششوپ کردو بە ڕێزو و قەدرگرتنێکی زۆرەوە مامەڵەی کرد، کارەکە لای کو-واری گەندتر بوو، چونکە ئەو بەبێ ئەمەش لە زیادبوونی دەستەڵاتی دەترسا و ئەمەش نیشانەی مەترسی بوو. ئەمانە وایان کرد کو-واری داوا لە شەمشی-ئەدەد بکات خازیپ-تێششوپی بۆ بنێرێتەوە تا بەندی بکات. هەرچەندە شەمشی-ئەدەد چەندین جار داوای لە کو-واری کردووە بەندکراوەکان بەربدات، بەڵام بێهوودە بووە. کو-واری نیازی لەمە خراپتریشی هەبوو، دەیویست خازیپ-تێششوپ لە بەندیخانەدا بکوژێت و شەمشی-ئەدەد هەوڵی دەدا دەست هێنێتە ڕێ ی. بەڵام کو-واری هەر سوور بوو تاوەکو لە نامەی SH 883 دا ڕەزامەندیی شەمشی-ئەدەدی بەدەست گەیشت، لەوانەیە لە پاداشتی گرتنی شارێکدا بە ناوی *Zu?-<<ul?>>-zu-la-a* وە:

> "سەبارەت بە خازیپ-تێششوپ بیرێکم بۆ هات، کە لەبارەی کوشتنییەوە بۆمت نووسی. کەتۆ دەتەوێت بمرێت، بامرێ! بۆچی بمێنێت؟ با لە بەندیخانەدا بمرێت، بەردەوام بۆ شارەکەی دەنووسێت و هەوڵ دەدات [وولاتە]کەت لەدژت هەڵبگێرێتەوە."[٩٣]

ئەگەر خازیپ-تێششوپ بەڕاستی هەوڵی ڕێکخستنی یاخیگەریی لە دژی کو-واری

---

[93] Eidem and Læssøe, No. 16: *"16) ù aš-šum ḫa-zi-ip-te-šu-up 17) ša šu-mu-us-sú ta-aš-pu-ra-am 18) iš-tu šu-mu-us-sú ta-aq-bú-ú 19) li-mu-ut am-mi-ni-im i-ba-lu-uṭ 20) i-na né-pa-ri-im li-mu-ut 21) a-na a-li-šu iš-ta-na-ap-pa-ar-ma 22) p[í(-i) ma-ti-k]a uš-ba-la-ka-at."*

دابێت، ئەوا بۆ ئەوە بووە کو-واری لەسەرکار لابەرێت و خۆی دەستەڵات بگرێتە دەست، چونکە کو-واری خراپ مامەڵەی پەنابەرە تورروککیيەکانی دەکرد و دەیچەوساندنەوە تاکو ڕێ لە زیادبوونی هێزو دەستەڵاتیان بگرێت و لەقاڵبی خۆیاندا بیاهێڵێتەوە. ئەم چەوساندنەوەیەش بەس بوو بۆ کین هەڵگرتنی زۆر لە تورروککییەکان و تەنانەت هاووڵاتیانی شوشەڕرا خۆیشی لە کواری (SH 861) و لەدەست شاری شوشەڕرا و فەرمانڕەوا زۆردارەکەی هەڵبێن و پەنا بەرنە بەر شاری شیکشاببومی ڕکەبەری، هەروەک لە SH 919 دا هاتووە:

> "هاووڵاتیانی ئوتوم ڕکیان لە شاری شوشەڕرا دەبێتەوەو ئێوە – ئێوەی هاووڵاتیانی کونشوم کە کونشومتان جێ هێشت- ڕکیان لێتانە! ئەوان هیچ و پووچ و یاخین."(SH 861)[٩٤]
>
> "ئێستا هەموو ئەو [تورروککی]یانەی بۆ[منیان] دەنێریت [بەشـــ]ـــە[و] و بە دزییەوە [دێن]، ئەو زەوییەی لەبەردەستیاندایە *داوای* دەکەن [و] بەردەوام دزەدە[کەنە] شاری شیکشاببومەوە. ئایا ئەوە ڕاستە ئێمە دوژمنما[ن] بەهێزتر بکەین و لەشکرەکەی گەو[رەتر]؟ من بەمە نارەحەتم!."(SH 919)[٩٥]

---

[94] Eidem and Læssøe, No. 19: "*9)* LÚ. MEŠ DUMU. MEŠ *ú-ta-im*$^{ki}$ *a-lam šu-šar-ra-a*$^{ki}$ *10) i-zi-ir-ru ù ku-nu-ti* DUMU. MEŠ *ku-un-ši-im*$^{ki}$ *11) ša iš-tu ku-un-ši-im*$^{ki}$ *tu-ṣí-e* [(.....)] *12) i-zi-ir-ru-ku-nu-ti 13) sà-ar-ru mu-ut-ta-ab-la-ka-tu.*"

هەروەها بڕوانە:

Eidem, *IRAQ*,, p. 94.

[95] Eidem and Læssøe, No. 13: "*25) i-na-an-na* [LÚ. MEŠ *tu-ru-ki*]-*i*$^{ki}$ *26) ma-la ta-ṭà-ra-*[*dam i-na m*]*u-š*[*i-im*] *27) na-ap-za-ra-am* ⸢*i*⸣-[*la-ku-nim*] *28)* A. ŠÀ *i-na pa-ni-šu-*⸢*nu*⸣ *i-ri-*⸢*šu?*⸣ -[*ma*] *29) a-na ši-ik-ša-bi-um*⸢*ki*⸣ *i-te-né-ru-b*[*u-nim*] *30) i-ša-ri-iš ma-a a-aḫ na-ak-ri-n*[*i*] *31) nu-ka-ab-ba-ar ù* $^{GIŠ}$ŠUKUR-*šu nu-da-a*[*n-na-an*] *32) aš-šum ki-a-am li-ib-bi im-ra-aṣ.*"

هەروەها بڕوانە:

Eidem, *IRAQ*, p. 99.

کاتێک شەمشی-ئەدەد شیکشابومی گرت و بەسەر یاشوب-ئەدەدی فەرمانڕەوایدا سەرکەوت، لە نووسینەکەیدا گوتی بەسەر یاشوب-ئەدەدی ئەخازی و ئەو توروککییانەدا سەرکەوتم کە لەوێ خۆیان گرد کردبووەوە.[٩٦] ئەمە واتای وایە توروککییەکان شان بەشانی ئەخازییەکان و گوتییەکانی لەوێ لەسەنگەردا بوون، لەدژی ئاشورییەکان جەنگاون.

## دەمی پاش-ئاشوری:

لە کاتێکی دواتردا، ڕەنگە لە ناوەڕاستی هاوینی ٣٠هەمین ساڵی فەرمانڕەوایی شەمشی-ئەدەد دا،[٩٧] دەمی سێ یەم بە کاول کردن و گرتنی کۆشکەکەی شوشەڕرا دەست پێ دەکات. کو-واری دیار نەما و ئەرشیفی کۆشکەکەشی ئیتر وەستا، لە کاتێکدا ئەستێرەی سەردارانی تری توروککی، بە پێ ی زانیارییەکانی ئەرشیفەکەی ماری، ڕوو لە گەشی بوونەوە. یەکێک لەم سەردارانە *لیدایا* ‘*Lidāya*’ بوو کە پێکەوە لەگەڵ *زازی-یا* ‘*Zaziya*’ و *زیلی-یا* ‘*Ziliya*’ و *تیروێنشێنی* ‘*Tirwenšēni*’ و هی تردا لەلای کو-واری بەند بوون. لیدایاش وەک خازیپ-تێششوپ بەهەمان شێوە لەگەڵ شەمشی-ئەدەد دا دەستی پێ کرد؛ بانگهێشت کرا و کۆبوونەوەیەکی سەرکەوتووانەی لەگەڵدا بەئەنجام گەیاند (SH 915). ئەمەش دیسان لەکاتی خۆیدا کو-واریی ناڕەحەت کرد، بۆیە هەوڵی دا ئەمیش تووشی هەمان چارەنووسی خازیپ-تێششوپ بکات، ئەوەبوو داوای لە شەمشی-ئەدەد کرد تاوەکو لیدایای بۆ بنێرێتەوە بەڵام ئەمجارە بە بیانووی ئەوەی گوایە دەیەوێت لە شیکشابووم جێگیری بکات، نەک بیکوژێت. بەڵام

---

[96] Dossin, G., "Correspondence de Šamšī-Addu et de ses fils," *Archives Royales de Mari (ARM)* I, Paris, 1950, No. 69; Klengel, H., "Das Gebirgsvolk der Turukkū in den Keilschrifttexten altbabylonischer Zeit," *Klio* 40 (1962), p. 8.
[97] Eidem, *IRAQ*, p. 103.

لیدایا نەدرایەوە دەست فەرمانڕەوای شوشەڕرا، لە جیاتی ئەمە لە شاری *'بوروللوم Burullum'*[98] جێگیر کرا، ڕەنگە بۆ وەرگرتنی پۆستێک و لەهەمان کاتیشدا بۆ دوورخستنەوەی لە شوشەڕرا و لە دەستی کو-واری.[99]

وا پێ دەچێت لیدایا لەشاری بوروللومەوە شۆڕشێکی لە دژی کو-واری و لە ئەنجامدا ئاشوری‌یەکانیش، بەرپا کردبێت. شالاوی بردە سەر شوشەڕرا و هەموو نیشانەیەک بۆ ئەوە دەچێت کە ئەو بوو بێت کۆشکەکەی سووتاندبێت. ئەو ئاماژەیەی لە نامەی شاری ماری *ARM* IV, 25 دا هاتووە لەوانەیە مەبەستی لەم ڕووداوانە بێت. نامەکە *'ئیشمێ-داگان Išme-Dagan'*ی کوڕی شەمشی-ئەدەد بۆ *'یەسمەخ-ئەدەد Iasmaḫ-Adad'*ی برایی ناردووە و تیایدا دەڵێت لیدایا دوو شاری سووتاند:

"لیدایا، سەرداری توروککی و توروککی‌یەکانی لەگەڵیدان، کە ئێستا لەم وڵاتەدان، بوونە ناحەز و دوو شاریان وێران کرد. چووم بۆ فریاگوزاری و ئەوان کشانەوە بۆ چیاکان."[100]

---

[98] هەروەک لە پێشنیازەکەی 'لێڤی' شدا هاتووە، دەشێت ئەم شارە هەمان ئەو *'بوروللوم Burullum'*ە بێت کە شەمشی-ئەدەد ویستبووی *'سین-ئیدیننام Sîn-idinnam'* بکاتە فەرمانڕەوای، بڕوانە:
Lewy, H., "Studien zur Geographie des alten Mesopotamien," *AfO* 19 (1957), p. 7.

[99] بڕوانە:
Læssøe and Jacobsen, *op. cit.*, p. 172-4; Eidem, *IRAQ*, p. 99.
باس و خواسی ئەم بەسەرهاتانە لەنامەکانی SH 915 و SH 887 و SH 943 دا هاتوون.

[100] Dossin, *Correspondance de Šamšī-Adad et ses fils (suite)*, *ARM* IV, Paris, 1951, 25: "*9) ᵐli-da-a-ia* LÚ *tu-ru-ku-ú 10) ù* LÚ *tu-ru-ku-ú ša it-ti-šu 11) ša i-na ma-a-tim ša-a-ti wa-aš-bu 12) ik-ki-ru-ma 2 a-la-ni*ᵏⁱ *i*[*g*]*-mu-ru 13) a*[*n*]*-ḫa-ri-ir-ma 14)* [*a-na*] *li-ib-bi* KUR-*i i-*[*r*]*u-*[*b*]*u.*"
لێرەدا پێویستە ڕوونی بکەمەوە کە لەم کاتە بەدواوە، بەهۆی وەستانی ئەرشیفەکەی شمشارەوە ئیتر بۆ مێژووی ڕووداوەکان پشت بە ئەرشیفەکەی شاری ماری دەبەسترێت. شاری ماری شارە دێرینەکەی سەر ڕوباری فورات بوو کە پێشتر باسی کرا. شەمشی-ئەدەد داگیری کرد و 'یەسمەخ-ئەدەد'ی

لەوانەیە ئەم نامەیە یەکێک لە کۆنترینی ئەو نامانە بێت کە باس لە ڕاپەڕینی خوری دەکات، چونکە ئیشمی-داگان بە یەسمەخ-ئەدەدی برای دەڵێت کە "پادشا" (=واتە باوکی) لە شاڵاوی توروککی‌یەکان ئاگاداری کردووەتەوە.[101] ئەمە نیشانەی ئەوەشە کە ئەو کاتەی ڕاپەڕینەکە دەستی پێ کردووە شەمشی-ئەدەد هێشتا لە ژیاندا بووە و هەر پادشاش بووە.[102] نامەی ARM I, 5 زانیاری زیاترمان لەبارەی ئەم ڕاپەڕینەوە پێ دەدات؛ لیدایا لە مەیدانی شەڕ کشایەوە و شاری بوروللوم، کە بنکەی جموجۆڵەکانی بوو، لەبەر لەشکرەکەی ئیشمی-داگان دا بە والایی جێ هێشت و:

"(ئیشمی-داگان) هەموو وولاتی ئوتومی هێور کردەوە و سەرلەنوێ
ڕێکی خستەوە و خستیە ژێر دەستی یەک دەستەڵاتەوە."[103]

ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە وولاتی ئوتوم، قەڵەمڕەوی پێشووی کو-واری، ناوچەی

---

کوڕی کردە فەرمانڕەوای. کوڕەکەی تری شەمشی-ئەدەد کە ناوی ئیشمی-داگان بوو، زۆر کارو باری سەربازیی گرتبووە دەست و لە پاش مردنی باوکیشی بووە پادشای ئاشور، ئەم بەردەوام بە نامە یەسمەخ-ئەدەدی لە هەموو هەواڵ و ڕووداوەکان ئاگادار دەکردەوە، بۆیە ئەو نامانەی هەواڵی ڕووداوەکانی کوردستانی کۆنی ئەم سەردەمەیان تێدایە لەشاری ماری هەن.

[101] Dossin, *ARM* IV, 87; Læssøe, *PAA,* p. 70.

[102] بەڕای ئایدیم ڕاپەڕینەکە ڕاستەوخۆ پاش 'لیمو' ی *ئەدەد-بانی* 'Adad-bāni*' دەستی پێ کردووە:

Eidem, J., "From the Zagros to Aleppo- and Back, Chronological Notes on the Empire of Šamšī-Adad," *Akkadica* 81 (1993), p. 26.

سەبارەت بە لیستی لیموەکان و مێژوویان، بڕوانە:

Birot, "Les Chroniques ….," *MARI* 4, 1985, p. 219ff.

هەروەها:

Veenhof, K. R., "Eponyms of the 'Later Old Assyrian Period' and Mari Chronology," *MARI* 4, (1985), p. 191 ff.

[103] *ARM* I, 5: "*34) ma-a-at(!) ú-te-em* [*k*]*a-la-ša uṭ-ṭe₄-eḫ ú-ta-áš-ki-in 35) a-na pí-i-im iš-te-en uš-te-eb-ši.*"

چالاکی‌یەکانی لیدایا بوو. کشانەوەشی لە تاکتیکێکی شەڕ زیاتر نەبوو، کەمێک پاش ئەوەی ئاشوری‌یەکان خۆیان بەسەرکەوتوو زانی و لەشکرەکەیان کێشایەوە و ناردیان بۆ بەرەی رۆژئاوا، خوری‌یەکان بەفەرماندەیی لیدایا گەڕانەوە. خوری‌یەکان بە سوود بینین لە سروشتی خاکەکە و ناسینی وولاتەکە، شەڕی پارتیزانی‌یان دەکرد. نامەی *ARM* IV, 23 نمونەیەکی باشمان دەداتێ:

"پەلێک لە لەشکر(ی ئاشور) کەوتە شوێنیان (=واتە شوێن توروککی‌یەکان)و منیش زۆرم لە جەنگاوەر(ەکانیان) سەربڕی. ئەمجا، لەکاتێکدا کە (پەلەکە) گەیشتە رۆخی روبارەکە و لەوێ ئۆردوگای دابەست؛ ئاو هەڵسابوو بۆیە (سەربازەکان) نەیانتوانی بپەڕنەوە. (ئەمجا) لەم کاتەدا سەربازەکانم پەراندەوە و ناردمن بۆ ناوەوەی وولات، بۆ دەوروپشتی شاری تیگونانوم ***Tigunānum***.' پاش ئەوەی لەشکر پەڕی‌یەوە، ئاوەکەش دابەزی و توروککی‌یەکان بە شەو پەڕینەوە. ئەمجا (ئاوی) روبارەکە (دیسانەوە) هەڵسایەوە و نەمتوانی پێ یان بگەم."[١٠٤]

ئەم جۆرە شەڕە بۆ ئاشوری‌یەکان، وەک بۆ هەر دەستەڵاتێکی ناوەندیی تریش کە بیەوێت بە سوپایەکی رێکخراوەوە شەڕ لەگەڵ گەلێکی چیایی دا بکات، بڕست لێبڕ بوو. لە نامەی *ARM* I, 25 دا بەم جۆرە هاتووە:

"سەبارەت بە وولاتی شوشەڕراکە لەبارەیەوە بۆمت نووسیبوو، با

---

[104] *ARM* IV, 23: *"11)* KASKAL *ir-te-ed-di-šu-ma 12) ṣa-ba-am na-dam-ma a-du-uk 13) ù i-na a-alȷ* ÍD *ik-šu-ud-ma 14) it-ta-ša-ab* ÍD *ma-li-ma 15) e-bé-ra-am ú-ul i-le 16) ù ṣa-ba-am ú-še-bi-ir-ma 17) a-na ma-a-at ti-gu-na-nim[ki] 18) aṭ-ṭà-ra-ad 19) wa-ar-ki ṣa-bi-im* ÍD *20) im-ṭì-ma* LÚ. MEŠ *tu-ru-uk-ku-ú 21) mu-ši-tam-ma i-bi-ru 22) wa-ar-ki-šu* ÍD *im-la-ma e-bé-ra-an ú-ul e-le."*

"ئیشار-لیم Išar-lim' بۆت باس بکات کە بووەتە گرفت و ئیتر ناتوانین بەدەستمانەوەی بهێڵینەوە.... ئێمە بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەمان کرد کە نەتوانرێت بهێنرێتەوە ژێر ڕکێف...."[١٠٥]

لەسۆ بە ووردی تێبینی کردووە کە ئیشمێ-داگان لەجیاتی ئەوەی وەک باوکی لە کۆتایی هەموو نامەیەکدا "شاد بە!!" بنووسێت، "خەم مەخۆ!" ی بۆ براکەی دەنووسی،[١٠٦] ئەمەش نیشانەیەکی باری داوەشیوی ئیمپراتۆریی ئاشوری بوو.

توروککیەکان تاکە هێزی کارای ڕووداوەکانی ئەم دەمە نەبوون، بەڵکو زۆر باسکردنیان لە دەقەکاندا هی ئەوەیە کە ئەمان لە هەموو تیرە خوریەکانی تر چالاک تر و بۆ ئاشوریەکان سەر بەگێچەڵ تر بوون. بۆ نمونە ئەوەندەی ئەمان لەبارەی گوتیەکان و لوللوبیەکانەوە نابیستین، هەرچەندە نامەکانی ئەم دەمە هەندێک ئاماژەیان بۆ کردەوەی سەربازی و چالاکیی سیاسیانەی گوتیەکان و لوللوبیەکان و کاکمیەکان تێدایە. نامەی A 2932[١٠٧] باس لە شاڵاوێکی هاوبەشی توروککیەکان و قابراییەکان و 'یاخروری Yahruri' یەکان دەکات. ئیشمێ-داگان لە نامەیەکدا (ARM IV, 21) بۆ براکەی نووسیوە:

"...پاش ئەم پەلامارە، ژمارەیان زۆر نیە. بەڵام هەر زۆر دەبن. لە داهاتوودا لە پێشڕەوی کردندا بەردەوام دەبن."[١٠٨]

---

[105] Dossin, *ARM* IV, 25: "*4) aš-šum ma-a-at šu-šar-ra-a*[ki] *5) ša ta-aš-pu-ra-am 6) ki-ma ma-tum ši-i id-da-al-la-hu 7) ù ku-ul-la-ša la ni-le-ú 8)* [m]*i-šar-li-im li-id-bu-kum .... 15) ni-iš*$_7$*-ta-al-ma 16) ki-ma ma-tum ši-i 17) a-na k*[*u*]*-ul-lim la ir-re-du-ú.*"

[106] Læssøe, *PAA*, p. 73.

[107] Lafont, "La Correspondance d'Iddiyatum," *Archives Épistolaires...I/2, ARM 26,* No. 510, l. 8-12.

[108] *ARM* IV, 21: "*14) i*[*š-t*]*u a-la-ki-im an-*[*ni-e-em*] *15) mi-nu-um ú-ul ra-bi-i(?) 16) we-di i-ti-ru 17) ir-tu-pu a-at(!)-lu-*[*ka-am*]."

'سومو-ئێپوخ *Sumu-epuḫ*' ناوێک کە بە "خەڵکی نوزی" ناوبراوە، دیارە کە دوژمنێکی تری ئاشوری‌یەکان بووە و بە تەیارکردنی توروککی‌یەکان و بەزاندنی شەمشی-ئەدەد هەڕەشەی کردووە. باس و خواسی ئەمە لە نامەی *ARM* V, 17+A 1882 دا هاتووە.[١٠٩] بەڵام لە ڕاستیدا نازانین ئایا توانی پێش مردنەکەی، کە لەنامەیەکی شەمشی-ئەدەد دا بۆ یەسمەخ-ئەدەدی کوڕی (*ARM* I, 91)[١١٠] هەواڵی هاتووە، هەڕەشەکەی بەجێ بگەیەنێت یان نا؟

توروککی‌یەکان تەنانەت دەیانتوانی بگەنە هەرکوێ یەک کە دەیانویست، لەم نامەیەدا (*ARM* IV, 22) بە متمانەوە بە ئیشمێ-داگان دەڵێن ئێمە هەر دەگەینە ئەو شوێنەی دەمانەوێت و ئەویش بە ترسەوە ئەم هەواڵەی بە براکەی گەیاندووە:

> " 'کە تۆ (واتە: ئیشمێ-داگان) بارمتەکانمان نادەیتێ (واتە: نایاندات بە توروککی‌یەکان)، سبەی یان دووسبەی دەگەینە ئەو شوێنە(ی کە مەبەستمانە) بیگەینێ.' دەبێت هەواڵ بەو شوێنە بگەیێنین (واتە: ئیشمێ-داگان و داروودەستەکەی ئەو شوێنە ئاگادار بکەن)، و بۆ ئەو شوێنەی دەیانەوێت بۆی بکشێن، ئەوان دەکشێن [.....]. با [....] ئاگاداری ئەمە بێت."[١١١]

دیاریشە فەرمانده توروککی‌یەکان دەستگایەکی هەواڵ کۆکردنەوەو سیخوڕیی

---

[109] Durand, J.-D., "Documents pour L'Histoire du Royaume de Haute-Mésopotamie, I, *MARI* 5, Paris, 1987, p. 167-170.

[110] "*1)a-na ia-ás-ma-aḫ-*[d]IM *2) qi-bi-ma 3) um-ma* [d]UTU-*ši*-[d]IM *4) a-bu-ka-a-ma 5)* [m]*su-mu-e-pu-uḫ im-tu-ut,*" Durand, *MARI* V, p. 178.

[111] Læssøe, *PAA*, p. 71; *ARM* IV, 22: "*20) iš-tu li-ṭì an-nu-tim 21) la ta-na-di-nam 22) ur-ra-am ú-lu ul-li-ti-iš 23) a-šar at-lu-ki-im mi-it-ta-la ak 24) aš-ra-nu-um li-iš-pu-*[*ru-ma*] *25) ù a-šar at-lu-ki-im 26)* [*li*]*-it-ta-al-*[*ku*] *27)* [*x x*] *x lu i-*[*de*]."

بەکاریان هەبووە، بە ڕادەیەک کە توانیویانە دەستگای سیخوڕیی ئاشوریەکان چەواشە بکەن:

> "سەبارەت بە ڕاپۆرتەکانی توروککیەکان کە لەبارەیانەوە بۆمت نووسی، ڕاپۆرتەکانی لەبارەیانەوەیە لە هەردوولاوە دژ بەیەکن. لەبەر ئەوە تائەم کاتەش نەمتوانی هیچ شتێکت بە دڵنیاییەوە بۆ بنووسم."[112]

فشاری بەردەوامی ئەم نەوە نوێ یەی سەردارە خوریەکان لەکۆتاییدا ئاشوریەکانی ناچار کرد لە وولاتی ئوتوم بکشێنەوە و بیدەنەوە دەست لیدایا و هاوپەیمانەکانی کە دەشێت لە زاگرۆس هەبیووبن.

خوریەکان، بە تایبەتی توروککیەکان، دەستیان لە دژایەتی کردنی ئاشور هەڵنەگرت. وادیارە بڕیاریان وابووە، پاش ئەوەی ئاشوریەکانیان لە ناوجەرگەی چیاکانی زاگرۆس کردە دەرەوە، بەتەواوەتی کۆتایی بە بەبوونیان لە دامێنەکانی زاگرۆسیش بهێنن. ئەم ڕاستیە بە ڕوونی لە نامەکانی ماری دا ڕەنگی داوەتەوە، تیایاندا زۆر جار هەواڵی بەسەردا دان و پەلاماری نیشانە ئاشوریەکان لەلایەن توروککیەکانەوە هاتووە. بەڵام لەلایەکی تریشەوە دەردەکەوێت کە هۆکاری سیاسی تاکە هۆکاری ئەم دژە جەنگەی خوریەکان نەبووە؛ نامەکانی ماری ئاماژە بۆ گرانی و قات و قڕیش لە ناوچەکانیاندا دەکەن، کە زۆر پێ دەچێت هۆکارەکەی ئاوو هەوا بووبێت. یەکێک لەم نامانە *ARM* IV, 76ە:

> "توروککیەکانی کە لە وولاتی تیگونانومن، بۆ ئێرە هەڵاتن و ئاوایان

---

[112] Læssøe, *PAA*, p. 71. *ARM* IV, 22: "*5) aš-šum ṭe$_4$-em* $^{m}$*tu-ru-ki-im 6) ša ta-aš-pu-ra-am 7) ṭe$_4$-em-šu-nu it-ta-na-ki-ir 8) i-na ki-a-am a-di i-na-an-na(!) 9) ta-ki-it-t*[*am*] *10) ú-ul a-ša-ap-p*[*a-ra-kum*]."

گوت، بەم جۆرەیان گوت: 'ئەوان برسین'.["113"]

لە نامەی *ARM* IV, 24 یشدا:

"پێشتر، قات و قڕیان تێکەوتبوو (واتە: ناو توروککییەکان) و بۆ ناوچەکانی دەوروپشتی شاری 'خیربازانوم *Ḫirbazānum*' کشان".....

"توروککییەکان تووشی برسێتی هاتوون: ئازووقەیان نەماوە و (ئێستا) لە ناوچەی دەوروپشتی شاری تیگونانوم (خۆی) دان."[114]

شالاوەکان تەنانەت گەیشتنە ئەو شارانەش کە لە بەری ڕۆژئاوای دیجلە بوون. داگیرکردن و فەرمانڕەوایی کردنی وولاتی ئاشور لەسەردەمی ئیمپراتۆری میتتانیی دا، دەبێت لەم کاتەوە بە داگیرکردنی یەک بەیەکی شار و ئاوەدانییەکانی وولاتی ئاشور دەستی پێ کردبێت. ئیشمێ-داگان بە نامەی A. 80 لە شالاوی توروککییەکان بۆ سەر خودی شاری 'ئێکەللاتوم *Ekallātum*' ئاگادار کراوەتەوە کە لەم کاتەدا پایتەختی ئاشور بوو، نامەکە باسی تالان کاری و وێران کاری و کوشتنی سەرباز دەکات:

"توروککییەکان لەمبەری ڕوبار پەلاماری ناوچەی ئێکەللاتومیان دا، تا 'کوردیششاتوم *Kurdiššātum*' کشان و هەموو ڕانەمەڕەکەی ئیشمێ-داگانیان بە تالان برد. (لێرەوە) بێرەیەک دوور نابن. چوار

---

[113] *ARM* IV, 76: *"40) ù* LÚ. MEŠ *tu-ru-k*[*u-ú*] *i-na ma-a-at ti-gu-na-nim*$^{ki}$*-ma 41) wa-aš-*[*b*]*u mu-un-na-ab-*[*t*]*u ša in-na-bi-tu-*[*ni*]*m-*[*m*]*a 42) ki-a-am i-da-bu-bu-nim um-ma-mi bi-ru-ú."*

[114] *ARM* IV, 24: "*8)* [*i-na*] *pa-ni-tim ib-r*[*u-m*]*a 9) a-na ma-a-at Ḫi-ir-ba-za-nim*$^{ki}$ *il-li-ku-ma."* .... *"24) ù* LÚ. MEŠ *tu-ru-ku-ú 25) bi-tr-ru-ú ma-ka-lam ú-ul i-šu-ú 26) ù i-na ma-a-at ti-gu-na-nim*$^{ki}$*-ma 27) wa-aš-bu."*

بەڕای هەندێک تیگونانوم و خیربازانوم زۆر لە باکووردوە، لە باشوری ئەنەدۆڵ بوون، بڕوانە:

Eidem and Læssøe, p. 54.

شاریان تالان کرد و ٥٠٠ سەربازیشیان کوشت."[١١٥]

بەڕای لافۆن Lafont، ئەو ناوچانەی تورووککی‌یەکان لە هەمووی زیاتر فشاری سەربازی‌یان خستبووە سەر ناوچەی ئاشور و کەرانا *Karāna*،[١١٦] بووە. بۆ ئەوەی ئەم کارەشیان ئاسان بکـەن، چوبوونە پاڵ ئەو هاوپەیمانی‌یەی شانشینی ئەنداریگ *Andarig*ی باکوریی لەگەڵ ماری و ئێشنوننا و بابل و کەرانادا پێکەوە گرێی دابوو.[١١٧]

شێوەی ژمارە ١٠: جێ مۆری زازی-یا کە لەسەر لەوحێکی ماری دۆزراوەتەوە. سەرچاوە:
D. Beyer and D. Charpin, "Le Sceau de Zaziya…

[115] Charpin, D., F. Joannès, S. Lackenbacher and B. Lafont, *Archives Épistolaires de Mari I/2- ARM* XXVI, Paris, 1988, No. 524: " *7)* LÚ. MEŠ *tu-ru-uk-ku-ú 8) ma-a-at é-kál-la-tim 9) e-bi-ir-ti* I₇-DA *10) ma 11) a-di kur-di-iš-ša-tim*[ki] *12) il-li-ik* UDU. ḪÁ ša iš-me-[d]*da-gan 13) ka-la-ši-na il-qí 14) mi-im-ma ú-ul be-ri-iš 15) 4 a-la-ni-šu it-ba-al ù 5 me-tim ṣa-ba-šu 16) i-du-uk.*"

نامەی ژمارە ٢٤٠ یش (A. 2901) لەو نامانەیە کە باس لە ڕووداوی لەم جۆرە دەکات.

[116] کەرانا شارێکی دێرینی ئەم سەردەمە بوو، ئێستا بە شوێنەوارەکەی دەووترێت 'تل الرماح' و کەوتووەتە ڕۆژئاوای موسڵەوە.

[117] Lafont, *Archives Épistolaires… I/2, ARM 26,* p. 470.

شالاوەکانی تر گەیشتنە شارەکانی ئاشور و ڕەزاما *Razāma*.[118] زازی-یا ش، کە زۆر پێ دەچێت هەمان ئەو زازی-یا بە بێت کە لای کو-واری بەند بوو، لە شەڕی دژ بە ئاشوردا بەشداریی کرد و نزیک بوو لەوەی تاکە پادشای توروککی بێت کە لە نامەکانی ماری دا ناوی هاتبێت و دۆزرابێتەوە.[119] کەواتە، زازی-یاش لە دیجلە پەڕیەوە و هەندێک شاری گرت، لەوانەش شارەکانی ئادێ *Adê*' و نینێت *Ninêt*' -کە لەوە دەچێت نینەوای پاشتر بووبێت-.[120] ئەمەی دوایی‌شیانی کردە بنکەی جموجۆڵی:

"...لەشکری توروککی بۆ شاری ئادێ لە دیجلە پەڕیەوە و زازی-
یا لە شاری نینێت دانیشت."[121]

تەنانەت لە کاتی هەندێک شالاو و پەلاماردا لەناو قەڵەمڕەوی بابلیشدا تالانیان کردووە:

"سەبارەت بە تالانی‌یەکانی کە لە وولاتی بابل بردیان (واتە:

---

[118] Charpin, *op. cit.*, No. 519 (A. 753).

[119] زۆر گرنگە کە جێ مۆرێکی زازی-یا لە سەر بەرگی نامەیەکی ماری دۆزراوەتەوە (M. 10924+10925). نووسینی سەر مۆرەکە دەڵێت: "زازی-یا، کوڕی تیر-نانوم *Tīr-Nanum*'، نولدانوم *nuldânum* ی ئیتابالخوم، ..... ی خواوەند....":

"*1) za-zi-[ia] 2)* DUMU *te-er-n[a-nu-um] 3) [n]u-ul-da-nu[-um] 4) [š]a- it-te-ba-a[l-ḫi-im] 5) [x] ša* ${}^{d}$[o o],"

بۆ ئەمە بڕوانە:

Beyer, D., and D. Charpin, "Le sceau de Zaziya, roi de Turukkéens," *MARI* 6, Paris, 1990, p. 625.

تێبینی دەکرێت لێرەدا 'ئیتیبالخوم' نووسراوە، نەک وەک لە دەقەکانی تردا 'ئیتابالخوم.' لەوانەیە ئەمە ناوە ڕاستەکە بووبێت چونکە لە دەقێکدا هاتووە کە نووسەرەکەی خۆی خەڵکی وولاتەکە بووە.

[120] دەربارەی نینێت و شیاویی یەک هاتنەوەی لەگەڵ نینەوا دا، بڕوانە:

Yuhong, *NABU* 1994/ 2, section: 38; also: Lafont, *op. cit.*, p. 476.

[121] Charpin, *op. cit.*, No. 517 (M. 9037): "*3´) um-ma-nu-um* LÚ *tu-ru-uk-kum*${}^{k[I]}$ *5´) i-na a-[d]e-e*${}^{ki}$ *i-bi-ra-a[m] 5´) [ù] za-zi-ia i-na ni₅-né-et*${}^{ki}$ *w[a-ši-i-ib?]*.

توروککی‌یه‌کان بردیان)...."[122]

بەلام هەموو شالاوەکان سەرکەوتوو نەبوون، چونکە لە هەندێک دەقدا هاتووە کە ژمارەیەک لە توروککی‌یەکان کە لە شاری ئامورساککوم *Amursakkum*‛ ی نزیک ’شوبات-ئێنلیل *Šubat*-Enlil‛ خۆیان قایم کردبوو، لەشکری ئاشوری ئابلۆقەی داون ناچاری کردوون چۆڵی بکەن."[123] هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ جموجۆڵی ئیندوششی لە دژیان لە ناوەوەی وولاتی خۆیاندا، ئەمەش ڕەنگە بە فیتی ئاشوری‌یەکان بووبێت."[124]

سەرباری ئەمانە هەموویان، فشاری سەر ئاشوری‌یەکان زۆر لەوە گەورەتر بوو، بە پێچەوانەی سەردەمی کو-واری‌یەوە، ئێستا لە سەردەمی ئیشمێ-داگان و سەردارە توروککی‌یەکاندا بارەکە بە تەواوەتی پێچەوانە بوبووەوە. دوور نیە ئەو شالاوانە شانشینی ئاشوری‌یان لە ڕمان نزیک کردبێتەوە. ئیشمێ-داگان ڕاپۆرتی سیخوڕە خەم لێ نیشتوو و شەکەتەکانی بۆ دەهات:

"دوژمن، توروککی‌یەکان، ڕۆیشتن و [.....]. دەستیان بەسەر کاککولاتوم *Kakkulātum*‛ دا گرت ؛ پاش ئەوە بەدەم تالانەوە هاتنە ناوەوەی وولاتەوە. ولسات و کەل و پەلیان برد."[125]

---

[122] "*17) [aš-šu]m ša-al-la-tim 18) [ša i-n]a* KÁ. DINGIR. RA[ki] *19) [iš?-lu?-l]u?* ...," Lackenbacher, "Les Lettres de Buqâqum," *Aechives Épistolaires de Mari I/2, ARM 26*, No. 460 [A. 509].

[123] Eidem and Læssøe, p. 54.

[124] *Op. cit.*, p. 55.

[125] Læssøe, *PAA*, p. 71; *ARM* IV, 21: "*5) na-ak-rum tu-ru-*[*uk-ku-um*] *6) ú-ṣú-ma a-na* [.......] *7)* [*i*]*k-šu-*[*d*]*a-*[*am*] *8) Kakkulâtim il-qú-*[*ú-ma*] *9) ù sa-ad-*[*da-am*] *10) a-na* [*l*]*i-ib-b*[*i ma-a-tim*] *11) ú-wa-aš-še-ru 12)* $GU_4$. ḪÁ *ù ša-a*[*l-la-tam*] *13) il-qú-*[*ú*]."

باوەڕ وایە شاری کاککولاتوم لو شوێنی بەیەک گەیشتنی ڕوباری سیروان و دیجلەدا بووبێت، بڕوانە:

Klengel, *Klio*, p. 15.

نامەی تر هەن باس لە تەنگانەیەک دەکەن کە بەهۆی دوژمنێکی ناونەبراوەوە تووشی شاری نورڕوگوم هاتووە،[١٢٦] ئەم دوژمنە لە خوری‌یەکان (=تورروککی‌یەکان) بەولاوە ناکرێت کەسی تر بووبێت کە لەم کاتەدا بەفەرماندەیی یەکێک لەو سەردارانەی ناویان لە ڕێی دەقەکانەوە دەزانین، فشاریان خستووەتە سەر ئەم شارە. کەواتە بارو ۆخی وولاتی ئاشور شلۆق بوو و دەولەت ڕوو لە دارمان بوو. ئیشمێ-داگان ویستی شانشینەکەی ڕزگار بکات، ئەویش بە هەولی ڕێکەوتن لەگەڵ زازی-یا، بەهێزترین سەرداری تورروککی. یەکێک لە نامە هەرە گرنگەکان ڕاپۆرتێکە کە 'بوقاقوم *Buqāqum*' ناوێک بۆ سەروەری خۆی لە شاری ماریی ناردووە تیایدا دەڵێت ئیشمێ-داگان وا بۆ چەندهەمین جارە داوای ئاشتی لە زازی-یا دەکات. کەچی زازی-یا، لەجیاتی ڕێکەوتن لەگەڵ پادشای ئاشور، چوو بۆ لای 'زازوم *Zazum*' ی پادشای گوتی تاوەکو لەگەڵ ئەو ڕێک بکەوێت و بۆ پیشان دانی نیەتی سافیش کوڕەکانیشی لەگەڵ خۆی برد و هەشت تالێنت زیویشی پێشکەش کرد.[١٢٧] ئەمە واتای وایە کە ئاشوری‌یەکان لەمەترسی

---

[126] بۆ ئەم نامانە بڕوانە:

Dossin, G., *Correspondence de Iasmah-Addu- ARM* V, Paris, 1952, nos. 61 and 62.

[127] Lackenbacher, S., "Buqâqum," *Archives Épistolaires... I/2, ARM 26,* No. 491 [A. 233].

تالێنت Talent لە زمانی ئەکەدی دا *biltu* ە و لە سومەری دا GÚ.UN ە (نزیکەی ٣٠ کیلۆ). یەک بیلتو ٦٠ 'مانوم *manûm*' ە، هەرچەندە لە سەردەمی ئاشوریی نوێ دا ٣٠ مانوم بووە. مانوم لە MA.NA ی سومەری‌یەوە هاتووە و یەکەی کێشانە بووە (نزیکەی ٤٨٠ گرام). ئەمیش دابەش بووەتە سەر ٦٠ 'شیقیل *šiqil*' کە لە سومەریدا GÍN ە (نزیکەی ٨ گرام) و ئەمیش دابەش بووەتە سەر ١٨٠ 'ئوططاتو *uṭṭatu*' کە لە سومەریدا ŠE یە، بە واتای "دەنک"(نزیکەی ٤٤ میلی گرام). ئەم کێشانانە چوونەتە زمانی عیبریشەوە، تالێنت و مینا و شاقل لەمانەوە هاتوون. لەکوردیی خۆشماندا زۆرجار 'مەن' بەکار هاتووە و تا ئێستاش لە فۆلکلۆردا هەیە و هەر مانا و مانومی جارانە. شایانی باسە کە GÚ.UN واتای شان و باهوش دەبەخشێت و ناوی ئەم کێشانەیەش لەمەوە هاتووە، چونکە بارێکی

دا بوون، نووسەری هەمان ڕاپۆرت نووسیویەتی:

"ئیشمیٚ-داگان گریا، گوتی 'هەموو وولاتان لێم تووڕەن'."[128]

بەلاّم لە کۆتایی دا ئیشمیٚ-داگان توانی ڕێکەوتنێک لەگەڵ زازی-یا دا مۆر بکات، بێ خواوەندەکانیشی لەگەڵ خۆی برد و لای زازی-یا دای نان تاوەکو سوێندەکانی بچەسپێن.[129] هەرچەندە دەقی ڕێکەوتن نامەکە خۆی بەداخەوە نەدۆزراوەتەوە، بەلاّم هەندێک زانیاریمان لەبارەیەوە لەڕێی ڕاپۆرتێکەوە دەست کەوتووە کە یەکێک لە سیخوڕەکانی 'زیمری-لیم *Zimri-lim*' ی پادشای ماری بۆ پادشای ناردووە، لەوانە:

"ئیشمیٚ-داگان لەگەڵ تورووککی‌یەکەدا (پەیمانی)ئاشتی‌یان بەست:
کچی زازی-یا دەدەن بە 'موت-ئەشکور *Mût*-aškur' ی کوڕی.
ئیشمیٚ-داگانیش زێڕ و زیوی شیربایی بە زازی-یا دا."[130]

زۆر لە دەقەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایی زیمری-لیم، واتە پاش ئەوەی ئاشووری‌یەکان

---

ئاسایی سەرشانی کەسێک ۳۰ کیلۆ بووە کە هەر ۱۵ کیلۆی بەم سەر و سەری دارێکەوە شۆڕ کراونەتەوە و دارەکە خراوەتە سەر شان.

[128] "*13) ù iš-me-*[d]*da-gan ib-ki-šu-nu-ši-im- um-ma šu-ma 14) ma-tam ka-lu-*⌈*ša*⌉ *it-ti-ia ze-né-et,"* Lackenbacher, *Ibid.*

[129] "*6) za-zi-*[*i*]*a 7) i-na ru-te-e it-ti* [*iš-me-*[d]]*da-gan ìs-sa-li-im 8) ù* DINGIR. M[EŠ *š*]*a iš-me-*[d]*da-gan it-ti za-zi-ia* [*x x*] *9) a-na ni-iš* DINGIR*-lim za-ka-ri-im wa-aš-bu,"* Lafont, *op. cit.*, No. 526.

[130] Jean, F., "Lettres de Mari," *RA* 39 (1942-44), No. 40: "*5) iš-me-*[d]*da-gan it-ti 6)* LÚ *tu-ru-uk-ki ìs-lam 7) marāt za-zi-ia a-na ma-ri-šu 8)* [m]*mu-ut-aš-kur i-le-eq-qé 9) kaspam ḫurașam ti-ir-ḫa-tam 10) a-na za-zi-ia iš-me-*[d]*da-gan 11) ú-ša-bi-il."*

زیمری-لیم شازادەی پادشای شاری ماری بوو کە کاتێ خۆی شەمشی-ئەدەد شارەکەی لێ داگیر کرد. لەم کاتەدا بوو کە زیمری-لیم هاتەوە و ئاشووری‌یەکانی لە شارەکە دەرکرد و خۆی چووەوە سەر تەختی باوو باپیرانی. ئەم ڕاپۆرتەش پاش ئەم گۆڕانانە بۆی نێردراوە.

دەستەڵاتیان بەسەر شاری ماری دا لەدەست دا، باس لە پەرەسەندنەکانی کوردستانی دێرین دەکەن. دەقی تریش لە شوێنەواری تر هەن کە زانیاری لەم جۆرەیان تێدایە، یەکێک لەمانە دەقێکە کە لە 'تل الرماح' دۆزراوەتەوە ئاماژەیەکی وای تێدایە کە پێ دەچێت زازی-یا دەستی بەسەر هەندێک ناوچەی نزیک ڕوباری دیجلەدا گرتبێت.[١٣١] کەواتە، خوری‌یەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە، لە ناوچە کوێستانی‌یەکانەوە لەسنوری قەڵەمڕەوی لوللوبی‌یەکان و گوتی‌یەکانەوەیان لەژێر دەستدا بوو، لە ڕۆژئاواشەوە بەردەوام برەویان بە قەڵەمڕەویان دەدا و سەرزەمینی نوێ یان دەخستە سەر، بەرەو پێکەوەنانی ئیمپراتۆری میتانیی داهاتوو. ئەم برەوسەندن و سەرچوونی هێزەیان، پێشەکیی دەرکەوتنی زلهێزێکی نوێ بوو لە ناوچەکەدا، بۆیە دەوڵەتەکانی تری ئەو کاتەی مێسۆپۆتامیا، وەک ماری و بابل و ئاشور و 'کەرانا Karâna' بەهەڕەشەیان دەبینی.[١٣٢] لەلایەکی ترەوە، ئەم برەو سەندنە ڕێگای لەبەردەم دروست بوونی پەیوەندیی دیپلۆماسی‌یانە لە نێوان سەردارانی خوری و ئەم دەوڵەتانەدا خۆش کرد. ناردنی نوێنەرێکی پادشای کەرانا بۆ دان و ستان لەگەڵ زازی-یا دا سەبارەت بە بە تالان بردنی مەڕوماڵات لەلایەن پیاوەکانی زازی-یاوە[١٣٣] نمونەیەکی ئەم پەیوەندی‌یانەیە. لە دەقێکی تریشدا هەواڵی سەردانی نوێنەرێکی توروککی لە شاری کارانا هاتووە.[١٣٤] شاری ماریش لەم پەیوەندی‌یانە بەدەر نەبوو،

---

[131] Eidem, *IRAQ*, p. 105.

[132] بۆ نمونە نامەیەک هەیە لە کەراناوە بۆ ماری نێردراوە باس لە مانـــەوەی '*خاقبـا-خەمـــمو* *Ḫaqba-Ḫammu*' ناوێک لە شارەکەدا دەکات تاوەکو بەرگری لە شارەکە بکات لە دژی شاڵاوەکانی توروککی‌یەکان، بۆ ئەم نامەیە بڕوانە:

Birot, N., *Correspondence des Gouverneurs de Qaṭṭunân –ARM* 27, Paris, 1993, (letter 128 No. 154), p. 258-61.

هەروەها باس لە هەڕەشەیەک دەکەن کە بوونی ٢٠٠٠ سەربازی توروککی دروستیان کردووە، بۆ ئەمەش بڕوانە:

Durand, J.-M., *Archives Épistolaires de Mari I/1 –ARM 26*, Paris, 1988, No. 128 (A. 2143), p. 293-4.

[133] Charpin, *ARM* 26 I/2, Nos. 339 and 510.

[134] Birot, *Correspondence…ARM* 27, No. 162.

نامەی ARM IV, 83 ئاماژەیەکی وای تێدایە:

"... دووەم، ئەبی-داگان ‘Abi-Dagan’ ی خزمەتکاری سەرووەرم
و نێردراوی توروککییەکان گەیشتن."[١٣٥]

لە کۆبوونەوە گەورەکەی پادشایانی مێسۆپۆتامیا —یان نوێنەرەکانیان- دا کە لە شاری صیدقوم ‘Ṣidqum’ بوو، نوێنەرێکی توروککییەکانیش ئامادە بوبوو. ناوی ئەم نوێنەرە شان بەشانی نوێنەرانی بابل و ئێشنوننا هاتووە.[١٣٦]

بەڵام ئەم درەوشانەوەیەی ئەستێرەی هێزە سیاسییەکانی کوردستان لەم سەردەمەدا هەموو راستییەکان نەبوو، لەپشت ئەمانەوە کێشەو گرفتی ناوخۆیی گەورەهەبوون. کاکمییەکان (=کاکموم) یەکێک لە لایەنە بەهێزەکان بوون، لە راپۆرتێکدا کە لە ئەرشیفەکەی ماری دا دۆزراوەتەوە پادشای ماری لە هەواڵی سەرکەوتنێکی کاکموم بەسەر قابرا دا ئاگادارکراوە، کە تیایدا کاکمییەکان ئاردیگاندی ‘Ardigandi’ ی

---

[135] Jean, C. F., *Lettres Diverses, ARM* II, Paris, 1950, 83: “*21) ša*-[*ni*]-*tam a-bi-*[d]*da*-[*gan*] *22)* ÌR *be-li-ia ù* DUMU [*š*]*i-ip*-[*r*]*i-im 23) iš-tu tu-ru-uk-ka-i-ia-um 24)* [*il*]*-šu-du-nim.*”

[136] Charpin, *ARM 26 I/2,* No. 404.

نامەی A. 2511 باس لە دان و ستانی نوێنەری توروککی لە گەڵ حەمورابی ی پادشای کوردا ‘Kurdâ’ دا دەکات: "نوێنەری توروککو هات و بە حەمورابی ی (گوت) :....":

“*36)* DUMU *ši-ip-ri* LÚ *tu-ru-uk-ku il-li-kam-ma 37) a-na ḫa-am-mu-ra-bi ki-a-am...;*”

هەروەها: "... بە ئامادەبوونی پیاوەکانی (واتە: نوێنەران و باڵیۆزانی) بابل و ئێشنوننا و توروککو و حەوت پادشا دا کە ......":

“*14) mé-eḫ-re-et* LÚ KÁ. DINGIR. RA[ki] LÚ ÈŠ. NUN. NA[ki] LÚ *tu-r*[*u-ki-im ù*] *15) 7* LUGAL. MEŠ *ša...,*” Joannès, “Lettres de Yasîm-El,” *Archives Èpistolaires de.... I/2,* No. 404 [A. 487+ A. 3459].

پادشای قابرایان کوشتووە.[137] پادشای سیموررووم کە ڕکابەری زازومی پادشای گوتی بوو لای زازی-یا پەنابەر بوو، کاتێک کە زازی-یا ویستی پەیوەندیی باش لەگەڵ گوتی‌یەکاندا دروست بکات، دایەدەست زازوم.[138] ئەمە ئاماژەیە بۆ دوژمنایەتی‌یەکی کۆنتری نێوان گوتیوم و سیموررووم، سیمورروومیش لەم کاتەدا دیارە ئەوەندە لاواز بووە کە ئەم پادشا ناو نەبراوەی ناچاری هەڵاتن و پەنابردنە بەر تورووککی‌یەکان بووە و نەیتوانیوە دەست بهێنێتە بەر دەستی زازی-یا تا نەیداتە دەست دوژمنەکەی.

ئەو فشارە دوولایەنەی لەلایەن ئاشوری‌یەکان و گوتی‌یەکانەوە لەڕێی کو-واری یەوە خرایە سەر تورووککی‌یەکان، بووە هۆی "گۆڕانی سیاسی و کۆمەڵایەتیی گەورە لە ناویاندا."[139] گەشەکردنێکی خێرا، بەڵام تەوژم نەگۆری هێزیانی لێ کەوتەوە. لە پێشدا وڵاتی ئوتومیان گرت، ئەمجا لە دژی دەستەڵاتی ئاشوری‌یەکان لە هەموو ناوچەکەدا ڕاپەڕین، ناچاریان کردن لە ناوچە شاخاوی‌یەکان بکشێنەوە و بۆ ئەوانیان جێ بهێڵن. تورووککی‌یەکان بەمەوە نەوەستان، بەڵکو پێشڕەوی‌یان کرد و دەستیان دایە پەلاماردانی شار و ناوچە ئاشوری‌یەکان. زۆر دەشێت بە مردنی شەمشی-ئەدەد و هاتنە سەر تەختی ئیشمێ-داگانی کوڕی، چاویان قایمتر بووبێت. هەنگاوێکی تر کە ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی هێزەکانی مێسۆپۆتامیا و گەمەی سیاسیی مێسۆپۆتامیای کردنەوە پەڕینەوەی دیجلە بوو. هەرچەندە چەرخەکە پێ دەچێت "چەرخی تورووککو" بووبێت، بەڵام بێگومان واتای ئەوە نیە گەلانی تری کوردستانی دێرین و ڕۆڵیان لە بیر بکەین. ڕاستیی ئەوەی کە سەرچاوە نووسراوەکان باسی تورووککی‌یەکان لە هەر لایەنێکی تر زیاتر

---

[137] "*ka-ak-mu-um da-am₇-da-am ša ar-*[*di-ga-an-di* LUGAL *q*]*a-ab-ra-a*$^{ki}$ *9) i-du-uk,*" *Archives Épistolaires….I/2, ARM 26*, No. 489 [A. 639]

[138] "*29)* LUGAL *ša ši-mu-ur-ri-im*$^{ki}$ *30) ša pa-nu-um ma-ḫa-ar za-zi-im qú-ti-im*$^{ki}$ *31) uš-*⌜*ba-ma*⌝ *a-na ṣe-er za-zi-ia in-na-bi-tam 32)* $^{m}$*za-zi-ia a-na za-zi-im qú-ti-im*$^{ki}$ *33) it-ta-di-in-šu,*" *Archives Épistolaires, ARM 26*, No. 491 [A. 233].

[139] Eidem, *IRAQ*, p. 107.

دەکەن، دیارە هی ئەو ڕۆڵە بەرچاوەیە کە سەردارە چالاک و بەکارەکانیان گێڕایان لەوەدا کە بەرژەوەندیەکانی گەلە بنووس (تر) و خوێندەوەار(تر)ەکانیان خستووەتە بەر مەترسی.

حەمورابی (١٧٩٢-١٧٥٠ پ.ز.) ی پادشای بابل لە ٣٧هەمین سالی فەرمانڕەوایی دا لەشکرکێشیەکی کردە سەر ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی دیجلە. ناوی سێ دوژمنی سەرەکیی لە ناوچەکەدا ڕیز کردووە: توروککییەکان و کاکمییەکان و سوبارییەکان.[١٤٠] جارێکیش دان و ستانی لەگەڵ شەمشی-ئەدەد کردووە بۆ ئەوەی توروککییەکی بەدەستەوە بدات. لە پاشتریشدا، لە سەردەمی *سامسو-ئیلونا* *Samsu-ilūna* (١٧٤٩-١٧١٢ پ.ز.) ی پادشای بابل دا هەندێک دەق ئاماژە بۆ برینەوەی خۆراک بۆ هەندێک توروککی دەکەن[١٤١] و شتێکی لەم بابەتەش لە سەردەمی *ئامیصادوقا* *Ammiṣaduqa* (١٦٤٦-١٦٢٦ پ.ز.) ی پادشای بابل دا باس کراوە.[١٤٢] ڕەنگە ئەم توروککییانە دیلی ئەو جەنگانە بووبێتن کە لە ئەنجامی لەشکرکێشیەکانی حەمورابی بەو چارەنووسە گەیشتوون.

---

[140] بۆ نموونە بڕوانە:

Gelb, *HS,* p. 41; Læssøe, *The Shemshāra Tablets,* p. 17.

[141] Charpin, D., "La Babylonie de Samsu-iluna à la lumière de nouveaux documents," *Bibliotheca Orientalis* 38 Nos. 5/6, September-November (1981), p. 521.

[142] Birot, M., *Tablettes d'Époque Babylonienne Ancienne,* Paris, 1969, No. 34, l. 4, p. 70.

لە زۆر شوێنی جیاوازی ئەم باسەدا ئەنجام و پێشنیازی نوێ خراونەتە ڕوو، بەڵام دووبارەکردنەوە و خستنەوەڕووی هەموویان لێرەدا زۆر دەبێت، بۆیە ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکەینەوە بەڵام زیاتر ئەنجام و پێشنیازەکانی بەشی سێ یەم دەخەینە بەرچاو کە تیایدا لە نووسینە نوێ یەکەی ئیددی‌ـ(ـــن)-سین و مێژووی شانشینەکەی کۆڵدراوەتەوە. ئەمانەش بەم شێوەیە کورت و چڕ دەکەینەوە:

بە بەشی یەکەم دەست پێ بکەین، وا دیارە وڵاتی سوبارتو لەوە پچووکتر بووە کە باوەڕ دەکرا. نارەحەتە باوەڕ بکەین تا کەناری دەریای ناوەڕاست کشابێت، ئەم باوەڕە لەوەوە هاتبوو کە لە سەرچاوە نووسراوە کۆنەکاندا وا هاتووە کە سنووری ڕۆژئاوای تا دارستانەکانی ئورز پەلی کێشاوە. دارستانی ئەم جۆرە درەختە دەشێت لە کاتی خۆیدا لە باکوری کوردستانیشدا یان لە باکوری مێسۆپۆتامیاشدا هەبووبێت. ئەم پێشنیازە لەگەڵ پێشنیازەکەی شتاینکێلەریشدا یەک دێتەوە کە باوەڕی وایە سوبارتو لە پێشدا وڵاتێکی بنەی پچووکتر بووبێت و لە پاشدا پەلی کێشابێت و بووبێتە سوبارتویەکی مەزن.

